مەسعوود محەمەد

ژیان و جیهانبینی

ئامادە کردنی: هەڵۆ بەرزنجی

بەرلین ئەیلولی 1998- گەلاوێژی 2610

چاپی یەکەم بەرلین – 1999

بڵاوکردنەوەی لە ئینتەرنێتدا 2009 - ستۆکهۆلم

ورووژاندنی چەمکەکانی ژیان و جیهانبینی، لەناو سیستەمێکی هزری و فەلسەفیدا، دەکرێت دیدگای جیاجیا و هەمەچەشنی لێ بەرهەم بهێنرێت، بە ڕادەیەک چەمکەکان سنووری بەرچاوی زیندەگییانەی خۆیان ببڕن و بەرەو ئەودیوی خۆیان ڕێچکە ببەستن. تا مەودای خوێندنەوەی میتافیزیکییەکانیش ڕەوت بکەن، بەبێ ئەوەی «مانا و حەقیقەتی» خۆیان بزر بکەن. بەڵام هەتا هەنووکە وورووژاندنی ئەم چەمکانە لەناو جغزی ڕۆشنبیرییەکی لاواز و سستی وەک ڕۆشنبیری کوردیدا، کارێکی دەگمەن و دانسقەیە. دەگمەنە لەبەر ئەوەی لە هەموو مێژووی نووسینماندا بەدی ناکرێ بە هەموو گوتار و دەقەکانیەوە، دیسان لەبەر ئەوەی ژمارەی ئەو ڕۆشنبیرانە دەگمەنن کە توانیویانە ڕوانینی خۆیان سەبارەت بەو چەمک و هاوکێشانە هەبێ و بە چەمک و ئەقڵی خۆیان شتی تر بەرهەم بهێنن.

دیارە ئەمەش هۆکاری خودی و بابەتیی زۆری لە پشتەوەیە. هەڵبەت لە خوێندنەوەی پرسیار و وەرامدانەوەکانەوە کەم و زۆر لایەنە تاریکەکانی ئەو هۆکارانە ڕۆشن کراوەتەوە... ئیدی دۆزینەوە و ئاشکراکردنی کەسانێک کە خاوەنی جیهانبینینی خۆیان بن لە ناو دنیای بەر تەسکی ڕۆشنبیریماندا بۆ خۆی دەبێتە جۆرێکی تری بینینەوەی جیهانبینی. بینینەوەی ئەو کەسانەش ناچێتە ناو خانەی هەڵبژاردنە ئەبستراکتەکانەوە، هێندەی دەکەوێتە ناو ئەو پانتاییانەی بە دەگمەن لەسەر نەخشەکانیشدا دەبینرێن. ئێمە چی بکەین لە ڕۆشنبیرییەک کە چەندین ساڵە لە ناو قەرەباڵغییەکی بۆشدا بە دیلیی دەستەهایەکەوە!! دەتلێتەوە، چ ڕوانگەیەک، هزرێک، مشتێک دەتوانێ ئەو دیوارە بەردینە برمێنێت؟ گومانی تێدا نییە ئەو ڕوانینانە دەتوانن دیوارە دەستکردەکان برمێنن کە چەکوشئاسا لە دەستی ئەو بازووانەدان، بێ سڵەمینەوە دەیوەشێنن، بێ مەرجی ئەوەی دیواری دیکە لە جێی دیوارە کۆنەکە هەڵچننەوە!!

ئێمە پێمان وایە لە ناو دنیای هزر و ڕۆشنبیریی کوردیدا و بە تایبەت لە سەدەی بیستەمدا مامۆستا مەسعوود محەمەد یەکێکە لەو بیریارانەی کە خاوەنی جیهانبینی و فکری ڕەسەنی کوردانەی خۆی بێت. ئەو تاکە کەسە توانیویەتی لە دیدگای خۆیەوە مانای دیکە بدۆزێتەوە. هەڵبەتە مانادۆزینەوەش تەنیا لە ناو ڕەهەندە ڕەخنەییەکانەوە دێتە دی.

کارەکانی ئەویش زۆربەی جار کاری ڕەخنەیین، وروورژاندنن. خوێندنەوەکانی لەسەر حەزرەتی نالی و حاجی قادر، ڕوانینی مرۆڤانەی بۆ لێکدانەوەی مێژوو، لێکدانەوەی تایبەت لەسەر مرۆڤ و دەوروبەر، ڕەخنەگرتنی لە تەوژمە چەوتەکەی بیری مارکسیزم چ کوردی، چ جیهانی، پێشبینییە سیاسییەکانی کە زیاتر پێشبینیی فکرین، ئاماژەیەکی ئاشکران لەسەر ڕاستی ئەو بۆچوونانە.

لێرەدایە ئیدی دواندنی بیریارێکی لەم چەشنە لە ناو ڕۆشنبیرییەکی تەسکئامێزی وەک ڕۆشنبیریی کوردیدا هەروا کارێکی سادە و ساکار نییە، بەڵکە لە پشت ئەم دواندنەوە پێداویستی و لۆگیکێکی پێویست پاڵنەر بووە. ئێمە بە تەنیا لە ڕێی نووسینەکانەوە ناکرێ نووسەران بناسین و لە بیر و بۆچوونەکانیان بە دروستی تێبگەین، بەڵکە زۆر جاران نووسەران و خاوەن هزرەکان لە ڕێی ژیننامە و بیۆگرافی، نامە نووسینی تایبەتی خۆیان لە ژیاندا و تێگەیشتنی خۆیان خەباتی خۆیان لە ژیاندا و تێگەیشتنی خۆیان بۆ شتەکان و جیهانبینی پوخت و ڕاستەقینەی خۆیان لەسەر دنیا ڕوون دەکەنەوە...
لەگەڵ ئەمەشدا ڕەنگە هێشتا دۆزینەوەی ڕاستی لەناو دێڕەکانی هیچ کام لەو گوتارانەدا بەدی نەیەت، بۆیە زۆر جار پرۆسەی دواندن دەتوانێ بەو کارە هەڵبستێ. دیارە لێرەدا بانگەشەی ئەوە ناکەین بەم دواندنە توانیومانە ڕاستی سەبارەت بە هەموو شتەکان لە مامۆستا مەسعوود بسەنین و وەربگرین. بەڵام هێندە هەیە دەتوانین بڵێین مەبەستمان بوو لەم کارەوە مانای ڕاستی لای ئەو بدۆزینەوە. ئەمە کرۆک و هزری نووسینەکانی مامۆستا مەسعوود محەمەدە. هەڵبەتە کاری هەموو نووسەرێکی مولتەزیمی تریش بە شێوەیەک لە

شێوەکان هەروا دەکەوێتەوە، هەر وەک خۆی لە سەرەتای لاپەڕەکانی بەرگی یەکەمی مرۆڤ و دەوروبەردا ئاماژەی بەو ئیلتیزامە داوە...

لێرەدا لە ئەنجامی پرسیارەکان نادوێین، بەڵکە پرسیارەکان چۆن هورووژاون و وەرامدانەوەیان بەرهەم هێنا، ئەمەیان نهێنی دواندنەکە نیشان دەدا، ئەگەر چی دواندنێکی زیندوومان لە نێواندا نەبوو، کاری ئێمە تەنها لە ڕێگەی ئەو نامانەوە بوو کە زۆر جار نائومێد دەبووم بە هۆی سەختی و دژواری و دوورەدەستیی پەیوەندی کردن لەوەی تەنانەت بە دەستی مامۆستا بگات، وەلێ خۆشبەختانە هەموو ئەنجامەکان بەپێی مەبەست بوون.

کۆمەڵە پرسیاری یەکەم چوونە دوو توێی پەرژینی بێدەنگییەوە 1996. کۆمەڵە پرسیاری دووەم لە ئایاری 1996 دا ئاراستە کراوە و پاش 3 مانگ وەرامەکانم پێ گەیشتەوە و دەستەی سێیەمیش لە سەرەتای ساڵی 1997 دا ئاراستەم کرد، ئەوێش پاش 3 مانگ وەرامەکانی هاتنەوە. بەسەر یەکەوە لە چاپدانی هەموو پرسیارەکان مانا بەخشینە بە پرۆژەکە. با خوێنەری هێژای کورد خۆی سەرپشک بێت لە هەڵسەنگاندنی ئەم کارەدا. لێرەدا دەمەوێ سوپاسی هەموو ئەو برایانە بکەم کە کۆمەکیان کردم و هانیان دام درێژە بەم پرۆژەیە بدەم و زەحمەتی هێنان و بردنی نامەکانیان خستە ئەستۆی خۆیان. هیوام وایە بەم کارە بەرهەمێکی نوێم پێشکەش بە کتێبخانەی ژیکەڵەی نەتەوەکەم کردبێت.

هەڵۆ بەرزنجی
بەرلین ئەیلولی 1998- گەلاوێژی 2610

– فەلسەفەی مرۆڤ بۆتە ئایینزایەکی بەهاو پیرۆز لە ژیانتا، ئا لەم دیدەوە چاوەڕێی چ ئایندەیەک لە بەردەم مرۆڤایەتیدا دەکەن، بە تایبەت دوای گۆڕانکارییەکانی ئەم چەند ساڵەی دوایی؟

لە بارەی گۆڕانکاریی ئەم دواییەوە کە وابزانم مەبەستت هەڵوەشانەوەی سۆڤێتستان و نسکۆی کۆمیونیزمە من لە ڕۆژانی هەرە زووی 1949 و هەرە دوایینی 1950 گوتومە و لە هەندێ نووسینی ئەوسامدا کە مومکین نەبوو بڵاوی بکەمەوە دەرمبڕیوە گوتومە مارکسیزم ئەگەر تەعدیلاتی بنەڕەتیی تێدا نەکرێت ناشێ بەردەوام بێت چونکە لەگەڵ سروشتی مرۆڤ و ڕاستیەکانی کۆمەڵایەتیی بێتەئویل ناگونجێت... دەمێنێتەوە کۆمیونیزم وەک بیروباوەڕێک کە لە مارکسیزمەوە پەیدا بێت، ئا ئەو کۆمیونیزمە بە بەریەوە هەیە ماوەیەکی درێژەدار بژیت نەک لەبەر لایەنی «علمانية»ی کەوا بێگومان، بەلای منەوە بێگومان، بەشێکی زێدە گرنگی پێوەندی بە واقیعەوە نییە و پتر بە لای گریمانە (فرضية) و ئارەزووی خاوەنەکەیدا دەچێتەوە کە ویستوویەتی چینی ڕەنجدەر لە نەزەرییدا بکاتە خاوەنی مێژوو و لە ئایندەدا حوکم بە دەستەوە بگرێت... یەکێک لە گوتە مەشهوورەکانی ئەنگلز کە دەڵێ کارکردن خاڵقی مرۆیە ڕاستییە هەرە سەرەکی و بنەڕەتییەکەی کۆمەڵایەتی سەروبن کردووە، چونکە مرۆڤ خالقی کردەوەی کۆمەڵایەتیە و کۆمەڵایەتیش بریتیە لە هەموو مێژوو، بە پێی ئەو گوتەیە دەبوو هەموو جانەوەرێک ببێتە مرۆڤ، خۆ مێروو شەو و ڕۆژ لە هاتووچۆ دایە. وا ڕچەی شارەگێرکەیەک بە بەردەمی دەرگای ژووری مندا دێت و دەچێت بە شەویش پشوو نادات، چ ئاگاشی لە عەزابی من نییە بە دەست خۆ پاراستن لە شێلانیان... بەر پشکووتنی هۆشی مرۆ ئیمکان نەبووە کاری سەر بە کۆمەڵایەتی پەیدا بوبێت... هەر لەم ڕوانگە بەدیهیەوە ڕا ئاشکرایە کە قۆناغەکانی مارکسیزم

هەڵیناون لەسەر جۆری گوزەران و ئاکامەکەی دەکاتە گەیشتنی چینی ڕەنجدەر بە حکومەت، ئا ئەم بیروڕایە ئەفسانەیەکی، وەیا تەڵەیەکی، سیاسییە دەستچێن کراوە لە شوێنی ڕاستییە بێفێڵەکەی قسە هەڵبڕەوەکەی لە چاوچەقیوەکەی کە دەڵێ: بەر لە تێگەڕانی هۆش لە مێشکی مرۆڤ و پەیدابوونی - زانین - ی هۆشەکی جودا لە هەستی غەریزی، مومکین نەبووە کردەوەی سەر بە کۆمەڵایەتی و گۆڕانی کۆمەڵایەتی- مێژوویی پەیدا بێت... قۆناغەکانیش هەر لەو ڕاستیەوە دەبێ بدرێنەوە بە فراژیبوونی بڕشتی هۆش و بیرکردنەوە لە گۆڕینی ئەمرازی ڕاو و چەکی دیفاع و پرسیار لە حەقیقەتی بوونەوەر و پەی بردن بە چاندن و ئاژەڵ کەوی کردن... و... وە هەتا دەگاتە ئەو ڕۆژانەی کە خەریکە ترسی ئاتۆم زەندەقی مرۆ ببات... وەرزێر و کرێکار و هەرچی نەخوێندەوارە چ دەستێکی نەبووە لە داهێنانی نووسین و فەلسەفە و یاسا و هەرچی دیاردەی ژیارییە، وەرزێر لە 5000 ساڵەوە بە دوا کلکی گاڕەشدا زەوی دادەڕوشێنێ و یەک هەنگاو بەرەو پێشەوە نەچووە و لە مێردەزمە تۆقیوە و شێخۆلکە و شەعبەدەبازی پەرستووە تەنانەت گاسن و داسەکەشی لە شارەوە بۆ دەچوو... من لێرەدا چیی دیکە بە دوا ئەم شریتە لێکدانەیەوە ناکەوم چونکە لێ ڕەهابوونی و بە کۆتایی گەیشتنی کاری کردەنی نییە و لە نووسینی جۆراوجۆرمدا بە پێی لوان دەوری ئەو باسانە هەڵاتووم هەرچەند پچرپچریش بوو بێت... شیوعیەت نەک لەبەر لایەنی «علمانية» بەڵکە لەبەر لایەنی عاتیفە و تاوگیری و تیژڕۆیی و دەروێشیاتی تێیدایە تەمەندرێژتر دەبێت لەوەی خەڵک چاوەڕوانی دەکات، سەیرێکیش لەوەدا نییە چونکە گاپەرستی و بوتپەرستی لە سەردەمی ئاسمانگەری گەشە دەکات... کەنیشتەیەکی لەسەر دانهێنان بە سووڕانەوەی زەوی لە دەوری ڕۆژ زانای فەلەکناسی دەسووتاند ئێستا شانازی دەکات بە ناردنی ئینجیل بۆ ناو مانگ... با دوور نەڕۆین، ئەگەر شیوعیەت چاوەڕوانی ئەو مەرجانەی کردبایە کە مارکس بۆ هاتنە دی شیوعیەت بە بنەمای داناون کوردستانە وێرانەکەی خۆمان کە بە هەموو مێژووی کۆن و نوێیەوە نەک بانک بەڵکوو

«صراف»ێکی خۆماڵی بە خۆیەوە نەدیت، چۆناوچۆنی بە مێشکی کرایەوە و چاوی دنیابین جورئەت وەبەر خۆی دەنێ بڵێ من شیوعیم: ئەگەر شیوعیەت نەبووبێتە دین کەی لەسەر بەردە ڕەقی قڕناقە و نێڵەگێن و جرتاوە نیقابەی پرۆلیتاریایی بۆ گۆڕینی سەرمایەداری هەڵدەنێ کە جارێ سەرمایە بە مەفهوومی سەردەم لە کوردستان پەیدا نەبووە…

لەمانە تێپەڕین بۆ ئایندەی دوای لەبەر یەکترازانی گرێ پووچکەکانی مەتەڵی شیوعیەت: پرسیارەکەت وەها ڕادەگەیەنێ کە شیوعیەت و ئینتەرناشناڵیزم لەمپەڕی هەرە گەورە و بنەڕەتی پێش خورگەی تێهەڵکشێن و ئاسوودەیی مرۆڤ بێت! بێگومان هەر بیروباوەڕێکی کەندی قوڵی جوداخوازی و لێک دڕدۆنگبوونی ئادەمیزاد، چ لە مەیدانی نێونەتەوەییدا و چ لە مەیدانی نێوان ڕیزەکانی یەک نەتەوە دا بێت، هەڵکەنێت، بە دوژمنی مرۆڤایەتی دەژمێردرێت با موژدەی ئاوی حەیاتیشی لەگەڵ دابێت، کە دەزانین هەرگیز ئاوی زیندەگانی و گوژاڵی خەڵک تێکبەردان بەیەک شەلەگەدا ناڕۆن. ئێمە دەزانین تاکە هاندەری «خۆویستی» کە بزوێنێکی سروشتیی غەریزییە و لە سەرەتای پەیدابوونی ژیان و لە زۆر مەیدانی ئێستاکەی بووندا، بە تایبەت لە جیهانی غەریزەی مرۆڤدا، هەر کاریگەر و هەمەگیرە، ئا ئەو تاکە هاندەرە چ جۆرە فەلاکەتێک لە کۆمەڵایەتیدا دەڕسکێنێ، ئەوجا کە هاندەری عاتفی دڵبزوێن و دەروونوروژێن کەوتە پاڵ خۆویستیەوە تۆ بڵێ چ بە مرۆی نیمچە ساوای نیمچە مەییوی نیمچە گێل و شەوکوێر بکات…

بە بیرمە تا پەنجا ساڵێکیش پێش ئەمڕۆکە مرۆی بێگانە بە خۆی و بە جلی جودا و زمانی جودا و ئایینی جوداوە وەک مێردەزمە دەهاتە بەر چاوی خەڵقە چ نەدیتکەکەی ئەو سەردەمە، نەک ئەمە و بەس، بەری سۆران کە ڕانکی لینگ فەڕاحی لە قاچوقولی پیاوی بادینان دەدیت گوێی لێ قوتاغ دەبوو وەک کە ئاژەڵی دیتبێت… تا ئێستاکەش جوداوازی لەهجە لە نێوانماندا مایەی جۆرەها دڵگەرمی و سریواندنە تا ئەوەی خەریکە کوردستانە تەسک و تروسکەکەی سەر بە عێراق لە لایەن عاتیفەوە بە سێ کەرت بێت، بابان،

سۆران، بادینان. ئا لەم ڕۆژانەدا کۆیێ ناوی عۆجەی بەسەردا دابڕاوە گۆیا لە قیادەی حیزبەکان زۆرن، هەرچەندە کۆیە بۆ خۆی خەریکە لە برسان دەمرێت و گەلێک لە ڕانیە و چوارقوڕنە داماوترە لەلایەن گوزەران و فراژیبوونەوە... خەڵکەکەی بە دەوری دائیم خەریکی خۆ ڕزگارکردنە لەو بێدەرامەتییە بێهاوتایەی کە وەک هەوری ڕەش باڵی بەسەردا هێناوە.. ئێستا بچیتە کۆیێ دوو کەست چنگ ناکەوێ لەو بابەتەی جاران مەجلیسئارا بوون کەچی زۆر بەرهەڵستی دەکرا و دەکرێ لەوەی کە بکرێتە مەرکەزی موحافەزە... ئەم میسالە دەهێنمەوە کە موحتاجی شایەد و سوێند و تەڵاق نییە تا مەعلوم بێ لە ڕوانگەی بێگومانەوە کە لێکترازانی کۆمەڵایەتی بە نیازی تێک بەردانی خەڵقەکەی لە پەنا زڕەبەهانەی بەرژەوەندی گەورەوە تاوانێکە هیچ لێبووردنێک هەڵناگرێت وەک کە ڕێگر بە بەهانەی برسیەتی خۆ لە تۆمەتی ستەم و دڕندەیی دەرباز دەکات، کەچی هەر نەبێ ڕێگرەکە تفەنگێکی بەلا شانیدا هەڵواسیوە کەمێکیش نەبێ لە ڕاگوزەری کاروانی ڕووتکراو هەر هێندە شک دەبات کە لە پشتی کوچە کەرێکی بارکردووە. ئەم خاڵەی تێکبەردانی خەڵک یەکجار ئاوخواز، بەوەندە لێی دەگەڕێم.

شیوعیەت و ڕەگەزپەرستی و جوداوازی ئایین و ئەوان جۆرە دەمارهەڵبڕەوەی پێوەندیی تەبایی نێوان خەڵق و خوا تێکڕایان تاوانی کوێرکردنەوەی شەقامی پێکەوە هەڵکردن (تعایش)ی مرۆڤ بە ئەستۆوە دەگرن، ئێمە دەبێ هەموو ئەو بەهانانەی خەڵق بەشەڕ دەهێنن تاوانبار بکەین هەر چەند نیاز و داوایان لەسەر بنەمای ڕاست و دروستیشەوە هەڵسابێت. بەکارهێنانی ددان و چەنبۆڵە لە ڕەوتی ئادەمیزاددا تەنها لە حاڵەتی خۆپارێزی و لە سەرکردنەوەی ستەمدیدە ڕەوایە. دەمەوێ بڵێم ڕەوینەوەی مەترسیی خەڵق گێلکردن و تێکبەردان بە هەرەسی سۆڤێتستان نایەتە دی. مرۆ تەنها چاوێکی نیمچە خەواڵووشی بە دنیادا بگێڕێت و هەر لە ناکۆکیی نێو خێزان و گەڕەک و وڵات و تیپی یاری کردن و کێبەرکێ لەسەر هەزاران هەزار هۆی گرنگ و خوێڕیلە و بەربەرەکانێی دەوڵەتان چ لە یەک جۆرە ڕێژیمی سیاسیدا بن چ

جودا... هەتا دەگەیتە کاری مێگالۆمانیا و گرێی ناکامی سەرۆکان و هەتا... و هەتا... هەتا ئەوپەڕی مەودای چاوتێبڕنەکردووە لە جوداوازیی تاک و کۆمەڵ لە هەموو ڕوویەکەوە... ئا ئەو دەریا لەسەر دەریای لێک هەڵگەڕانەوە و پێکدادان و لێکسریواندن و لێکمۆڕبوونەوە و نازانم چی و چی بگریتە بەر نیگای وردخوێن و بیخەیتە دەستە تەرازووی هۆشێکی ڕوون و دڵێکی ئارام لێت سوور دەبێ کە «ئاسوودەیی»ی مرۆڤ لە دەست دەردەکانی خۆکرد و خۆئاوسکەر بە دەردی نوێتر تەمایەکە چەندێکی پیرۆز و بەشەرەف و ڕەوا و شایانی مرۆ و شانازی پێوەکردنە هێندە و لەوەش زیاتر doorە دەست و نەفەسبڕ و پشتشکێن و مرۆخەسێن و مێینەنەزۆککەرە...

لە نووسیندا گوتوومە عالەمی پێشکەوتوو لەوانەیە داهێزێت لە بن قورسایی تەبەق لەسەر تەبەقی کوێرایی و گومڕایی و بەهەڵەداچوویی و خوێڕیەتیی ئەو جیهانەی سێیەمی کە زۆربەی دەوری 4 ملیار بەشەری ئەو جیهانە حەیفە پێی بگوترێ مرۆڤ... لە کۆتایی «من هموم الحياة» ئەم چەند دێڕە دەخوێنیتەوە کە لە دیدی خۆمەوە سەیری عالەمی بیستەم و پەنجایەمی پێ دەکەم:

«انك مهما حاولت ان تنظر الى عالمنا من وراء زجاج قوس القزح فلن يطالعك الا منظر اسود بعضه بالمحروق واحمر بعضه بالمسكوف. فاذا تسنى لقوة وهمك ان تجد بصيصا يضيء بالتبشير فاني لم اجد شيئا من ثمار حسن التدبير وحكم المنطق وداعية المصلحة وراحمة المعدلة وانما وجدت المصير موكولا الى ذاته نحو المستقبل بلا ضابط أو دليل فنحن فاقدون ما تملكه الارض في انشدادها بقوة الجذب الى الدوران المنظم حول الشمس فندور في الفراغ او نمرق كالسهم المنطلق الى غير هدف. دنيانا جرح مفتوح ينزف، لا طبيب ولا علاج وانما قدرة الجسم الحي على الشفاء من طبيعة تكوينه، واحتمال الشفاء والفناء مقسوم بينهما بنسبة خمسين الى خمسين... »

خەتم لە ژێر ئەو چوار وشەیە کێشا [لە کتێبەکەدا نەکێشراوە] بەو نیازە کە سەرنج ڕاکێشم بۆ ڕاگەیاندنی نەبوونی ئومێد بەو چوار کاریگەرە لە زەمینەی ڕزگاربوونی جیهانە ناپیرۆزەکەمان، لەوەڕا ئیحتیمالێکم بۆ قوتاربوون

هێشتۆتەوە ئەویش (لە لای باوەڕی خۆمەوە) شارستانەتی و ژیاری وڵاتە پێشکەوتووەکان لە سەدەی داهاتوودا لەگەڵ سەرەژوورچوونیان عالەمی بیستەمیش لە قۆرتەکەی دەرهێنن. دەزانم لەوانەیە تاکێک نەبێ لەو ملیۆنانەی خەریکی یەکدی بڕینەوەن بیر لەو لایەنە بکاتەوە بەڵکە، بەپێچەوانەوە، کە ئەو تاکە خۆی سوارچاکی دڕی و شڕی و بکوژە بسووتێنە بێت بێگومان گاڵتەی بەو قسەیە دێت و بە زۆریش ئەو تەرزە جانەوەرانە شارستانەتیی شوێنی وەک دانمارک بە پاشکەوتووی و حەیاچوون دادەنێن.
پاش تەقینەوەی بوومەلەرزە وێرانکەرەکەی 14ی تەمموزی 1958، ئەو خوێنگەرمانەی ڕێیان دەکەوتە ئەورووپا کە پێشتر خەونیشیان پێوە نەدەدیت، بە لایانەوە خەڵقی ئەورووپا لە سیاسەت زۆر پیادەن و هیچ نازانن، تومەز کاکی دڕندەی عیراقی وای دەزانی عەقل و غیرەت و بەرژەوەند لە هوتاف و دروشم و نەڕاندن و کەلەش ڕاکێشاندا هەیە... هەر نەیسە! ڕمانی لووتکەی سۆڤیەت و ڕەهابوونی ئەورووپای شەرقی بووە هۆی وەستانی جەنگی فێنک، ڕەنگە لە ماوەیەکی موناسیبدا ئەمەریکاش لە کەری خۆی دابەزێت کە واقیع لێی قەبوڵ ناکا، خۆیشی هێندە گێل نییە لە خۆی بسەلمێنێ هەڕەشە لەو دەوڵەتە بچوکانە بکات بە چەکی ئاتۆم کە جاران سەلامەتیی خۆیانیان لە لەنگەربەستنی دوو دەستە تەرازووی دوو لووتکەییدا دەدیت... هەوای یەکەمینایەتی و تاک پاڵەوانەتی سەر شانۆی جیهان بەینێک سەرسوڕکێی پێ دەکات (واتە بە ئەمەریکا) بەڵام ئەگەر دنیا تەقڵەی نوێ لێ نەدا و پاڵەوانێکی تازە پەیدا نەکا ئەمەریکا چاری ناچارە لە ڕێی ڕازیکردنەوە، بە هەر جۆرە هۆیەکی سیلمی بێت، لەگەڵ دنیادا مامەڵەت بکات... لەو ناوەشدا یەکبوونی ئەورووپا هێزێکی گەورەی بەرەو «تفاهم» نەک، بە حەقی کوتک، پێکدەهێنێت، کەوا ڕەنگە لە دواڕۆژدا پارسەنگی جۆرەها ڕیزبەزاندنی فێڵبازانە یان هەڕەشەکارانە بداتەوە. بەڵام جارێ زووە بۆ بڕیاردان لەسەر چۆنیەتیی لەنگەر بەستن و چەسپاندنی باری سیاسەت - کۆمەڵایەتی لە ڕووسیا و ئەو دەوڵەتانەی خۆی پێوە دەبەستنەوە... بە داخەوە گۆرباچۆڤ پتر لە لزوومی

دڵدانەوەی مارکسیزم و لینینزم و شیوعیی «متصوف» خۆگیریی کرد لە هەڵێنانی هەنگاوی پێویست بۆ پتەوکردنی ئەو بنەمایانەی دەبێ ببنە جێگیری مارکسیزم چ لە فکر چ لە کردەوەدا. من دوو جوزئم لە نەقد و تەحلیلی پێرۆسترۆیکای گۆرباچۆف نووسی دەوری 300 و کسوور لاپەڕەیان خایاند تا گەیشتمە لاپەڕەی 60 ی کتێبەکە. لەوە بەولاوە جڵەوی ڕوودان لە دەست گۆرباچۆف دەرچوو ئیتر نەقد و تەحلیل شتێکی بەسەرچوو و بێسوود ما.

دوارۆژی ئادەمیزاد بە چ باردا دەکەوێت مەحکووم نییە تەنها بەو گۆڕانکارییەی باسی دەکەیت، ئەو ڕووداوە لە کولانەی چارەنووسی ئادەمیزادەوە سەیری بکرێت، ئەگەر نسکۆی نەیەتە پێش، دوو ئەنجامی خۆشکەڵەی دەبێت: یەکیان ئەوەیە ترسی شەڕی ئاتۆم زۆر کز دەبێتەوە. دووەمیان ئەوەیە لەمپەڕی تیژڕۆیی شیوعیان لە نوختەنیگای شەڕی چینایەتی و گومان کردن لە هەرچی شیوعی نییە گەلێک تەخت و بێپۆز دەبێت... ئا ئەم دوو کاریگەرە تەئسیری ئایەتی (ئایەتی: ئەرێتی) ی باشیان دەبێت لە گەلێک مەیدانی:

1- سیاسی
2- ئاسوودەیی
3- ئابووری،

بە کەمبوونەوی مەسرەفی چەک و جەنگ و بە کرانەوەی مەیدانی ئاڵۆزتر و بەرهەمهێنان و ماڵداری لە ئاکامی بێتەئسیری کۆنە توهمەی شیوعییان کە لەو چالاکیانەی ناشیوعیەکان دەگرت و بەشێکی زل و زەبەلاحی بێگوناحانی تێدا گوناهبار دەکرا و لایەنی تێکۆشەرانی دەوروبەری، ناوەڕاست و بێتەرەفان پێ زراوڕژاو دەبوون و ئایەتولکورسییان لە خۆ و ماڵ و منداڵیان دەخوێند... هەڵبەت مرۆی چەپڕۆ وەیا توندڕۆ، لە هەر بابەتێک بێت، وەک هەموو دەرد و وەبایەک وێرانکەر و تێکدەر و وەخرێنە. هەر بیروباوەڕ و کردار و گفتار و ئاماژێکی توندی و هەڕەشەی لەگەڵدا بێت دەبێ ئافەرۆز و حەیاتکاو بکرێت،

ئەم فەرمانەش لەخۆوە جێبەجێ نابێت، دەبێ هەموو ئەو هۆشکرایەوانەی دۆستی بێ تەئویلی کەرامەت و چارەنووسی مرۆڤن، چالاکانە، بەڵکە لە زۆر باردا خۆ لەبیربردووانە، ڕێ لە ڕێگری ویژدان و خواستی خەڵق کوێر بکەنەوە. هەروەک خوێنگەرمەکان بەهەزاران و ملیۆنان لە پێناو لغاوکردنی خوێن نەکوڵاوەکانی دەرەوەی تیژڕۆیی و لە بەربەرەکانی دژی ڕژێم و ئیستیعمار گیانیان لەسەر لەپی دەست دادەنا و خێزانەکانی خۆیشیان دەخستە خەتەری حەپس و ئیفلاس، دەبێ کەسانی پەرۆشخۆر بۆ ڕێبازی دیموکراسی و ئاشتی و دادیش تا ڕادەیەک لە سستەمی کۆنینەیان و ترسی تۆمەتی ناشیوعیبوونیان دەرباز بن و لەسەر کەرامەتی خۆیان و ئادەمیزاد بە تێکڕایی دەنگدلێر و چاوقایم و، لە پێویستدا، جەربەزەبن: لە نموونەدا دەڵێم ساڵی 1953 مامۆستایەکی دەرسی ئینگلیزی لە سانەوی کۆیێ، ئوسترالیایی بوو ناویشی «ستیپلتن» بوو، بۆی گێڕامەوە کە شیوعیەکان لە ئوسترالیا فێربوون هەر جارەی کۆبوونەوەیەکی عادەتی ناشیوعی گیرابایە چەند کەسێکی بێشەرمیان دەترنجاندە ناو کۆبوونەوەکە و بەهەر نامەیەک بێت دەیانشێواند... گوتی ئێمەش وەک ئەوانمان کرد، چەندێکی کۆمەڵ بوونایە لێمان تێکدەدان هەتا ئیفلاسمان پێ کردن... ئێستا لەجیاتی شیوعی جۆرەها دەستەودایەرەی خۆسەپێن و لە کەس نەسەلمێن گەشە دەکات و دەتەنێتەوە، ئەگەر لایەنی بەرەو ڕووناکایی و چوونەپێش جڵەوی سیاسەت و ڕشتەی هێمنایی و مافی مرۆڤایەتی و ئەو جۆرە ماکە کاریگەرانەی، کە بەداخەوە جارێ ساوان، بە شێوەیەکی تاڕادەیەک، هەستپێکراو لە دەستدا نەبایە. بێگومان مێش و مەگەزی زەلکاوەکان فیلیان دەخستە سەر پشت. چاوپۆشی دەکەم لەو حیزەفیعلانەی بۆ تەئمینی بەرژەوەندی بەرتەسکی دەوڵەتی بەدەسەڵات و هی کەمدەسەڵاتی خاوەن تەکنیک نرخە بەشەرەفەکان پێشێل دەکەن، ئەمیشیان چیرۆکێکی بەسفتوسۆیە کات و کاغەزی پێ پڕناکەمەوە.

باری «چین» بەخۆی و 1200 ملیۆن نفووس و ئینجیلە پەرپوتەکەیەوە مەسەلەیەکی سەربەخۆیە بە بەریەوە هەیە لەنگەربەزێن بێت، زۆریش

پێویستی بە گلاسنۆست و پێرۆسترۆکایەکی تایبەت بە خۆی هەیە... تا ڕادەیەک هیندی غاندی و نەهرۆ بە قورسایی 700-800 ملیۆن نفووسیەوە و دیمۆکراسییەکی مەیلەو ڕەگداکوتاوی مێژووییەوە لەو هەرێمەی ڕۆژهەڵاتی دووردا کە ژاپۆنیش هاودەنگی دەبێت لە ململانێ و پارسەنگ دانەوەی مامڵەتی نێوان هێمنی و دەمارکشتیدا دەستە تەرازووی بەرامبەر چین ڕاست ڕادەگرێت، ئەگەر چی لەقیش بێت... ڕەنگە بشێ بڵێین نەمانی ترسی هەڕەشەی سۆڤیەت لەکپکردنی دەروونی ئەورووپا بەگشتی، ڕەهاکردنی دەنگێکی دلێری دیموکراسی و مافی مرۆڤی پێوە دەبێت کە ئەمە بەلای چاکەی ئێستاکە و دواڕۆژی هەموو ئادەمیزادە و بەرهەمیشی لەکڑی خۆیدا دەبێت ئەگەر ئاپۆرەی ملیارەها خەڵقی جیهانی تاریکمان لە سرِی و وڕێنە و نیگائاڵۆزی و ئەفسانەی بەنگکێشی مەیلەو بتەکێنەوە، چونکە چەندێکی پاسەوانی قەبرستان، کە ئەورووپا بێ، چالاکی بکات لە پاراستنی کێڵە قەبران هەر ناتوانێ مردووان بەخەبەر بێنێ.

بەنیسبەت خۆمانەوە گوتوومە و دەڵێمەوە ئەگەر کورد خۆی نەبڕێنێتەوە بە براکوژی و بە چەپڕۆیی و داوای لەتوانابەدەر، سیاسەتی عالەمیش گۆڕانکارییەکی وەک سەرەوبنبوونی تێدا ڕوونەدات دواڕۆژی گەلێک ڕوونتر دەبێت لە ڕابوردووی و چارەنووسەکەی پتر دەکەوێتە ناو جغزی هیوا و تەمایەوە، بەڵام ناشێ سنوور دانێین لە خەیاڵەوە بۆ ئەم شانۆگەرییە چەندین لایەنە، ئایا پانایی چەندە و چەندیش کات دەخایەنێ هەتا قاڵبی هەرە دوایی وەردەگرێ... لێرەدا کۆتایی بە وەڵامی پرسیارەکە دەهێنم هەرچەند گەلێک لایەن و چەندوچۆنی و کەی و کوێی تێدایە ڕوون بکرێتەوە بەڵام لێ بە کۆتایی گەیشتنی لە توانا بەدەرە.

- وەک پاشکۆیەکی پرسیاری پێشوو دەمانەوێ بپرسین کەوا تەواوی دیاردە درندە و ترسناکەکان کە کۆتایی ژیان بە دەردەخەن و ئێستا لە ئەورووپاش بەشێکی زۆری زانا و نووسەرەکان نووسین لەسەر نۆغرۆبوونی دنیا بڵاودەکانەوە، قسەی ئێوە لەسەر ئەم حاڵە چییە؟

ئەوەندەی ڕێمان هەبێ قسە لە وێرانبوون و نەبوونی دنیاکەمان بکەین بێ ئەوەی ببینە کتێبگرەوە و ڕەمڵلێدەر ئەوەیە کە چەکی ئاتۆمی، یاخود بابڵێین بەکارهێنانی ئەو هێزەی ئاتۆم بە بەریەوە هەیە لەدوارۆژدا جیهان بکاتە بەهەشت، بەبەریشیەوە هەیە داری لەسەر بەردی نەهێڵێ. هەر ڕۆژەک ئەو چەکە کەوتە دەستی دەوڵەتی بێباک لە ئاست ئاکامی بەرەڵابوونی یاریکردن بە مەرگ و ژین چ دوور نابینم بەکاری بهێنێ وەیا بە مافیا و چەتەی دنیای بفرۆشێت، ئەگەر مرۆ کەمتەرخەمی بکات لە ئاست مامڵەت لەگەڵ ئەو چەکە، یان ئەو هێزە، جەهەندەمییە وەک ئەوەیە بڕیاری خنکاندنی خۆی ئیمزا بکات... لەگەڵ هەموو جۆرە ئیحتیمالێکی کە چاوەڕوان دەکرێت من بۆ ئەوە دەچم لە ئاکامدا لایەنی بەرژەوەندی مانەوەی نەوعی مرۆ بەسەر لایەنی هەڵەشەیی خۆبراندنەوە زاڵ بێت.

- ئەم دروشمەی کە بانگەشە دەکات و دەڵێ هەموو بیروڕا و فەلسەفە و ڕەفتارێک دەدەینە دواوە کە لە بڵندی و کەرامەتی مرۆڤ کەم بکاتەوە و مرۆڤ بخاتە خانەی سەر بە هەرچیەک! چۆن هەڵدەسەنگێنین؟

لەبارەی هەڵسەنگاندنی دروشمی کەرامەتپارێزیی مرۆڤ، ئا ئەم پرسیارە لە زۆر شوێنی نووسینم وەڵامی دراوەتەوە و چەندین جار گوتومە شەرەفی مرۆڤ بەندە بە ئازادی بیروباوەڕ و کردار و گفتاری... هەر هۆیەک و بەهانەیەک و دروشمێک و ئایدیۆلۆجییەک مرۆڤ لە پلەی یەکەمینایەتی بوونەوەری جیهان دابەزێنێت تاوانبار و گومڕا و بێ شەرەفەکە ئیتر پێویستی نامێنێ پیاو بکوژێت یان ماڵی دنیا بدزێت یا بوختان هەڵبەستێت یان جاسوسی بکات هەتا ڕیسوا و بێ نرخ بێ، چونکە دالەنگاندنی پایەی مرۆڤ بۆ هەر مەبەستێک بێت لێی دەوەشێتەوە ڕێگە دەربکات بۆ هەرچی قەباحەتی ئابڕووتکێن هەیە: یەکێک مرۆڤ لە نوختەنیگای ئایینەوە بە گوناحبار دابنێت، هەر بە نامەی پەند و ئاگربڕی کردن لە تەنینەوەی گوناحەکانی چی

سوکایەتی هەیە وە پاڵی دەدات وەک کە دێت و پێی دەڵێت: ئەی ئەوەی دوو جار بەڕێگەی میزدا هاتوویە خوار... یاخود لە پەنا بەرەژوور بردنی پایەی، هۆی بەرهەمهێنانەوە، بیکاتە قوڕەچەورە بەدەست ڕابەری سیاسیەوە... من کە دێم باسی مرۆڤ دەکەم بە هەموو عەیب و عاریەوە لەپێشەوە سەلماندوومە و لە خۆم کردووە بە ئایین کە مرۆڤ هەرچەندە لە پلەی زێدە کز و بەرەژێری تێگەیشتن و بەخۆنازین و ڕەفزی بەندەییدا بێت دیسانەوە هەر خۆی تاکە کاریگەری مێژوو و کۆمەڵایەتییە و بێ ئەو ڕووت و ڕەجاڵەی کە جارێکیان دەبێتە میری سەربڕ و جارێکیشیان پێڵاوی ئاغا و شێخ و ڕابەری سیاسی ماچ دەکات و لەلایەکی دیکەوەش چرای زانست و داد و شەرافەت هەڵدەگرێت، بێ ئەو مەخلوقە هەرچی سروشت هەیە گیانی شانازی و نرخی بەرز و ئیبداع و دۆزینەوە و داهێنان دەدۆڕێنێت و دەبێتە قەپێلکی حەتاڵ و بەتاڵ، بێئاگا و بێناز...

مرۆ ئیعجازی هەرە هەرە گەورەی چەرخوفەلەکی نۆ نهۆمی کۆنینە و فەزای بێسنوور و برانەوەی سەردەمی زانست و تەکنیکە - هەتا دەمی ئەم نووسینە قسەکەم بە ڕاستی موطڵەق دەزانم، ئەوجا ئەگەر لە دواڕۆژدا ئیعجازی گەورەتر پەیدا بوو، واتە دۆزرایەوە، ئەوسا قسەکە دەگۆڕێت بە هێنانە خواری پلەی مرۆڤ لە ژمارە یەکەوە بۆ ژمارە دوو.

- لاتان وایە دیالەکتیکێکی نوێ بۆ بیناکردنی ژیانێکی باشتر بۆ مرۆڤ شیاوی تێهێنانەوە و ڕسکان بێت؟!

لە بارەی هەڵنانی دایەلەکتیکێکی نوێ بۆ بیناکردنی ژیانێکی باشتر! من واقیع دەکەم بە باوک و دایکی فەلسەفە و بەرنامەی ئاسوودەیی و کەرامەتی مرۆڤایەتی، نەک لەلاوە بیروباوەڕێکی هۆشکرد یان خەیاڵکرد یان ئومێدکرد بەسەر مرۆڤدا دەسەپێنم. من بەقاڵێکی میراتی و شارەزای بازاڕ بەسەر فەیلەسووفێکی نرخی شووتی و باینجان لە موعادەلاتی هۆش و فەلسەفانەوە هەڵێنجێت، ڕادەشکێنم. دەبێ بزانین دایەلەکتیک و ئایدیۆلۆجیا و هەرچی فکرێکی شەختەکردوو هەیە (واتە: قاڵبەستوو) بەزۆری هەرە زۆر دوو فەلاکەتی گەورەیان بەدەمەوەیە: یەکیان خۆسەپاندن تا ڕادەی خۆکردن بە دین، دووەمیان کوێرکردنەوەی ڕێی هۆشی ڕەها و تاقیکردنەوەی مەیدانی و خیاری ویستن و نەویستن. عەرەبی عێراق لە مێژە ئەم پەندەیان داناوە، زۆریش تێدا سەرکەوتوون «ترید أرنب أخذ أرنب، ترید غزال أخذ أرنب».

ئا ئەمە دەستووری هەموو بیروباوەڕێکی هەڵنراوی بە ژمارە هێندە و تەئریخی هێندە و فەرموودەی فیسار و نووسینی فڵانە کە دەخرێتە جێگەی حوکمی خوڕگەی ژیان و چالاکی عادەتی پەلەی ژیان لە چوارچێوەی «پێکەوە هەڵکردن و بەرژەوەندی سەلمێنراوی ڕۆژانە». دەوردانی ئیرادەی مرۆڤ بە فەلسەفەی «پیرۆز» دەکەوێتە ئەودیو سنووری ڕەهاکردنی ئیرادەی مرۆڤ، واتە دەبێتە پەرژینی مەنعکردن لە لێ تێپەڕینی. کە هات مرۆڤ لە ڕەهابوونیدا سنووری بەزاند، بە ئاسانی هەر لەبەر تیشکی یاسای عادەتیدا، و بە بەندیکردنی یەک حەفتوو دەکشێتەوە لەو پێ لێ هەڵبرینەی، مەرج نییە بەندی کردن بێت، دەشێ ڕۆژانە برین بێت [ئەو دوو دێڕەی خەتم لە ژێریانەوە کێشاوە باوەڕی خۆمە نەک درێژەی قسەی پێش خۆیەتی کە من پێی ڕازی نیم]. بەڵام کە ئایدیۆلۆجیا و فەلسەفە و بەرنامەی «مقدس» لەمپەڕێکی ترنجاندە هەیکەلی نظام و پێڕەوی بەڕێوەچوون و دابینکردنی حەزی مەشرووع ئەوجا شەڕێکی خاچپەرستانە نەبێت ئەو لەمپەڕە لا نادات...

تۆ ئەگەر پاڵەوان و قارەمانیت وەرە یاسای «مضمضة»ی سەر بە دەستنوێژ بسڕەوە، ئەشەدوبیلا عەرشی پەروەردگارت لێ بە ئاگا دەهێنن... یان ڕەخنەیەک لە مارکس بگرە یان ئەگەر تامەزرۆی ڕەقسی فلان و نەخشی فستان و باڵۆرەی نازانم کێیت وەرە خۆگیری بکە لە ڕەخنە و توانجێکی تێیان بگیرێت... ژەنگە بریقەدارەکەی کە لە دروشمی پیرۆز دەنیشێت «نعوذ بالله» کێ دەوێرێ لێی بکرێنێت. لە باری ئێستاکەدا چی پێی دەڵێن جیهانی پاشکەوتوو، بە لێ دەرهاویشتنی چەند دەوڵەتێک نەبێ، ئەوەندە ئایدیۆلۆجیا و فەلسەفەی بەسە، لێشی زیادە، حکوومەتێکی مام ناوەنجی نەکوژی نەدزی هەبێت و بەقەدەر حاڵ هەوڵی پەیدا کردنی بژێوی بۆ بدات. بێگومان هەر حکومەتێک لەو حکومەتانە کەوتە سەر باری فەلسەفە لێدان و پێداهەڵگوتن بە بەژن و باڵای ڕۆڵە هەڵمەتبەر و قارەمان و نیمچە پێغەمبەرەکانی، سەر لەبەری ئەو قەوانانە دەکاتە کوتەکی سەربڕینی پشتشکێنی... ئەگەر بلوێ، کە زۆر زەحمەتە بلوێ، بێن و تامێکی دیموکراسی و وردە بەهاراتێکی مافی مرۆڤ بکەوێتە مجێزی حاکمەکانی عالەمی سەدوبیستوپێنجەم تا ئەوەی کە شەقیان وەشاند کابرای شەقخواردوو قۆڕ نەبێت. ئا ئەم ڕەحمەتە لە گۆڕی ڕەحمەتیانیش زیادە. لە لاپەڕەی 156 ی «من الهموم الحياة» ئەمەم لەبارەی تێکۆشەرانی عالەمی سێیەمەوە گوتووە:

«انهم قد يكونون مدافعين عن أنبل القضايا ولكن بروح الذئب الطامع في القطيع وقد يكونون أبسل الناس في الجود بالروح ولكن في تربص قاطع الطريق بالقافلة... ذلك أن أحسنهم أخلاقا وأوطاهم أكنافا وأقربهم الى المرحمة تناهوا من خلال ايمانهم المطلق بالذات الى الادانة المطلقة لذوات الاخرين فليس في قاموسهم السياسي حيز للحرية والاختيار الا ان تكون حرية تأليههم واختيار تقديسهم والتسليم بما يؤمنون»...

دەستوور و یاسادانان بۆ سروشت، و تا ڕادەیەک، بۆ زیندەوەر (غەیری بەشەر)ە.

- ئایا مرۆڤ وەک نهێنیەکی قووڵ بە ئاستێکی درشت و بەرچاو گەیشتووە یاخود هەر گیانەوەرە نەناسراوەکەیە؟!

لە لاپەڕەی 156 ی «من الهموم الحیاة»، کە یەکەم لاپەڕەی دووەم بەشی کتێبەکەیە لە ژێر سەرناوی «نفض غبرة عن جبین الشمس» ئەمەم نووسیوە:

«... فليس بالمعرفة عسر هضم أو تصلب شريان كي تعيي بالمحسوس أو بالمفهوم أو بالمستخلص أو بالمستكنة أو بالمستشعر أو بالمستسر الذي يطلب الف سنة من الفكر والنظر والتجريب... »

دواتر لە لاپەڕە 46 دا دەڵێم:

«... بل أنها ستبلغ مديات من العمق والتسارع والاتساع تتجاوز بها مفهومنا للزمن نفسه، أنها ستخلف وراءها سرعة الضوء فتسخر الزمن مطية قد تبطىء وتبطىء حتى التلاشي وتسرع وتسرع حتى تخلف نفسها ظهريا. والفكر في يومنا هذا عاجز كل العجز عن تخمين امكانات المعرفة في الفتوح والكشف وفي النقض والتركيب وفي الاستيلاد والتعقيم وفي التمكين والتعجيز وفي الحذف و الاضافة وما الى هذه المعاني الشاغلة لكل المسافة بين اللاشيء واللانهاية... »

دەبینیت لەم ڕایەی ساڵی 1988 بڵاوم کردۆتەوە و لە دەمێکیشەوە پێی دڵنیام من لە مرۆڤ ڕادەبینم بگاتە زانینی هەرچی پێی دەگوترێ عالەمی ماددی تا کارکارەی هەرە شرایەوەی ڕاستییە نهێنیەکانی (دەبێ لێرەدا بڵێم ئەم دەسەڵاتەی گەیشتن بە کونهی ڕاستییان هەر لە سنووری مادده و هێزەکانی فیزیا و نهێنیەکانی کاریگەرە و ڕێی نییە بگاتە کونهی «خوا» چونکە سروشتی خوا و مادده لە هەموو ڕوویەکەوە لێکتر جودان. ئەمە دەڵێم نەکا فکری خواپەرست وا بزانێ من خوام سڕیوەتەوە یاخود بوونەوەرێکی ماددی دادەنێم... حیکایەتەکەش زۆری بەدەمەوەیە، دوای ناکەوم). وەک لێشتەوە

دیارە من لەو باوەڕەدام جارێ زووە بۆ بڕیاردان لەسەر چۆنایەتی و چەندایەتی و کەنگینایەتی پەیدابوونی عالەمی هەستپێکراو... لێرەدا مەودام نییە نوختەی جوداوازی بیروڕای تایبەت بە خۆم لەگەڵ بیروڕایەکی، وەک دوایین مۆدێلی تەفسیری وجوود، زاناکانی فەلەک و فیزیا لەبارەی هەوەڵ پەیدابوونی «مادده... وجوود»ەوە شەرح بدەم چونکە یەکجار درێژخایێنە و لەهەندێ حاڵوباریدا زمانگیڕان وەزەحمەت دەکەوێ... بەهەر حاڵ، گەیشتن بە کونهی «ئادەمیزادیەتی» بەندە بە گەیشتن بە کونهی عالەمی لە ئادەمیزاد بەرینتر کە هەموو دنیایە... بەڵام دەشێ زمان بگێڕین لە زۆر لایەنی

1- سەربە خودی مرۆڤ خۆی
2- سەربە مرۆڤێکی کە دەزانین چ کۆمەڵایەتییەکی گرێیاوی و پڕ تەنگوچەڵەمەی خۆکردی ڕەخساندووە
3- سەربە پێوەندی نێوان مرۆڤ و غەیری مرۆڤ چ گیانلەبەر چ بێگیان...

من کە دەڵێم زانینی کونهی مرۆڤ بەندە بە زانینی کونهی عالەم لەو ڕووەوەیە کەوا گەلێک باری نایەتیی (نەرێتی) کە لە سەرجەمی چالاکییەکانیدا هێندە چڵکن و گڵاو و بێ شەرەفە سەرچاوەیەکی گڵاوتری دەوێ لەو هێندە گڵاوییەی کە کەم بڕشتیی هۆشی و کاڵوکرچی نەفسی لێی ڕەچاو دەکرێت وەک کە منداڵێکی ساوا هێندەی مامۆستایەکی سانەوی شتان بزانێت دەبێ زەکایەکی لە حەد بەدەری هەبێت... لە لایەنی ئایەتیشەوە هەر ئەو مرۆڤەی دەیناسین دەگاتە پلەی ئەوتۆ لە تێهەڵکشین بە تایبەتی لە مەیدانی دوورە هەست و پێشبینی و غەیبزانی و... و... هتد کە هەمووی خۆڕسک و بێ مامۆستایە، وەها لە پێزانینمان دەکات کە بڵێین کاریگەرێکی دەرەوەی زاتی مرۆڤ سەرچاوەی ئەو دیاردانەیە. لە تەجرەبەی سەرنجراگرتنی خۆمدا، هەر لەو مەیدانەی وا قسەی لێوە دەکەم، شتی ئەوتۆییم لێ بۆتە مەتەڵ کە بەوەندە شارەزاییەی لە مرۆڤمان هەیە مەتەڵەکە هەڵنایەت، ئیتر بۆ تەعلیلی ئەوتۆ چووم کە لە سەرچاوەی نهێنییە

نەدۆزراوەکانی سروشتەوە هەڵمهێنجاون، دواتر لە کتێبی عیلمیی زۆر بەرز نموونەی زل زلم خوێندۆتەوە کە سروشت دەخلی هەبووە لە چۆنیەتییان هەرچەند نموونەکان لە حاڵوباری زیندەوەرەوە بە جۆرێکی دوور لە تەئسیری دەوروبەری ماددی کەوتوونەتەوە... جارێ تۆژاڵێکی سەرووی ڕووی شتان خۆی بۆ بەرچاوی زانست و تەکنیک یەکلاکردووە هەرچەند ئەو تۆژاڵەش ئەوەندە زانیاری سەیروسەمەری بە خەڵات پێ بەخشیوون نەیەتە حیسابەوە... لەم درێژە قسەی مەیلەوسەراو و تەنکەوە دەگەمە ئەو ئاکامەی کە لە کولانەی بەرژەوەندی مرۆڤ و چارەنووسیەوە گەیشتنی ئادەمیزاد بە حاڵەتێکی لە کەرامەتی بوەشێیتەوە و تێیدا بە جۆرێکی مەعقوول حەسایەوە بێت، تەمایەکە لەپلەی ئێستاکەیدا بە موستەحیل دادەنرێت چونکە نموونەی کۆمەڵگەی تێر و تەسەل و حەسایەوە ئێستاکە هەیە و دەشێ ژمارەی لە زیادبووندا بێت، واتە مەرج نییە حاڵ و بارێکی مام ناوەنجی و مەقبوول بۆ گەلە دواکەوتووەکان مومکین نەبێ هەتا کونهی «وجود» نەزانرێ. ئەوەی بەندە بەزانینی ئەو کونهەوە زانینی کونهی مرۆڤایەتییە هەرچەند دەزانم کە کەودەنی و گێلایەتی گەیشتە پلەیەکی پەست و بەرەژێر وەها دەکات گەیشتن بە خۆشی و کەرامەت خۆ لە موستەحیل دەخشێنێت... بێ ئەوەی خۆ بدەمە شەرح، زۆر بە خێرایی، ئەوەندەش دەڵێم، دوور نابینم مرۆڤ چەند تیرەی بنەڕەتی هەبێت نەک هەمووی لە یەک تیرە و باپیرێک کەوتبێتەوە. تۆ بڵێی هەروا لە خۆڕایی و بێ سەبەب دوو جینسی زەرد و سپی بە درێژایی زەمان پێکەوە جیران و تێکەڵ بن کەچی جوداوازیی نێوانیان هەر بەردەوام بێت مەگەر لە ڕێی بەیەکتر گەیشتنی مێ و نێری دوو جینسەکە کە ئەوسا وەچەیان دووڕەگە دەبێت؟ دەمێکە لەوە ورد دەبمەوە بە خامۆشی...

- ئاشبەتاڵی سیستەمی سۆسیالیزم چ ئاکامێکی ئەرێتی و نەرێتی بۆ مەسەلەی کورد قوت کردۆتەوە؟!

له ئاکامی چاک و بەدی ڕمانی سۆڤێتستان (تۆ ئاشبەتاڵی سیستەمی سۆشیالیزم بەکار دێنیت) لە مەسەلەی کورد، لە دوو خاڵ و نیودا وەڵام دەدرێتەوە. خاڵی یەکەم ئەوەیە سۆشیالیزم قەت بەلای چاکەی کورددا نەچووە و فلسێکی لێ خەرج نەکردووە، ستالین مەهابادی فرۆشت بە ڕێککەوتن لە سەر نەوتی شیمالی ئێران لەگەڵ قوام السلطنة... پێشتر لە سەرەتای شۆڕشی ئۆکتۆبەر و لەسەردەمی لینینەوە ڕووسیا لایەنگیری موستەفا کەمال بوو، جگە لەوەی کە برا شیوعیەکان هەمیشە کات ڕایان نواندووە کە «کوردایەتی» دەبێ لە جغزی ئینتەرناشناڵدا بخەبتێ، نەکا چینی زەحمەتکێش لەو وڵاتانەی کوردی تیادا دەژین دوو کەرت بێت و بە داخەوە چەندێکی توانیبێتیان تۆمەتی ڕەگەزپەرستی و «انفصالية»یان وەپاڵ داوە.

نوختەی دووەم ئەوەیە کە لە دەستە تەرازووی بەرانبەر ئەو دوو خاڵە ئیجابییەدا خاڵێکی سەلبی کز و کەمبرِشت خۆ ڕەپێش دەکات کە کورد وەک میللەتێکی ژێردەست، دۆستێکی خەیاڵکردی دۆڕاند بە تێکچوونی بەرەیەک کە لەسەر ڕووی کاغەز یەکسانیی مافی میللەتانی تۆمار کردووە... خوام حەقە، لە سەردەمی عەبدولکەریم قاسمدا، شایەدی ئەو دیاردەیە بووم کە تەیارەی ڕووسی دەهات بۆ کوتانی پێشمەرگە، برا شیوعییەکان گەش دەبوونەوە، بەڵام کە ناوناوە تەیارەی ئینگلیزی دەهات لە مجێزیان خۆش نەبوو...

بە هەمە حاڵ، مەنتیقی ڕواڵەتی وەها چاوەڕوان دەکات کە «دەوڵەت» بە گۆڕانی ڕژێمی حوکم لایەنی «بەرژەوەند» لەبیر نەکات. بەو پێیە دەبێ ڕووسیا خۆی و وردە دەوڵەتەکانی پێیوە نووسابوون چاو ببڕنە سیاسەتێکی سوودی خۆیانی تێدا ببینن، ئیتر ئازەریەکان، لە نموونەدا، گوێ نەدەنە ورتەورتی ڕەگەزپەرستیی دژی کورد، مادەم لە باری ئێستاکەی هەرای «ناگۆرنۆ کەرباغ»دا یەخەگیری دوژمنێکی مزرۆکە بوون. کەچی ئازەری، کوردی گوتەنی، نەزمێکی دەزانی ئەویش سێ پێیی!! تا ئەوەی تیپی هونەریان هاتبووە بەغدا لە نێوانیاندا خزمەتچیان هەبوو بە دزییەوە کورد بوو، داوای لە

کوردی بەغدا کرد چەند کاسێتێکی کوردی بدەنێ بۆ باوکی کە زۆر تامەزرۆیە بەڵام نەکەن خوازەکەی ئاشکرا بکەن دەنا ئازەرییەکان خراپی بەسەر دەهێنن...

هەرچۆنێک بێت ئێستاکە دوای دەرچوونی مەسەلەی کورد لە قاڵبی بابەتێکی ئینسانی و چۆتە قاڵبی سیاسی نێودەوڵەتان، ڕەفتار و کرداری خۆی و سیاسەتمەدارییەکی لەگەڵ دونیا بەڕێوە دەبات گرنگیەکی نوێی بێ سابیقەی وەرگرتووە کە حیسابی بۆ دەکرێت لەلایەن ئەو هێزانەی دەستیان لە سیاسەتی عالەمی دەڕوات... منداڵبازاڕیی بمرێ خوێنمژ و ئیستیعمار و بژی فریشتەی باڵ ژەنگار و ڕۆحم بە سەدەقەی جۆتیار و کرێکار و مام سۆفی ئاودەلی بە ویقار، ئا ئەم سافیلکانەی ئیفلاسکردوو کە ببنە مەنتیقی وتووێژ لەگەڵ ئەو لایەنە دەسەڵاتدارانەی بە زمانی بوورسە و نەوت و تیجارەت و تەکنیک و قسەی زێدە قەڵەوی سەر بە ژین و مەرگی جیهان، دەست لە چارەنووس و مافی ڕەها و بێگەردی کورد لە بەکارهێنانی خوازی خۆی... و... و... و... هتد بشۆ.

ڕاستییەکەی ئەگەر بە عەقلییەتی بژی برمێ کوردستان ئاوەدان بکرێتەوە هەر خۆی کوردەکە، لە جیاتی ئازەری و ئێران و نازانم کێوە، دەماری خۆی دەردەکێشێت و دەمارەکەش دەکاتە تەقەڵی دروومانی ئەو کفنەی خۆی بە بەری خۆی هەڵبڕیوە... دەڵێن قانون پارێزگاری ئەحمەق ناکات، ئەشەدوبیللا فریشتەش حەقی نییە پەرۆشی بابایەکی هەبێت کە لکەدارێک دەبڕێتەوە خۆی دوو لینگانەی پێدا شۆڕ کردۆتەوە...

دەبێ بزانین لە ڕێی قیاس لە خۆکردنەوە کە چەند بە زەحمەت لەسەر بێگانە دەکەینەوە، ئەو میللەتە پێشکەوتووانەی کە ئێمەش چاومان لە دەستیانە زەحمەتتر دەتوانن یاریدەی کورد بدەن کە بە ئەسڵ بارە لەسەر شانیان و چ سوودێک لە خزمەتکردنیان نابینن، ئەوجا ئەگەر هاتوو مامە

کورد خۆی لە دنیای پێشکەوتوو گێل کرد دەستی کرد بە لووشکە هاوێشتن و گرِوگاڵی ئەحمەقانە... ئا بە خێری خۆت ڕستەکەم بۆ تەواو بکە...

- بەڕێزتان بە یەکەم مامۆستا و ناسراوترین خاوەن سەنگەری تایبەتی دەژمێردرێن کە زۆر زانستانە و بابەتیانە، بە چاوێکی کراوە و پاشخانێکی فرەوانی شارەزاییەوە لە کۆمەڵگای کوردەواری، بیری «ماددی»تان هەڵشێلاوە و بە قەناعەتەوە بەربەرەکانیتان کردووە و ڕەخنەتان لە سیاسەتی پیادەکەرانی ئەو بیرە گرتووە. لە کوردستانێکی تاریکستان و وێرانی وەک ئێستادا ئامۆژگاریت بۆ ناوبراوان بە «چەپی کورد» چییە، کە هێشتا داس و چەکووش ئەستێرەی ئاسمان و ئالایانە؟!

بەر لە چەندین ساڵ وتووێژم لەگەڵ مەلایەکی «زیرەک» و کۆنە شیوعی سەردەمی شەستەکان هەبوو، کە تا ڕادەیەک لە تەوژم و تاوی هەوەڵ جەزبەی گەڕابۆوە و بۆ لای بیروباوەڕی من هاتبۆوە، ئەوە بوو کە پێم گوت نە قسەی من و نە تێشکان و تەجرەبەی تاڵ و دەستی بەتاڵ تەئسیری دەبێ لە کردنەوەی دڵ و هۆشی سۆفییە تەریقەتی شیوعیەت. هەتا لە دیوەخانەی گەورە کە حیزبی بۆڵشەڤیکی ڕووسە فەتوا دەرنەچێ بە هەڵەبوونی هەرِەشە و گورِەشە بۆ سەپاندنی ئیشتراکیەت و شیوعیەت بە زەبری کوتەک... ئەو دەمە جاریێ گلاسنۆست لە پزدانی سالآنی ئایندەدا بوو... سۆفیی تەریقەت بە چاوی خۆی ببینێ، کە بێگومان دیتوویەتی، شێخەکەی بەبەر بێشەرعییەوە نیشتووە زەرڕەیەک لە فێگرتن و کەف پژاندنی دەمی حاڵ لێهاتنی کەم ناکاتەوە، بگرە، لە مەرتەبەی شێخەکە و حورمەتی زیاد دەکات، چونکە مریدەکە لێی یەقینە خوای ئاسمانان ئەوەندە حورمەتی شێخی لایە هیچ بێشەرعیەک بە لابنی پێلاویشیەوە نانووسێت. بیروباوەڕ کە لە دەروونی مرۆدا بوو بە ئایینی نەقشبەستوو، ژووورووی تاقیکردنەوە و هەڵسەنگاندنی هۆشەکی تێهەڵکێشێ، هەر نەبێ دەبێ بایی بتپەرستی و مەیموونپەرستی بۆی تێ

بخوێنێتەوە، چ جایی ئەوەی شیوعیەت پشتئەستوور بووە بە فەلسەفەیەکی پێی گوتراوە ئیشتراکیەتی عیلمی و بە لایەوە لە مادده وەرگیراوە کە «مادده» زەقترین و بەپێزترین و بێگومانترین ڕاستییەکانی جیهانە...

ئەوجا کاریگەرێکی دیکەی نەفسی خۆی ڕەپێش دەکات ئەویش شەرمی ڕیسوابوون و ئیفلاس کردنە. دەزانم مامۆستاکانی شیوعیەت هەر لە زەمانی ستالینەوە دەیانزانی کە حەپسخانە و قەسابخانەی سییەکان و چلەکان کە بە درێژایی خاکی سۆڤێستان مەرگەلی پتر لە دوو سەد ملیۆن ئادەمیزادی باوەش پێدا گرتبوو، دیاردەیەک نییە دزێوییەکەی لە تەنیشت بەهەشتی سوێدەوە لە چاوان نەچەقێ، بەڵام هێندە عەقلیان هەبوو کە هەڵگەڕانەوەیان لەو عەقیدەیە و خوایەتی ستالین ئەگەر نەشیانکاتە قوربانی دەستی ستالینەوە هەرچی سەروەت و دارای و حەسانەوە هەیە لە دەستیان دەچێت و ڕەنگە هەر تێشدا بچن. هەرچی دەروێشی پۆلی یەکەم و دووەمی سەرەتایی و ناوەندییە، بە گوێی مامۆستا، ملی دەنا و مل دەنێت چونکە فەرقی لەگەڵ توتی نییە، بەڵکوو لە ڕێی پەتککردنی هۆش و دەروونیەوە پتر لە «تەربیەلی مەیموون» ملشۆڕ دەکات...

لە نووسینێکی نێوان کۆتایی 1949 و سەرەتای 1950 دا لە بارەی عەقلی بنیادەمەوە گوتوومە:

«وليس قصارى العقل أن يمتنع عن تفسير الأشياء التى لا يفهمها ولكنه يفسرها تفسيرات خاطئة»...

ئەوجا ئەگەر مامۆستای ئەفسووناوی ئەو هۆشەی خەساند و بۆ بیروباوەڕێکی ڕام کرد، دە جاران پتر ئامادە دەبێ بۆ خۆ بە قوربانکردنی هەرچی وڕێنەی سەرەوەبن هەیە چ جای کتێبێکی عیلمی کە جێگەی تەورات و ئینجیل و قورئانی گرتبێتەوە...

شیوعی کورد هەموو ئەو عەیبانەی تێدایە کە لە تێکڕای شیوعی جیهاندا هەیە چونکە لەسەر ساجی عەلییەوە بێ پاشخانی تەئریخی و بێ ژێرخانی

سەردەم و بێ ئومێدێکی دنیایی کوردانە و بێ هەبوونی هیچ هۆیەکی سەقامگیربوونی دیموکراسی و بێ نان و پاتێکی دەڵدەرەوە و بێ هەرچی دارایی و شانازی پێوەکردنە. ئا لەو بیابانە کاکی بە کاکی و وێرانەدا، مێشک ئاخناو بووبێ بە دەرمانێکی فەلسەفیی بە ڕواڵەت عیلمانی و جێی ئومێد و مایەی شانازی (هەر نەبێ لە دالەنگاندنی پایەی ئەو کەسانەی لە خۆی ئیرووترن) کە ئەگەر دەستی لێی ترازا وەک ئەوەیە لە خورگەی ئاودا دەستی لە تەختە داری نقووم نەبوون بترازێ یان بەردی بن پێی لە سەرووی لووتکەی شاخەوە گلۆر بێتەوە، ئاخۆ دەبێ چۆناوچۆنی و کەنگێ و لە کوێ جورئەت بکات ئیفلاسی ماددی و مەعنەوی خۆی بکاتە دروشم بەسەر دارێکی قیت و بەرزەوە... ماڵم حەقە دە جاران و سەد جاران هەر بە حوکمی خەفەخانبوونی هەناسەیەوە هاوار دەکا هۆ گۆرباچۆڤی جاسووسی ئەمریکا... دەرمانی شیوعی کورد لە دەست ئەو کوردە خاوەن دەسەڵاتانە دایە کە بە کردەوە و بە خەباتی ڕۆشن و بە حەساندنەوەی خەڵق و بە داد و دیموکراسی و بە تەبایی و برایەتی گشتی و یەکبوونی دڵ و دەروونی باوەڕی هەموو ئەوانەی کوردپەرستن ئیسپات بکەن کوردایەتی بەدیلێکی بەشەرەفە بۆ هەرچی کوردی بەشەرەفە... لە حاڵوباری ئێستاکەدا ڕەفتاری پێڕەویکارانی مامۆستا عەبدوڵڵا ئۆجەلان هێزێکی بەرهەست دەداتە بزووتنەوەی شیوعی کورد لە هەر شوێنێک بن، هەرچەند بەلای باوەڕی منەوە هەوڵدان بۆ شیوعی کردنی جەماوەری کورد (گریمان هەوڵەکە سەرکەوت) لە ئاکامدا تێشکان دەبێ، چونکە شیوعیەت شتێک نییە هی کەیفە و هەڵبژاردن بێت وەک کە باوەڕی تەجریدی (بێ کردەوە و بەرهەم... ) وەیا زەوقی گۆرانی و مۆدێلی جلک، بگرە ناوی کەس و هەتا دەگاتە ڕەگەزگۆڕی، هەمووی دەشێ بگۆڕێت و کار و بازاڕی گوزەران و بنیاتنان و چاندن و سەفەر و هەموو بارێکی ژیانی کۆمەڵایەتی بەرێیدا بڕوات بەرەو ئەو ئاکامەی پێش گۆڕانی شتە باسکراوەکان بۆی دەڕۆیشت، چونکە مرۆ عەلی بێ یان جۆرج، موسڵمان بێ یان دیان، کورتەک لەبەر بێ یان عەبا، کورد بێ یان عەرەب، عەتابە بچڕێ

یان قۆڕیات، هەڵپەڕێ یان مەلە بکا... باری گوزەران و ژیان و بردنەسەر پەکی پێ ناکەوێ، کەچی بوونە ئیشتراکی یان شیوعی بەندە بە «نمو»، ئەوجا هەروەک منداڵی 10 ساڵی ناتوانێ گەنجی 18 ساڵی بێت، میللەتێکی وەک کوردیش کە لە پلەی سەرمایەداریدا بەرەو ژوورنەچووبێ لەڕێی بەرەژوورچوونی ژێرخان و ژوورخانی ماددی و شارستانەتی ناتوانێ بەرهەمهێنانی تایبەت بە تاک بگۆڕێ بەشکڵی کۆمەکی. کە هاتیت تاک و خێزانی کوردی ئەم سەردەمەت مەنع کرد لە کاری گوزەرانی سەربەخۆ و خستە جغزی شێوە ئسووڵی شیوعییەوە، نازانیت چ لەو خەڵقە دەقەومێ، چونکە هیچی ئەوتۆت نییە لە وەسیلەی گوزەران 100 کەس و 1000 کەس بەخۆیەوە بگرێت و لەوانەش بێت هەموو کەسەکان بێ تەفرەدان و قەمچیکاری کۆمەکی بکەن وەک کە تاک بۆ خۆی دەکات...

لە سییەکاندا مەعاشی کرێکارەکانی فابریقەی «فۆرد»ی ئەمریکا 700 ملیۆن دیناری ساڵانە بوو کە دەیکرد 35 هێندەی بودجەی حکومەتێکی ئەوسای عێراق. ئەوجا عەمەلەکان خەیاڵیشیان نەدەکرد دەست بەسەر فابریقەکاندا بگرن... شارێکی وەکوو هەولێر کە دانیشتووانی گەیشتوونەتە ملیۆن بە هەمووی هەزار عەمەلەی پرۆلیتاری قابیلی ڕێکخستن و دەرسدانی شیوعیەتیان تێدا پەیدا نابێ، ئەوجا ئەگەر سوڵتەی حوکم نەبێتە شیوعی، ئەو عەمەلانە هەر ناکەن هیچ... باوەڕ دەکەم لەپلەی وا بەرەژێر شارستانی کە هەولێر و کوردی تێدا دەژیت ئەگەر هەمووی، خەڵقەکە و بزن و مەڕەکە و مریشک و قەلەموونەکە و دار و بەردەکەی یەک دەنگ بڵێن بژی شیوعی هەر فایدەی نییە.

ژیانی سەردەم لە وڵاتی پێشکەوتوو گەیشتۆتە ڕادەیەک لە ڕێی کۆمپیوتەرەوە هەر مەعلووماتێک گەرەک بێ لە ماوەی چەند دەقیقەیەکدا دەتگاتێ ئەوجا هەست ناکەن ئوسلووبی ئابووری ئازاد بگۆڕن بە ئسلووبی گرێدراو... خوڵاسە قسەکردن لە بارەی گۆڕینی وڵاتی دواکەوتووی 5000 ساڵی بۆ سەر نیزامی ئیشتراکی وەیان شیوعی خەیاڵپلاوەش نییە، چونکە خەیاڵ قوزەڵقورتە...

نەڕەنەڕی چەند زمان هەراش و حەز و شەهوەتی چەند نەفسبرسی و سۆفیگەریی خەیاڵبازان بابێن لە هەولێر وەیان سلێمانی یەک یانەی سەر بە فرۆکەوانان دابنێن... نازانم چۆناوچۆنی قورە خەیاڵی خۆ شیوعی کردن لەو شوێنەدا دابنێم کە لایەق بێ بە کوردێکی گومڕاو و سەرلێشێواو و وڕ و دەبەنگ بیری لێدەکاتەوە.

من دەزانم و لێم سوورە ڕۆژەک دێت، ئەگەر مرۆ خۆی نەبڕێنیتەوە، جۆری ژیان وەها سەرەژوور دەچێت کە ڕێژیمی یەکسانی لەخۆیەوە خۆی بەسەر کۆمەڵدا دەسەپێنی و کەس تاقەتی نامێنی مشوری بەڕێوەبردنی ڤێللای تاک و ئۆتۆمبیلی تاک و... تاک... و تاک بخوات، بەڵام ئەو ڕۆژە نە لەڕێی شیوعییەتی بە زەبری کوتەک دێت و نە جارێ میللەتی وەک کورد مافی ئەوەی هەیە وەختی خۆی لەو ئەنجامە دوورە دەستەدا بەفیڕۆ بدات. هێشتانی بەهەشتی موژدەدراوی دینە ئاسمانییەکان بنەمای پتەوتریان هەیە بۆ ئەو ئومێدە، چونکە بەهەشت بە لای دیندارەوە بەندە بە ئیرادەی کردگار نەک ئامۆژگاری و ڕێنموویی مرۆی فانی... خولاسە لە جیاتی ئامۆژگاریکردنی بێسوودی شیوعی کورد، دەبێ ئامۆژگاری کاربەدەستان و تێهەڵسووڕێنان و ڕۆشنبیران و، ئەگەر مومکین بێ، هی هەموو خەڵقی ناشیوعی بکرێ کە نموونەی ڕەفتار وکردار و گفتاری خاوێن بن. خۆ ئەگەر ئەو تاقمانە وەها نەکەن بە ناچاری خەڵق گوێ بۆ ئەو کەسانە ڕادەهێڵن کە لە زەمیینەی بێمەسئوولییەتی و پەندی «خەنجەر لە کا»وە قسەی لووس و لیک و شیرین و چەور و ئومێدبەخش شەکری کەلامیان دەبێت.

- بە مێژوو... هەستی نەتەوایەتی لەسەر دەستی کێدا بە پلەی یەکەم لە کوردستاندا سەری هەڵداوە؟

لەبارەی کەسێک و لایەنێکی هەوەڵ جار هەستی کوردایەتیی لە کوردستاندا بزاوتبێ. وەک من بزانم پاش ئەحمەدی خانی و شەرەفخانی بەدلیسی کە بە

نووسین لەبارەی کوردەوە دواون بێ ئەوەی لە زەمانی خۆیاندا دەنگی دابێتەوە، هەوەڵ جار لە سەردەمی حاکمایەتی عەبدولڕەحمان پاشای باباندا، بەر لە دوو سەدو هێندە ساڵەدا بووە بە هێزێکی ورووژێن. بەڵگەش بۆ ئەم ڕاستییە زۆرن، یەکێک لەوانە قسە مەشوورەکەی خۆی کە داوای لێکراوە بکرێتە والی بەغدا، وتبوی قومە ئاوێکی کوردستان بە بەغدا ناگۆڕمەوە... بەڵگەی تر بەیتی عەلی بەردەشانییە کە خۆی لە حاشییەی عەبدولڕەحمان پاشادا بووە: بەیتەکەی ئاگرپژێنێکی کوردایەتییە... لە کۆتایی یەک لە بەشەکانی کتێبی حاجی قادری کۆیی ئەو بەیتەم تۆمار کردووە... بەڵگەی سێیەم وا ئێستاکە کە ئەم دێڕانە دەنووسم لەبەر دەستمدایە بریتییە لە وەقفنامەی کتێبی (صحيح البخاري) لەلایەن عەبدولڕەحمان پاشاوە بۆ عەبدولڕەحمانی کاکی جەلی، کە باوکی باپیری باپیرمە. وا لێرەدا چەند دێڕێکی ئەو وەقفنامەیە دەنووسمەوە کە پێوەندی بە گیانی کوردایەتیی پاشای بابانەوە هەیە. دوای پێشەکییەکی شەش دێڕی دەنووسێت:

«فها أنا قد وقفت ذلك الكتاب وقفا صحيحا شرعيا على العالم الرباني والعارف الصمداني ملا عبدالرحمن الجلي ثم على اولاده الذكور الأفقة فالأفقة ماتناسلوا بطنا بعد بطن ثم على أولاد اخوته الأعلم فالأعلم ماتوالدوا، ثم على عشيرته الأعلمين ثم على العلماء الذين كانوا في ناحية كردستان من الموصل الى بغداد وسنندج وجعلت ثوابه... »

ڕۆژمێژووی لێبوونەوەی کاتب لە نووسینەوەی کتێبەکە دەوەستێتە ساڵی 1211 ی کۆچی کە بەرانبەرە لەگەڵ 1796- 1797 ی زایینی واتە بەر لە 197-198 ساڵێک... من لە نووسینی خۆمدا (کە لەسەر حاجی قادرم دەنووسی) گوتومە ئەم ساڵە 8-9 ساڵ دەکەوێتە دوای شۆڕشی فەڕەنسە، دوور نابینم پاشای بابان وێرای هەستیاری خۆی، سروشتی ئەو شۆڕشە بەتەواوی خستبێتە سەر ڕارەوەی قەومایەتی. ئەمە دەڵێم ناشزانم بەیتەکەی

بەردەشانی چ ساڵێک گوتراوە، ئایا بەر لەو ساڵەی وەقفنامەکەیە، ئەگەر بەر لەویانە ئایا دەکەوێتە بەرایی شۆڕشی فەڕەنسە یان لە جغزی ئەو 8 – 9 ساڵەدا دەمێنێتەوە... ئەگەر بەرایی بێت دیارە پاشای بابان قەرزاری شۆڕشی فەڕەنسە نابێت...

پێویستە بشڵێم مەلای ئیبنوئادەم لە لاپەڕەیەکی یەک لە کتێبە دەسخەتەکانی خۆی هەر بە خەتی خۆی نووسیویەتی لە وڵزە «از قرای کردستان» بووە لەلایەن شێخی نودێ کە لە مەرکەزی«سلطنة کردستان» دانیشتووە، کاغەزی پرسیارێکی عیلمیی بۆ هاتووە، ئەمەشی لە 1205 نووسیوە کە دەکەوێتە بەرانبەر 1790– 1791 ی زایینی پاش شۆڕشی فەڕەنسە بە ساڵێک یان دووان، هەرچەندە مەلای وڵزە لەوانە نەبووە دەنگوسەدای فەڕەنسەی بەخێرایی پێ گەیشتبێت، وەک کە پاشای بابان ئاگاداری ڕووداوی دوور و نزیک بووە... لەوە خۆشتریش هەر لە پەراوێزی سەرووی ئەو لاپەڕەیەدا دوای دوو ساڵ بە عەرەبی نووسیویەتی:

«ومن عجب انه قد شنع علي بأن الديباجة كردية وقد صدق بذلك عليهم المثل السائر هم كالبيضة خرجت من قشرها... »

ئەم دەقە عەرەبییە لەوانەیە کەموکووڕیەکی هەبێ بەڵام واتا گۆڕینی تێدانییە، مەبەستمە بڵێم ڕەنگە من وشەیەک وەیا داڕشتنێکم لەبیر نەمابێ وەک کە کاتی خۆی دیتوومە... مەلای ئیبنوئادەم سێ دێڕە شیعریشی وەپاڵ دەدرێت دوای تێکچوونی حوکمی پاشای کۆرە گوتبێتی، ئەمە دەقیانە:

هەوران کردە گۆڵەگۆڵ میکائیلا ئەتۆش دەی
تووتن و ماشان بڕشێنە دەبا نۆش بێتە سەر دەی
ڕۆمی ئەوا پەیا بوون کوتوبخانان دەکەن طەی

دیاره ڕۆمی، که مەبەس لێیان تورکی عوسمانلییە، بەلای ئیبنوئادەمەوە ئەوە نین لەڕێی بەرەکەتی خیلافەتەوە چاو لە عەیبیان بپۆشرێت...

سالمی صاحێبقڕان لە پاش تێکچوونی ئیمارەتی بابان کەوتە سەر شیوەن کردن بۆ کارەساتەکە بەڵام نەگەیشتە جغزی شیوەن بۆ کوردستان، کە ڕەواندزیش زەدە بوو بەر لە چەند ساڵێک هیچی تێدا نەگوت... یەکەم کەسی کە پاتەوپات و بێ تەئویل و کۆمەکردن کوردایەتی کردبێ بە زمان و قەڵەم حاجی قادری کۆیی بووە، ئەویش لە تەمەنێکی دوای ئاوارەبوونی کە بەڕای من لە 1280 بۆی دەرچووە...

دەبێ بشزانین، حاجی قادر دوای ئاوارەبوونی و لە دەورووبەرێکی پێشکەوتووتر لە کۆیە و کوردستانی ئێران کە دەوری 7– 8 ساڵانی تێدا بە فەقێیەتی ڕابوارد، مەیلە حەقپەرستانەکەی گێڕایە سەر باری کوردایەتی، ئەوساش کە بەدرخانییەکان کە پەنا و نوای ئەو و نازڕاگرتنی بوون هۆشی کوردایەتیان کرابۆوە. پێشتریش لە ناوەندەکانی چەرخی نۆزدەیەم لە حکوومەت هەڵگەڕابوونەوە، سورەییا بەدرخان لە کۆتاییەکانی ئەو چەرخەدا ڕۆژنامەی کوردستانی لە قاهیرە بە کوردی بڵاودەکردەوە، لە دانەیەکی ئەو ڕۆژنامەیەدا کە لە ساڵی 1898 دەنووسێ ساڵێکە حاجی قادر وەفاتی کردووە مێژووی مەرگی زانرا. 1897 دەوەستێتە بەرانبەر 1314– 1315 ی کۆچی کە بەلای لێکدانەوەی من (کەسێکی تر لێکدانەوەی ئەوتۆیی کە من لە بارەی قادرەوەم کردووە، نەیکردووە)، دەوری 34– 35 ساڵ بووە حاجی چووەتە ئەستەنبووڵ، دیارە تا ساڵی مەرگی سێیەکە چەرخێک تێپەڕی کردووە بەسەر خەستبوونەوەی فکری بۆ کوردایەتی. بەیتێکی هەیە مەدحی یەکێکی بەدرخانی دەکات کە دەڵێ وەک ناوەکەی شێرە، دیارە مەبەستی یەزدانشێرە کە حیکایەتی ئەویش هەویرێکی ئاوخوازەو بەکێشەیە... لەم شەرحەی بێسەرچاوە (من یەک دانەی سێ بەرگەکەی حاجی قادرم لا نییە، هەرچی هەمبوو لەسەر داخوازی کوردی ئەورووپا و شوێنی دیکە بوون بە دیاری) کە

بنەمایان لە مێشکمدا پارێزراوە خۆت بڕیار بدە لەسەر باوەڕێکی خۆت پەسەندی دەکەیت ببێتە وەرامی پرسیارەکەت (وەرام، وەڵام یەک شتن و دروستن).

- دەکرێت بنەما سەرەکییەکانی بیری نەتەوایەتی/ کوردایەتیمان پێ بڵێن؟

لە بنەما سەرەکییەکانی بیری نەتەوایەتی کوردایەتیەوە، ئەوەی لە ئاست ئەو بنەمایانەوە بۆی چوویت وەک: مێژوو، زمان و نیشتیمان و هەستی ئابووریی هاوبەش و داب و نەریت... هەمووی بیری خوازرایەوەیە لە مێشکی فلان لایەن و فیسار بیریارەوە هەڵقولاوە، پتریش سیاسەت داوای کردووە، خۆ ئەگەر تاکە یەک وشەی ئەم جۆرە بابەتە لە کەسەوە نەبیسرابایە ئەو گەلانەی گەلن، چ گەورە چ گچکە، چ تاک عەشیرەتی پاشماوەی کۆنە نەتەوەیەک، هەر دەبوون و دەمانەوە بە گەل و نەتەوە، هێندە هەیە گەلی خاوەن حکومەت (کیان) بە شێوەیەکی خەستتر لە گەلی بێحکومەت بیر لە «گەلایەتی»ی خۆی بکاتەوە، چونکە ئەرک و سوودی ئەو کیان و حکومەتە هەمیشە بە زیندوویی لەبەر هەست و هۆش و چاویدایە و گوێی لێیە. کوردێکی بێحکومەت لە ئەڕزەڕۆمەوە ناوی سەردەشتی نەبیستبێ چۆناوچۆنی هەستی مەفتەندۆستی خۆی بەرینتر بکاتەوە بۆ شوێنێک کە نەزانێ کوردزمانە و ناویشی نەبیستووە. لەگەڵ ئەمەشدا هێندە هەرێمەی کابرایەکی نەخوێندوو دەزانێ کوردی تێدا دەژیت بەسە بۆ ئەوەی هەستی نەتەوایەتی تێدا بەخەبەر بێت، ئەوساش لێی داواناکرێ هەستی نەتەوایەتی لە زەمانێکدا بەخەبەر بێت کە جارێ لای نەتەوەی تێروتەسەلیش نەڕسکاوە. تۆ بڵێی وڵاتێکی بەرینی وەکوو کۆنە فارس و عەرەبی دوای غەلەبەی ئیسلام کە دەیان «طوائف الملوک» ی سەربەخۆی تێدا پەیدابوو ئایا لە نەتەوایەتی و مافەکانی بێبەش دەبوو هەر چونکە بڕبڕ بووە؟

بەڵێ من لە گۆشەی حەقیقەتی ڕووتەوە گوتوومە هەتا گەلێک کیانی سیاسی، واتە: حکوومەتی، نەبێ جارێ لە پزدانی مێژوودایە نەبۆتە منداڵی تازەزاو،

بەڵام ئەم ڕاستییە مافی وەدەستهێنانی یەکیەتی مەفتەن و نەتەوە ڕەش ناکاتەوە وەک کە منداڵی ناوپزدانی دایکیش مافە سەلمێندراوەکانی ڕەش نابنەوە، کەسیش نازانێ ئەو منداڵە مردەزاد دەبێ یا بە زیندوویی!!

دڵی خۆت بە کۆڵەگە و مۆڵەگەوە[1] مەبەستەوە بۆ ڕاگرتنی قەدی لەرزۆکی میللەتەکەت. میللەت هەیە و دەبێ ببێت و بژیت و ئیرادەشی لەسەر ژینە هەرچەند بە ناشارەزاییش بۆی بخەبتێت و هەڵە و گومڕایی نافرەجاش لە هەناویدا بزێتەوە. پیاوکوژی تاوانبار دوای بەندیخانە ڕێی ژینی لێ ناگیرێت. شێت کە هۆشێکی خۆژینی نییە بە ئەستۆی میللەتەوە دەبێتە ئەمانەت و لێی خەرج دەکرێت. لێرەدا دەبێ ڕاستییەکی ناقۆڵا دەرببڕم، مرۆڤ بە شێوەیەکی گشتی، هەتا ئێستاش، لە قۆناغێکدایە هەر دەڵێی مەیموونە کە دەکەوێتە نێوان جانەوەری لە خۆی بەرەژێرتر و نێوان مرۆڤەوە، چونکە جارێ مرۆڤیش لە نێوان حاڵی ئێستاکەیدا کە پڕە لە شەوکوێری و دڕندەیی و خۆکوژی تا حاڵەتێکی لە مرۆڤ دەوەشێتەوە و نموونەی بەرچاویشی هەیە لە دەوڵەتی وەک سوێد و دانمارک، واتە ئەوەی پێی دەڵێن نەتەوەی دواکەوتوو و هەموو ئەو تاک و تاقمانەی خەریکی دڕی و شڕی و سەگپەرستی و تاکپەرستی و عیفریتپەرستین، لەم ڕۆژگارەدا دەکەونە نێوان مرۆڤی عادەتی و مەیموونەوە، دادمان نادات و بە هانای کەس ڕاناگات.

هەڵبەت دەزانم مرۆڤی دواکەوتوو حەوجەی بە ملیۆن ساڵ نییە تێیدا بگات بە پلەی مرۆڤایەتی دروست کە مەیموون لەوانەیە بە ملیۆن ساڵیش سەرەتای هۆشپژانی لێ بەدەرنەکەوێت، بەڵام دەبێ بزانین، هەروەک بەرەوپێشبوونەوەی مرۆڤ لەچاو هی مەیموون یەکجار خێرایە، هەروەهاش زەرەر لێ کەوتنی کوشندە کە دەشێ کەلێنی پڕ نەبێتەوە، خیرا و بەسفتوسۆیە، وەک ئەوە کە کەرتێکی وڵاتی لەدەست دا بۆی ناخرێتەوە سەر شڕە خەریتەی قوت و لێقرتاوی وڵاتەکەیەوە. لە «هێمن»م زانی دەیگوت ئەولیا چەلەبی لە گەشتەکەیدا جێگەی ئەوتۆ بە کورد دادەنێت ئێستا 100

کیلۆمەتر لە خاکی کوەردنشین دوورە... هەمەدان پێتەختی باپیرە گەورەی کورد بوو.

ستالین پێناسەیەکی دەرکرد بۆ دانهێنان بە هەبوونی «نەتەوە، گەل»، یەک لە مەرجەکانی نیشتمانێکی سەرلەبەر بوو. برا چەپڕۆیە کوردەکانی عێراق سیپارەیەکیان دەرکرد لەبەر تیشکی ستالین پێغەمبەر و بڕیاریان دا لەسەر هێندێ کە کورد «أمة» نییە گۆیا وڵاتی برِبرِ بووە. ئەوسا دەمگوت: خۆ هەر کەرتە بە تەنها سەرلەبەرە و کوردنشینە، هەر کەرتەشی چەند جار لە لۆکسۆمبۆرگ بەرینترە و خاوەن نفووسترە، ئیتر بۆ دەبێ فەتوا لە مەلا و شێخی سیاسەت وەرگرێ تا بە ئوممەت بژمێردرێت؟

ڕاستییەکەی هەبوونی گەل خۆی بەتەنها بەسە، بگرە زیادیشە لە هەرچی مەرجێکی بۆ دانپێداهێنانی ڕەچاوبکرێت. کەس نەهات مەرج دانێت بۆ دانهێنان بە کەسایەتیی تاک وەک شەهادەی پزیشکی وەیا برۆی کەوانەیی وەیا دارایی پارە و ملک، تەنانەت، بە زۆری، بەر لە هەزار و دوو هەزارساڵیش عەبد خۆی و کەسایەتی و مافەکانی چاوەدێری دەکرا.

تاکە سیفەتی هەرە هەرە بنەڕەتی بۆ دانهێنان بە هەبوونی نەتەوە ئەوەیە کە ئاخێوەری زمانێک بێت تایبەت بەخۆی و تا ئەوەی دەتوانین بڵێین لە ماوەی هەزار ساڵدا دەشێ نەتەوەیەک هەموو دانیشتووە ئەسڵییەکانی لە نیشتمانەکەی خۆی وردە وردە، کۆچیان کردبێ بۆ وڵاتانی تر خەڵقی دیکەش وردە وردە لەو هەزار ساڵەدا بێ مەبەست و بەشێوەیەکی هەستپێنەکراو خزابێتە نێو ئەو نیشتمانە و زمانی خۆی لەبیر کردبێت بووبێتە ئاخێوەری زمانی خەڵقەکەی، ئیتر تورک و عەرەب بووبنە کورد یاخود کورد و فارس بووبنە عەرەب، خۆ دانیشتووانی ئەمەریکا بە تایبەتی ایم ایم ش هەرِەمەیەکە وەک چێشتی حەفت ترینگە، ئەگەر سەقافەتی هاوچوون و زمانی ئینگلیزییان لێ بستێنیتەوە دەبنە سەت کەرت و پتریش، هەرچەند جارێ لەبەر تازەیی تەجرەبەکان هەر تاقمە، بە تایبەتی ئەوانەی لەم سەدەیەدا تێی خزاون، کەم

زۆر دروشمی ئەسڵە ڕەچەڵەکیان پێوە دیارە، بەڵام زمانی ئینگلیزی بۆتە پێناسایان و دارێژەری کەسایەتییان، تەنانەت هیندی سووریش کە خاوەنی ئەسڵە وڵاتەکە بووبوونە مێوانی سەقافەت و زمانی ئینگلیزی.

سەیرێکی مێژووی عەرەب بکەیت دەبینی لە ئاکامی فتوحاتی ئیسلام، هەر نەتەوەیەکی زمانەکەی لە خێزانی سامی بووبێت لە ئاکامدا بوو بە عەرەب، کەچی فارس و کورد و تورک و ئەفغان و بەلووچ و نازانم کێ و کێ نەیانتوانی زمانەکەیان بهێننە سەر قاڵبی عەرەبی و بڵێن «یضلل الله». فەقێیەک لە مزگەوتی کۆیێ چەندی کردی نەیتوانی فێربێ بڵێ: «مثلا میثالێکت بۆ بهێنمەوە لە أمثلەی مختلفە» سوور بوو لەسەر هێندێ کە دەیگوت «ئەسەلە سەرە پەسیرەیەکت بۆ بهێنمەوە... » بێگومان عەرەبیش هەتا نەکەوێتە ناو کۆمەڵگەیەکی کوردزمان و ڕۆژگارێکی بەسەردا تێنەپەڕێت ناتوانێ بڵێ «هەڵەت و پەڵەتی زینگزینگەوە و تەکەڵتوو» کە ناوی دوو گوندی کوردن... هەروەهاش حاڵ و باری سەراپای نەتەوەن.

هەستی خۆ بە کورد زانین، بە عەرەب زانین، بە هیندۆک زانین، ئەگەر هیچ باری دەگمەن، نا مەئلووف سواری خوایشت و تەبیات و مجێزیان نەبێت، وەک خۆ بە خزم زانین لەگەڵ ئامۆزا و پوور و خوارزا... هتد... هەتا هەڕەشەیەک لە ناخزمەوە نەیەت لە خۆوە بێ مەبەست بەخەبەر نایەت کە دەزانین لە حاڵی ئاساییدا خزم و خزمیش دەبن بە ناحەزی یەکتر. بە گشتی دەتوانین بڵێین لەوەتەی ڕەگەزپەرستی بە جۆرێکی بەرنامەیی و پلانکاری خۆی بەسەر سیاسەتی دەوڵەتاندا سەپاندووە، هەتا دەوڵەتیش دواکەوتووتر بێ لە ڕەگەزپەرستیشدا دڕتر دەبێ، هەستی دارووشاوی ڕەگەزی ژێردەست تیژ بۆتەوە.

بەراوردییەک بکەیت لە نێوان فەلسەفەی سەر بە کوردایەتییەوە لای خانی و شەرەفخانی بەدلیسی و حاجی قادری سەرەتای خوێندنی لە ئێران و حاجی قادری دوا پلەی ژیانی لە ئەستەنبووڵ دەبینیت خانی لە زانایی و هەستیاریی

خۆیەوە پەرۆش دەخوات لە نەبوونی حکوومەتێکی کورد و نارەوایی حاڵەتی ئەوتۆیی، لەوەشدا نەکەوتە سەر باری پلاندانان بۆ پێکهێنانی دەوڵەت بەڵام هەمدیسان بە قۆناغ پێش ڕۆژگاری خۆی کەوتبۆوە. بەدلیسی لە ڕوانگەی مەسڵەحەت و دژوەستانی بەرانبەر شیعەگەری هەوڵێکی دا... حاجی قادر لە دیوی کوردستانی ئێران هەستی سوننیگەریی و دژەشیعەیی کە لە تەعەسسوبی قاجارەکانەوە سواری هەستی دەبوو، قەڵەمەکەی دەبزاوت، هەستەکەشی لەگەڵیدا ژیا تا ئەوەی تۆمەتی بێژووەتی دەهێنێتە ناو هەڵبەستی لە ڕێی «متعه»وە کە بەلای سوننەوە حەرامە (سەیری دیوانی بکە). بەسەر حاشیەی کتێبی سیوطی، چاپی ئێران، ئەم دوو بەیتە دەنووسێ، کاتێک لە کوردستانی ئێران دەیخوێند:

یا ڕەب بەقەدەر حەرفی سیوطی یەک یەک
ڕەحمەت لە « مصنف» و لە قاری بێ گەلەک

ئەمما عەجەم و ئەو کەسە چاپی دانا
بیباتە جەهەننەم بە عەذاب و بە کوتەک

دواتر لە ئەستەنبووڵ کەوتە سەر فکری کوردایەتی بەو شکڵەی وەها ئاشفتە کە دەیزانیت.

لێرەدا دیاردەیەک خۆی ڕەپێش دەکات، نەتەوەیەکی ژێردەست بێت پتر لە نەتەوەی دەسەڵاتدار هەست بە تامەزرۆیی دەکات بۆ خۆهەڵدانەوە چونکە هەر ئەو دەرمانەی خۆمەدحکردنی هەیە کەموکووڕی خۆراک و پۆشاک و شەکرەمەنی و سووتەمەنی و تفەنگەمەنی و تەیارەمەنی و هەموو شتەمەنی پێ پڕبکاتەوە وەک ئەوەی هەژار پتر بەخۆیدا دەشکێتەوە پێڵاوی دڕاوی لەپێدا بێت، تا پیاوی دەوڵەمەند کە بێ پێڵاویش سمێڵەخنکەی دێتێ. فارسەکان چونکە پشتئەستوورن بە حکوومەتی کۆن و نوێیانەوە چەندی پێیان بکرێ

وشەی عەرەبی بە ئارایشت دەخەنە نووسین و ئاخافتنیانەوە. هەروەهاش هیندی وەک لە فیلم دەیبینم تێوەرێخی ئینگلیزی دەترنجێنێتە قسەکانیەوە.

بڕواهێنان بە مرۆڤ و دووربوون لە ئیلحاد و پێداوستیی ئابووریەکی هەمەگیر[٢]... ئەمانە هیچیان لە ناوەڕۆکی «نەتەوە» نین و هەر یەکە لە بوارێکەوە تین و تاو بۆ مرۆڤ دەهێنێ... میللەتەها هەبووە و هەیە باوەڕی بەو خوایە نییە کە تۆ باوەڕیت پێی هەیە... زانای گەورە گەورە هەن کە مولحیدن، خوانەناسن، هی وەهاشیان هەیە کە خواناسن بەڵام ژینەوەی دوای مردن ناچێتە قەناعەتیانەوە. ئابووری شتێک نییە بیکەیت بە گرێبەندی بیروباوەڕی نەتەوایەتی موشتەرەک، مرۆش وەک چوێلەکە و کەروێشک و فیل بێ فەلسەفە خەریک دەبێت بژیت و بزێت، لە حاڵەتی دینداریەکی خەستدا ماڵی دنیا بە قوربانی حەج دەکات و گیانیشی دەخاتە تەهلوکەوە بۆ شکۆ و پەرەسەندنی ئایینەکەی و هەر لەو بوارەدا دڕدۆنگی لەگەڵ هاونیشتمانی خۆیدا دەکات بۆ خاتری حوکمدارێکی بێگانە کە خۆی بە لای دڵیدا دزیبێتەوە. ئابووری عەقیدە و بڕوا نییە کە نوێژی بۆ دەکرێت یاخود بەستە و چەپڵەڕێزانی بۆ دەگێڕدرێت...

بژێوی، زایەند، هەندێ نەخۆشی زگماک، بێ مامۆستا و خۆهێنان و بردن هاوتەمەنی هەرە کۆنی مرۆڤن. بیروباوەڕ کە چەسپا لە هەموو هاندەرێک تەوژمی پتر دەبێت. دین و ئایدیۆلۆژی و ئابووری وەک هەویری ئاوخواز زۆریان بەبەرەوە هەیە باسیان لێوە بکرێت. بە کورتی و بە کرمانجی هەریەک لەمانە دەشێ خۆی بکاتە لەمپەڕ لە پێش هەنگاوی نەتەوەپارێزیی ڕاست و دروست. هەر سێ بابەت هەڵدەگرن ببن بە وشکە باوەڕ و پێوەندیان بە بەرژەوەندی ڕەوای گەلەوە نەمێنێ. لێرەدا دەبێ تێبینی بکرێت کە تێکهاویشتنی بیروباوەڕی لێکترجودا لەنێوان نەتەوەیەکی خاوەن کیان و سنووری دەستنیشان و شەرعیەتی نێودەوڵەتان ئەو زەرەری لێ نادات کە لە میللەتێکی بێ کیان و بێ سنووری دەستنیشان و لە قۆناغی خۆرزگارکردن دەدات وەک میللەتی کورد و بەلووچ... عەرەب دەڵێ «ثبت العرش ثم

انقش» واتە: کورسی سەڵتەنەت بچەسپێنە ئەوجا بینەخشێنە، نەخشاندنیش پاش چەسپاندن ناشێ بە زەبری کوتەک و خنکاندن و سووتاندن بێت. لە دەمی ئاسایشدا خەباتی دێمۆکراتانە تەنها ڕێگەیەکە خێروخۆشیی پێوەبێت. ئەمانە حەقیقەتی سادە و بەدیهین، کەسێکی گوێیان نەداتێ یان سافیلکەیە و ساواتەبیاتە و حەز لە تۆپانێی خوێناوی دەکات یاخود بە نیازێکی نهێنی نارەواوە خۆی لێ بە سەهوو دەبات، ئیتر کە دەستی بوو، بێ ئەوەی کە هەموو جاران ئاگادار بێت چ زوڵمێک لە خەڵق دەکات، هەر بە زەبری کوتەک ئاپۆرەی گەل دەخەسێنێ تا ئەوەی لە واقیعدا دەبێتە جەللادی بێ ڕەزای پشتشکێنی هەناسەبڕ و سەد خۆزی بە کفندز...

بە مەرج گرتنی ئابووری هەمەگیر و سەرلەبەری نەتەوە بۆ دانهێنان بە هەبوونی نەتەوە تەپکەیەک دەبێ لە حاڵەتی میللەتی وەک کورد و بەلووچ، ڕێ نادات هەرگیز ببن بە حکوومەت چونکە نەبوونی مەرجی ئابووری هەمەگیر مافی داواکردنی کیان و یەکیەتی و حکووماتیان لێ مەنع دەکات، کە حکوومەتیش نەبێ ئابووری هەمەگیر پەیدا نابێت ئیتر کورد گوتەنی: هەردوو سەری بەیاز و قەپات...

ئەم مەرجە مەنتیق بەرەواژ دەکاتەوە، واتە بۆ دەوڵەتی زاڵم و داگیرکەر دەبێتە بەهانەی نەسەلماندنی یەکبوونی نەتەوە، بەڵکەبوونی نەتەوە قەدەغە دەکات. تاران دەتوانێ بڵێ، مادام ئابووری سابڵاغ پێوەندی بە دیاربەکرەوە نییە، هەولێریش ئاگای لە کرمانشان نییە، ئیتر فڵتەفڵتی مافی نەتەوایەتی لە کوێوە سەر هەڵدەدات، بەو جۆرە کوردی کڵاشخوار لە کوێوە بەرەو خەونی «حکوومەتی کوردی»یەوە دەچێت، هەر ئەم بەڵگەیەش بوو نامیلکەی تاوانباری «کورد ئوممەت نییە» کردبوویە قورئانی کوردخنکێن، وەک پێشتر باسکرا. ئەوجا ئەگەر مەنتیقەکەی من ڕووبەڕووی ئەو منداڵبازاڕییە بکرێتەوە، هەر بە حوکمی ئەو بۆچوونە هەڵە و تاوانبارە کورد مافی دامەزراندنی سێ دەوڵەتی دەبێت کە بێین هەر پارچەیەکی کوردستانی لەتکراو بە نیشتمانێکی سەربەخۆ حیساب بکەین.

بەڵام داخم ناچێ مەیلی بیژۆکی گومڕایی هەرگیز بە لای چاکەی ڕەوادا نابێتەوە و فەرموودەی ستالین، کە لە قەبرەکەشیان دەرهێنا، دژی کورد هەر کاریگەر دەبێت، ناشبێ سەیر لەم قسەیەم بێتەوە چونکە دوای، کورد ئوممەت نییە، بە ساڵەهای ساڵ گەنجی کوردی ئەورووپادیدە فەلسەفەی خزم بەو کوێرییەی بڵاوکردەوە کە دەبێ بورژوازیەتی دروست بکەین و بیرمێنین هەتا بیروڕای مارکس لەبارەی قۆناغە مێژووییەکانی ئادەمیزاد لە کورددا بەڕاست بگەڕێ. کاکم ژوورێکی خودی خۆی نەبوو تێیدا ستار بێت خەریک بوو فابریقەی ئاتۆم و تەیارەخانەی جێت لە عەبابەیلێ دروست بکات - ئەی یاری عەزیزم بەخودا هەڵخەڵەتاوی! کە هەر دروستی دەکەیت بۆچی دەیرمێنیت؟ چاکتر ئەوە نەبوو لە سەرەتاوە هی چاکتر دروست بکەیت بێ ڕماندن؟ خۆ هەمووی هەر خەیاڵکردە.

مەودا بەرینە لەپێش ئەم ڕچەیەی نووسین لەسەر «نەتەوە»، لێی بە کۆتایی ناگەین. پێناسەی هەموو میللەتێک دەبێ وەک هی دراوسێکەی و هی هەرە دووریش بێت، ڕاستییەکەی ئەگەر مەیلی تەڕدەماغی فەلسەفی نەبێ ئەم مەسەلەیە هی دەمەتەقێ نییە، ڕۆژێکیش دێت مرۆڤ شەرم دایدەگرێت بەدیهییەی وەها ئاشکرا و ڕوون بکوتێتەوە. چی گرنگە لێرەدا ئەوەیە، نەتەوەی ژێر دەست خەریکی خۆڕزگارکردن بێت بە شێوەیەکی عاقڵانە، دوور لە عاتیفە و دوور لە دەمارکشتی و بە تەبایی و ڕەبایی هەموو لایەک و بێ شەڕی چینایەتی و دینایەتی و ئەو جۆرە حیسابەی بێوەخت و ناجۆر. کورد وەکوو سپایەک لە خەندەقی جەنگکردن لەگەڵ دوژمندا، دوژمنەکەشی دەیانجار لەخۆی بەهێزتر و فرەنفووسترە و کەرەستەی شەڕ و تفاقی دەمی بێ شەڕیی جارەها لە کورد تێروپڕترە، شەرعیەتی نێودەوڵەتان و یاسای نەتەوەیوکگرتووەکانیشی پاڵپشتە، چەندێکی کوردەواری بە تێکڕایی لە ڕێی:

1- یەکیەتی هەوڵ
2- شارەزایی بەرژەوەند
3- ڕەفتاری لایەق بە مرۆڤی سەردەم

بخەبتێت شتێکی کردووە ئەگەر نەیکات دەبێتە حەیاچوون، بۆ خۆشت لێتەوە دیارە دنیای کوردەواری لە چ بارودۆخێکدایە. بە داخەوە لە مانای دیمۆکراسی و ئازادیی کۆشەش، جارێ، هەر ئازادی لەتلەتبوون و براکوژی پلان و پرۆژەی خەباتگێڕانە. دەردی دواکەوتووی 2500 ساڵ وەک نەخۆشی شیرپەنجە لەو خۆبەختکەرانە بە دەر دەداتەوە.

- دەمەتەقێ و جیاوازی زەق لە نێو دوو بەرەی کورددا لەمەڕ کوردایەتی و مرۆڤایەتییەوە هەڵساوە... بە ڕای ئێوە میانەیەک هەیە لە نێوان ئەو چەمکانەدا؟

لەلایەن ئیمکانی بە یەکتر گەیشتنی دوو بەرەی کورد لەسەر کوردایەتی و مرۆڤایەتی، هەتا کۆمیۆنیزمی لینینی مارکسیی نێوان کوردان سوور بێ لەسەر:

1- تێکبەردانی خەڵق کە هەمووی ناکا هیچ بە گەورە و گچکەیەوە
2- مارەکردنی خەباتی کورد بۆ شیوعییەتی جیهانی

بەیەکتر گەیشتن لە چاکەی کوردایەتی نابێت.

کۆمیونیزم و هەموو بیروباوەڕێکی لە خۆدا ڕووچووی کە نیازی لەناوبردنی بیروباوەڕی غەیری خۆی لە بەرنامەدا بێت، هەر لە پێشەوە جاڕی داوە کە دژ بە مرۆیە، ئیتر کورد بێت یا غەیری کورد، تەجرەبەش ڕایگەیاندووە کە دیمۆکراسی، وەک نیزامی حوکم، باشترین شێوازی مامەڵەت لەگەڵ یەکترکردنە. ئەوجا لە چوارچێوەی دیمۆکراسی کە مافی ژیانی هەموو بیروڕایەکی لایەق بە بەشەر دەدات خوام دەکرد 100 فێرگەی فیکری و فەلسەفی پێشبڕکێی هێمنانەیان دەکرد... ئەورووپا بە درەنگەوە (مەبەستم شیوعیەتی ئەورووپایە) جورئەتی دا بەر خۆی، دیکتاتۆریەتی چینی ڕەنجدەری لە ناوەڕۆکی بیروڕا و پێڕەوی سیاسی خۆی بسڕێتەوە...

کورد ئێستاکە لە بارێکدایە، ئەگەر هۆشی بە بەرژەوەند و فەرمانی ژیان و مێژوو بشکێت، دەبێ ئامانجی هەرە هەرە هەرە سەرەکی و بنەکی و ناوەندەکی و ڕاستەکی و چەپەکی و ژێرەکی بەردەوامبوون... نەبڕانەوە... لە خۆڕایی نەسووتان و نەڕمان... قڕتێ نەکەوتن بێ. جارێ چ دەسەڵاتێکی چەسپاوی سەلمێنراوی (نە کەرەستەدار و نە بێ کەرەستەی) نییە دەمەتەقە لەسەر هەڵسەنگاندن و کێشانە و پێوانەی چاکتربوونی ڕێی شەمەندەفەر یان ئۆتۆمبیل هەڵستێنێ... نیسبەتی باج لەسەر داهات سەدی پێنج بێت یان سەدی پەنجا... تەمەنی حەقی شووکردنی کچ 15 ساڵ بێ یان 150 ساڵ... خانووبەرە لە دە نهۆم تێنەپەڕێ یان لە دەو نیو... شاقەڵی عەبا بگاتە سەر پشتی پێ یان گۆزنگی پێ، وەک ئاوی دەستنوێژ... لە کونەلووتی چەپەوە یان ڕاستەوە، ڕۆژانی دووشەمۆ هەناسە هەڵمژێ... هەڵبەت دەزانم باشتر لە خەڵقیش دەزانم لە سێبەری ئەو وەزعەدا کە کورد تێیدا قەتیس ماوە، هەر هەلێکی بەرەوپێشبردنی بەرژەوەندی گشتی وەیا بەرژەوەندی ڕەوای تاک بێت، هەڵکەوت، دەبێ پتر لە تاکێکی میللەتێکی هەڕەشە لێ نەکراو چڕنووکی لێ گیر بکات. هەر فێڵ و فەرەجێکی بە کاری بهێنێ دژ بەو قانوونانەی پەکی مافەکانی دەیەخن، هەمووی شەرەف و کەرامەتی لێ دەپرژێت... ئەگەر بتوانی بە بەرتیل یان بە فێلی ساحیرانە لە جیاتی قوربانییەکی بێگوناحی کورد جەللادەکەی هەڵواسێت، بایی هەزار و یەک حەج خێری دەگاتێ... بەر لە شەست و ئەوەندە ساڵە بابم فەتوای دا، هەر حاجیەکی مەسرەفی حەجەکە لە ڕەش و ڕووتی وڵاتی خۆی خەرج بکات خێری حەجەکەی پتر دەگاتێ... هەر لەو ڕوانگەوە بوو ئەمەی بە مەلای کورد گوت:

ئەتو خودا پێم بڵێ مامۆستای ڕووت و برسی
هیچ ئیشی تۆ پێک دێنێ شیعری امرؤ القیسی

بۆ خۆتان سەعی بکەن نانێک و بێتە دەستی
ئینسانی میعدە خاڵی ناو زگی ڕاناوەستی

کورد له بارێکدایە ئەگەر لە تەشبیهدا نموونەیەکی مەیلەو خۆشکەلانەی بۆ بهێنینەوە، وەک کاروانێکە ڕێگر دەستی بەسەردا گرتبێت، بۆ دەربازبوون، هەرچی بیلێ و بیکا لە چاک و بەد و ڕەوا و ناڕەوا نەک هەر دروستە بەڵکوو واجبە و نەکردنی دەبێتە ڕووڕەشی.

من لەوەندە وەڵامەی پرسیارەکە بەرەی بەرانبەر کوردایەتیم دانا بە شیوعیەت... کە دەگەینە ئەو شوێنەی «مرۆڤایەتی» دەستەویەخەی کوردایەتی بووە... لە سییەکاندا شاعیرێک ئەمەی خوارەوەی گوتووە کە جارێ کۆمیۆنیزم لە نێوانماندا پەیدا نەبووبوو:

قەومی کورد موحتاجی عەطفە چونکە مەحوی کردووە
زللەیی دەستی حەوادیس، لەققەیی دنیایی دوون

لە پاش تێکچوونی دەوڵەتی ماد کە بە ڕای زۆر لە خاوەن ڕایان باپیرەگەورەی کوردن، ئەم میللەتە چارەڕەشە هەر لێی کوژراوە و خوراوە و داگیرکراوە، وەهاش بووە بەشێکی بەرچاوی نەفی دوورەوڵات کراوە. ئەگەر مرۆڤایەتی ڕاست کات و ستەمدیدە بلاوێنێتەوە، کورد لە ڕیزی هەرە بەرایی میللەتە ژێر چەپەڵۆکەکان دێت... گەل هەیە لەخۆوە برسییە بێگانە سواری قەڵاندۆشکانی نەبووە، هەرچی کورد و چەند میللەتێکی دیکەی وەک بەلووچ هەن بە دەست داگیرکەری بێگانەوە دەناڵێنن هەرگیزاو هەرگیزیش نەڕەخسا بۆ ماوەی ڕۆژێک ئەرکی زوڵمی بێگانەیان لەسەر سووک بێت، ئیتر چۆناوچۆنی مرۆڤایەتی دژ بە کورد دەوەستێ... تۆ بڵێی من لە مەبەستت نەگەیشبێتم؟

- لە نووسینەکاندا گەلێک سەرقاڵی بەگژداچوونەوەی چەپی کوردن و ئەمەش تەنگوچەڵەمەی زۆری بۆ دروست کردوون. گیانفیدایی نەزۆکی

ئەمانە بۆ دیمۆکراسی بۆ براگەورە و وڵاتی داگیرکەر و ئۆتۆنۆمی بۆ کورد بە فاکتۆرێکی سەرەکی نازانن لەو بە گژداچوونەوەیەدا؟!

بەندوباوی بەرەی چەپ لەککەیەکی شەرمهێنەوەیە لە ڕووپەڕی ژیانی سەردەمدا بە تایبەت لە وێرانگەی وڵاتێکی ڕووت و ڕەجاڵی وەک کوردستانی خۆمان کە بە درێژایی مێژوو نەک سەرمایە بەڵکوو تاکە یەک «صراف»ی لێ هەڵنەکەوت مامڵەت بکا بە پارە، باسی بانکیش ناکەم کە وڕێنەیەکە بە خەیاڵدا دێت لەسەر بەردی سەنگی سەخری قڕناقە و عەبابەیلێ، باوکم لە دێرە شیعرێکیدا دەڵێ:

هەواڵی کورد و کوردستان دەپرسی
وڵاتی چۆڵ و قەومی ڕووت و برسی

هێرشی سوارچاکانی بەرەی چەپی کورد بۆ سەر من و نووسینەکانم هەموو سنوورێکی بێئابڕووی تێپەڕاند کە هاتن بە ئیمزای پاتەوپات لەلایەن پرۆفیسۆرەکانیانەوە شکاتیان گەیاندە مدیری ئەمنی عام کە من «کۆڕی زانیاری کورد»م کردووە بە لکێکی سافاکی شاهنشاە بەوەدا کە هەمیشە کوردە پەنابەرەکانی وەک هێمن و فلان و فلان دەوریان داوم و داڵدەیان دەدەم کە هەموویان جاسووسی ساڤاکن... لەمەش تێپەڕیان کرد بە کاری بەدتر کە ئێرە جێی باس کردنیان نییە... فەلاکەتی چەپی کورد وەک فەلاکەتی شەعبەدەپەرستان چەمکێکە لە کۆستکەوتوویی دوو هەزار و پێنجسەدساڵیمانەوە. هەر دەبێ وەهاش بین بە دەست واقیعێکی ڕەجاڵی ئەوتۆوە بە بەریەوە هەیە لە هەموو ئەزموونیکدا دواکەوتوویی میراتیمان ئیفلاسی دەروونیمان بە ئیسپات بگەیەنێت... ئەم تێبینیەش لێرەدا جێگەی ڕوون کردنەوەی نابێتەوە بەڵام پێویستە بڵێم من لە لای خۆمەوە بە هیچ جۆرێک مافی چەپرۆم زەدە نەکردووە. لە هەر وەزیفەیەکدا بووبێتم بە چاوی بێتەرەفانە سەیری ئەو و داواکارێکی دیکەم کردووە یان پێم کرابێ لە

بەندیخانە دەرم هێناوە... وەزیفەم بۆ پەیدا کردووە... کە وەزیر دەولە بووم (ساڵی 1964- 1965) بە سەیارەی وەزارەت شیوعی قاچاغم لە بەغداوە گەیاندۆتە شوێنی بێمەترسی... هتد!! دەبێ بشزانین چی پێی دەگوترێ ئایدیۆلۆجیا، چ لە چەپ چ لە ڕاست، هەتا وەک بەفری بەر گەرما نەچێتەوە هەر کاریگەر دەبێت ئیتر خۆ و بەخت یان چاک یان خراپ...

- خەسڵەت و تایبەتمەندێتی لە نێوان هەستی نەتەوایەتی و بیری نەتەوایەتیدا بە چیدا دەناسرێتەوە؟ ئایا سنوورێکی گردەبڕ هەیە لە نێوان ئەم چەمکانەدا؟!

من لێرە بەپێشەوە ڕووبەڕووی پرسیارێکی وەها وەیا کەسێکی لەم ڕووەوە چ بە نووسین چ بە زمان شتێکی درکاندبێت، نەهاتووم. بەلای بینینی منەوە هەست کردن بە شتێک و بیرکردنەوە لە عەینی شت نەک هەر لە «نەتەوایەتی» بگرە زۆربەی هەرە هەرە زۆری بابەتی جیهان ئەم پرسیارەیان لێوە هەڵدەستێ وەک: هەست کردن بە هەنگوین، بە درۆ، بە داد، بە پۆلووی ئاگر، بە برا، بە دووپشک، بە کەشکەڵانی فەلەک... و بیرکردنەوە لێیان دوو مەوزووعی لێک نزیک و بەسەریەکەوەن، بەڵام فەرقی نێوان «هەست» و «بیر» نایەڵێ یەک شت بن. دیارە کە گوتت «خەبات بۆ نەتەوایەتی» یان «دوژمنایەتی لەگەڵ نەتەوایەتی» دوو مەوزووعی تازەی سەر بە بابەتەکەت لە دوو گۆشەی دژ بە یەکەوە هێناوتە مەیدان.

هەستی نەتەوایەتی پێزانینی «مجرد» و مەییوە، بیری نەتەوایەتی سەرەتای چالاکییە لەو مەیدانەدا. هەڵبەت هەستکردن زووتر دەپشکوێت، تەنانەت «بیر» و «هۆش»ی لێ دەرکەیت گیانلەبەر «حیوان» هەستی لە هەستی بنیادەم تیژترە کەوا تا ڕادەیەک لە جەنجاڵی «پەلەی ژیان» نەختێکی بۆ تێدەهێنێتەوە. «هەست» غەریزەیە، «بیر» کاری هۆشە، لە ئاژەڵدا نییە. مەبەستیش لەو «بیر»ە لێکدانەوەیە نەک یادکردنەوە. ئەوجا نازانم ئەوەندە

لێدووانە بەشی پرسیارەکەت دەکات یاخود تۆ مەبەستتە بابەتێکی سەر بە سەقافەت و شیتەڵکردنی دیاردەکانی بوونەوەرە کە بۆتە مۆدێلی شەقڵبەستووی سەردەم. ڕاستییەکەی بێ ئەوەی ڕەخنە لە پرسیارەکەت بگرم، شیتەڵکردنی «بابەت» تا وەکوو کوشتەی قەساب، سەر لە لایەک و قاچ لەلایەک و ورگ و ڕیخەڵۆک بە لایەکدا، لە سیفەتی «بابەتایەتی» دەخات. نە بابەت ئەوە دەمێنێ کە جێی لێدووانە، نە ورگ و قاچیش ئەو بەرخەیە دەبارێنێ. ڕەنگە بابایەکی سەر بە «وظائف الأعضاء» لە گەیشتنی نێرینە و مێینە بە یەکتر هەر ئەوە بزانێ و بە مەبەستی بگرێ کە فلانە ماسوولکە کشت دەبێت و فیسار دەمار خاو دەبێتەوە و لیکی زار زیاد دەکات... نە تەفسیری ئەو حەز و لەززەتە دەکات کە دوو جینس بۆ لای یەکتر ڕاپێچەک دەدات، نە دەتوانێ بەلای ئەو مەبەستە بنەڕەتی و سەرەکییەی «بەردەوامبوونی نەسڵ»دا بپێچێتەوە، ڕەنگە خۆشتر بۆ ئەو و بۆ عیلمەکەی ئەوە بێ کە کارەکە بە دوو پەیکەری مێینە و نێرینەی ڕۆبۆتی بسپێرێت کە لایەنی «زیندەوەریتی»ی پڕ گرێ و گاڵی سەرشێوێنی زانستی ساردوسڕی لە کۆڵ دەکاتەوە... دێتە مەیدانی خەباتی هەمەچەشنەی چاک و بەدی مەیدانی کۆمەڵایەتی، لەوێشدا کەسێکی بە لای تەحلیلی ماددی ڕووتدا بچێتەوە، هەر خەریکی ماددیکردنی ئەو دیاردە و بیر و باوەڕانەیە کە خەڵق، ماددە، پارە و گیانیشی بە قوربان دەکات، لەوەشدا تەنها مەبەستی نەبوونی «کردگار»ی بۆ بە زرەئیسپات دەگات، دەنا خۆ بەقوربان کردنی بەرد و داری قودس و مەککە و مەدینە و شرەکەڵەکی دەوری چاک و پیران هەر دەمێنێتەوە وەک کێلەڕێی سەرشەقامی بەرەو قیامەت و پشت لە دنیا. کەم و زۆر ئەم لایەنەم لە هەندێ نووسینی بڵاوکرایەوەی لێرە بە پێشەوە بە قەدەر توانا ڕوون کردۆتەوە، وابزانم لە «مرۆڤ و دەوروبەر»دا بە سەرەو هەورازی هەندێ لەو بابەتانە هەڵزەناوم... ئەمانە لە دوورەوە ڕێکی بابەتی پرسیارەکەت کوتەکوتیانە.

- مرۆڤی نەتەوەیی دەبێت چۆن بێت؟

مرۆڤی نەتەوەیی دەبێ وەکوو ئەو مرۆڤە وشیار و دادپەرست و دوورخوێن و وردبین و زانستی بێت کە هۆزی جودایە لە هۆزی نەتەوەیی دەنا بەکەڵکی کارەکەی خۆی نایەت و شارستانیەتی سەردەمیش دەیتفێنێتەوە، بە مجێزی بێدەسەڵات و گۆشەگیرێکی وەکوو منیشدا نایەت. دەروێشی و تاوگیری و لە دنیا بووردوویی و پەک بە سوود و زیان نەکەوتن تەنها لەو دەمانەدایە کە ئەگەر وەها نەکرێ دنیاکە لە دەست دەردەچێ و ڕۆحەکە ناپارێزرێت...
هەرگیز چوونە ناو ژووری پەرستگە، چ دینی چ دنیایی، دەرچوون نییە لە قەپێلکی مرۆڤانە و ڕەوشتی دروست و ڕێکی ئاسایی. بە لای باوەڕی منەوە بایی ئەوەی کە «گەل» بەرینترە لە چین و کورد هەژارترە لە گەلێکی دیکە، دەبێ نەتەوەویستی کورد ژیرتر و هێمنتر و دوورەندێشتر و دەستپارێز و بەرژەوەندبینتر بێت، لە برا کۆمیونیستێکی کە سەرکەوتنی کرێکاری جابولقا و جەزیرەی واق واق بە میراتی خۆی دەزانێت. واقیعیەت وەها داوا دەکات لە مرۆڤی نەتەوەیی لە هەڵوەستی سافیلکە و عاتیفی و خۆشباوەڕی خۆگیری بکات و هەرگیز برا مێرخاسەکانی دەمی لێقەوماوەیی گەلێکی تر بە وەکیلی دانەنێ لە بڕیاردان و بەرنامە دانان. چ قەیدی دەکرد ئەگەر ئەو مێرخاسانە کوردیان دانابایە بە وەکیل وەیا ڕەفیقی سەفەر کە هەرگیز نەیانکردووە...
هەڵبەت ناڵێم کورد بە ڕەفتاری ئەنتیکە خۆی بکاتە کۆسەبەبی، ناڵێم دەستی یارمەتی ڕەتبکاتەوە، با لە شەیتانیشەوە بێت، چونکە «قەومی کورد موحتاجی عەتفە... » و دەستبەتاڵە لە خەرمانی خۆیشی... با دیسان یادی باوکم بکەمەوە کە لە سەرەتای سییەکاندا ئەمەی گوتووە لە زەمینەی چنگ لە نیشتمان گیرکردن:

بستێکی لە خاک و بەردی کوردی
نادەم بە مەرقەدی سوهرەوەردی

بیرێکی لە نەوتی بابەگوڕگوڕ
نادەم بە منارەکەی ئیمام دوڕ

ئەگەر لە توانادا بێت، هەتا تاک تاکی کورد لەو مەیدانانەی پێشکەوتن تێیاندا مایەی شانازی بێت بەرەو پێش بچێت و ناوی تێدا دەربکات، بە سوود و سەرمایەکی گەورەی کورد دەژمێردرێت... لە نێوان بێگانانەدا، بە تایبەتی لە وڵاتانی ڕۆژئاوادا، دەبێ کورد شەرەفی کوردایەتی بپارێزێ بە ڕەفتاری پاک و بە کردەوەی چاک. کە نەکرێ لە مەیدانی بەزاندنی دوژمنی پاتەوپات سواری ڕەخشی ڕۆستەم بین و شمشێری زولفەقار هەڵکێشین، خۆ دەشێ وەکوو مرۆی بەڕێز هەنگاو هەڵێنین. کە ئەمەمان لە خۆمان بە زیاد گرت، بیری نەتەوایەتیمان لێ دەبێتە فشەفشی قۆڕە دەماخی و لووتبەرزی، تا ڕادەیەکیش، مفتەخۆری بێشەرمانە... لە کوردایەتی و مرۆڤایەتی قسە نەکەین، خۆ دەبێ لە غەریبایەتی مێوانی بەشەرم و شکۆ بین، بە تایبەتی ئەوانەی بە بژێوی خانەخوێکان گوزەران دەکەن... لەم بوارەوە ڕێ هەڵگرەوە بۆ هەنگاوی مرۆی نەتەوەیی هەتا مەودای پشت ئاسۆی دیار و نادیار... بزووتنەوەی چەکداری هەڵەی بێئامان و سامانی کردووە لە براکوژی... دز و درۆزنەکانی کوردی پەنابەر بۆ ئەورووپا تەرەس و بێشەرەف و بڕوای ئابڕووتکێنترین گوناحی نامەردایەتین، دەبوو لەسەر پەردەی نامووسی دایک و خوشکەکانیان لوقمەی گەوادی بخۆن، دەک هەزار ملیۆن لەعنەت و نەفرین لە چارەی خۆیان و لە پشتاوپشتیان تا دەگاتە کەشتییەکەی نووح، کە بۆ جاری دووەم باپیرە گەورەی ناو کتێبە ئاسمانییەکانە. پێنج خشتەکییەیی فایەق بێکەسی نەمر بە سەر سروودەکەی پیرەمێردی موقەدەسەوە لایەقی ئەو کوردە گڵاو و بێگانییانەیە:

قەدری میللەتتان بە جارێ شکان
نە شەرەفتان ما نە ناو و نیشان

باری لەعنەتتان وا هاتە سەر شان
وەفدی کوردستان میللەتفرۆشان
هەرزەوەکیلی شاری خامۆشان

- ئایا خەبات و دروشمی برایەتیی کورد و... جەوهەرێکی درۆزنانەی لەخۆ[نە]گرتووە؟

جارێ لە پێشەوە بپرسم ئایە برایەتی عەرب و عەرەب و کورد و کورد لە چ پلەیەکدایە! هەرگیز بەو دوعایە مەڵێ ئامین کە لەسەر ساجی عەلییەوە، بێ بنەما و مەرجی بازاڕی ئاڵوویر، برایەتی سیاسی لە نێوان دوو میللەت، چ لە یەک دوور و چ بە یەکتر دراوسێ، وەکوو گیای بەهار لە دەشتودەر بڕوێت... هێشتان برایەتی سەرزارەکی بێئەرک و مەسرەف لە نێوان کورد و مەلاگاسی و عەرەب و دانیشتووانی مەریخ، ئەگەر هەبێ، کەمتر جێی سەیر پێ هاتنە، بگرە بە مانای نەبوونی دوژمنایەتی لە نێوان گەلانی وەها لە یەک دوور دەشێ برایەتییەکی «ئیعتباری و زادەی سەلبییەتی زەرەر کە دەکا نەبوونی زەرەر» قسەی مەیلەو خەواڵووانەی هیچ لێ شین نەبووی تێدا بکرێت. من لە وڵاتی خۆم مەمنوونی ئەو بەقاڵەم کە بە ئانقەست مێوەی عەیبدارم بۆ هەڵنەبژێرێت و نرخی زیادم لێ داوا نەکات، ئەوجا چۆناوچۆنی زات دەکەم شەریکی بم؟ ئەوە ڕەشبینی و بەدگومانی نییە لە من کەوا، شوکرێ، ئەوەندەم نییە بەقاڵ تەماحی لێ بکات و بە تەمای شەریکایەتییم بێت، کە لە تەنگانەدا دەستی ناچاری بۆ درێژ کردم، ئەگەر بتوانم بۆشی دەگوشم (و گوشیویشمە). من بە زمانی واقیع ئەو واقیعە دەخەمە گفتوگۆ... پاش ئەو بێنە و بەرەی وەها تاڵ و تفت لەبارەی بەقاڵی کوردەوە، کە نموونەی عەتار و لێخوڕ و مووچەخۆر و پاسەوانی نیشتمانە، ئینجا من ئەمانە بە خاوەنی کوردستان دەزانم... دۆمەکە گوتەنی: لێم بە میرات بێ هەر ئەوەیە... شاعیری فارسیش لەبارەی قەزا و قەدەرەوە دەڵێ: «گر تو نمی پسندی تغییر ده قضارا» (گەر

ڕات لێ نییە قەزاوقەدەر بگۆڕە). با ئەوەندەش بخەمە سەر قسەکانم:
پلەیەک هەیە لە نزمی و کەماییەتی کە مرۆی گەیشتێ پەرۆش خواردن لە زەدەبوونی، خەسارەتمەندییە... بەڵام دایک و باوکی ئەولادی بەد و بڵح بە دەست خۆی نییە پەرۆشی لێ دەخوات، دیارە من و تۆش بەناچاری پەرۆش بۆ سەرلەبەری کورد دەخۆین... لە حەفتاکان، کە جارێ برا کوردەکانی ئێرانی ئەوسا وەک هێمن و هاوڕێکانی لە عێراق بوون و بە زۆری یەکترمان دەدیت، لە مەجلیسێکی داوەتیدا و بەپێی داخوازی ئەو دەمەی وتوویژ گوتم: من کوردم قەبوڵە بە کورد هەتا ڕۆخی خیانەت... قەبوڵی دەکەم بە کورد کە لە قۆرتی خیانەت هاتە دەر... لەوەشدا لەسەر هەق بووم وەک هەژاری موفلیس کە سەلکە پیازی ڕزیویشی بەلاوە خۆراکە... ئەو کوردەی خراپەی لەگەڵ کورد کردووە لێی پەشیمان بۆتەوە، کڕیاری بێگانەی بە زیادەوە هەیە کە سەر لە نوێ باداتەوە بۆ لای خراپە. کە تۆبەی لێ نەسەلمێنم سەربازێک دەدۆڕێنم و دەیکەم بە دیاری بۆ دوژمنی کورد.

- کوردایەتی چۆن پێناسە دەکەن؟

کوردایەتی چۆن پێناسە دەکەم؟ پێناسەی دەکەم وەک کە عەتارێک پێناسە دەکەم: دوکاندارێکە ماڵی عەتاری دەفرۆشێت... یان دەڵێم عەتاری ئەو کەسبەیە عەتار لە دوکانی خۆیدا دەیکات، کوردایەتیش تێکۆشانی ژیرانە و دڵسۆزانە و زانستکارانەیە بۆ گەیشتنی کورد بە مافە ڕەواکانی خۆی لە ئازادی و سەربەخۆیی و کامەرانییەکی لە ئیمکاندا بێت. هەڵبەتە «سەربەخۆیی» کە قەڵغانی سەلامەتی و بەزاندنی خەتەری تەفروتونابوونە، بەر لە هەموو مەبەستێکەوە دێت، دواتر حیسابی کەرامەتی تاک و دادی کۆمەڵایەتی و مافی مرۆ... دێت. کە ئەمانەش دەبێ لە سەرەتای خەباتەوە بەشێکی فەلسەفەی تێکۆشان بێت، دواتر کە حاکمی کورد بوو بە جەللاد (وەک لە هەموو تازە ڕزگاربووی دواکەوتوو ڕابەرەکەی بە عادەت دەبێتەوە

میری سەربڕی خۆماڵی) سەرلەنوێ خەڵقەکە گۆڕەوشار بدرێتەوە بۆ ئازادبوونێکی تازەزاو. ئەمەندە بە کافی دەزانم بۆ ئێستاکەی کورد...

- بۆ ڕۆشنکردنەوەی ئەقڵی کوردی و پێکهێنانی هێزی کوردی و بیناکردنی کیان و کەینوونەی کوردی پێویستە ڕێنیسانسێکی کوردانە لە کوردستاندا بەرپا بیت. ئایا زەمینە و تروسکەی هیوای ئەم داخواز و ئەرکە بەدی دەکەن؟!

پێویستبوونی ڕێنیسانسێکی کوردانە بۆ پێکهێنانی هێز و بینا و کیان و کەینونەیەکی کوردی... ئامانجی وەها ئەریستۆکرات و بەرز کە زۆر دوورەدەستە بۆ ئێستاکەی کورد، کە دەزانین دوورەدەستە بۆ ئەو میللەتە دواکەوتووانەی کیانیشیان هەیە، وەک لە بەهاردا بەتەمای میوەی هاوینە بیت، دەست دەکەیت بە خزمەتی درەخت بێ ئەوەی تێی ڕاخوڕیت بۆ پەلەکردن لە میوە پێگەیاندن. هەروەهاش ڕێنیسانسی کورد کە هەبوونێکی potential بە خۆیەوە دەبینێ یان جارێ نایبینێ، پەلەکردن و نەفەسسواری و دەمارکشتی هەڵناگرێ. بابڵێین، بە تەشبیهێکی ڕوونتر، ڕێنیسانسی کورد وەک جەنینی یەک مانگەی لە پزدانی دایکیدا نموو دەکات، ئەگەر خێراییت لێ کرد بە سێ مانگ و چوار مانگی مردەزاد دەبێت، لەوانەیە دایکەکەشی پێوە بمرێت... ڕێنیسانسی مێژوویی ئەورووپا چەندی برد هەتا بەسەر پێیانەوە ڕاوەستا؟ لە سەرەتاوە زانای ئاسماناس دەسووتێندرا بیگوتایە [زەوی] دەسووڕێتەوە و ڕۆژ وەستاوە، دواتریش لەبەر هۆی زۆر ئەژمار سەرلەنوێ فیکری دژ بە عەلمانیەت تاوی ستاندەوە و تێر و تەژی ئەوا دەژی و دەشتەنێتەوە... هەرەوەزی کوردانە بۆ ڕێنیسانسی کوردانە، هەڵناگرێ وەک لە سەرەتای پاییزدا قوتابی دەچنەوە بۆ فێرگەکانیان، ئەویش قۆڵ و باسکی لێ هەڵماڵێت و بەبەریەوە بنیشێت. دەنگێکی بەرز بێتەوە بۆ بانگەوازی ڕێنیسانس بینا لەسەر باوەڕهێنانی خاوەنەکەی بە دروستی بانگەوازەکە لە

خۆی و چەند کەسێکی وەک خۆی بەولاوە، ڕەنگە، کەس نەیبیسێت. بێگومان «ڕێنیسانسی کوردانە» دەرویشایەتی نییە هەر خۆی بکوتێتەوە. هەرچی زانست و تەکنیکی دونیا هەیە دەبێ ڕاگەیێن نەخشەسازی ڕێنیسانس بن، چ کوردانە و چ تورکانە و هیندییانە... ئێمە جارێ تەیارەمان بە ئاسمانەوە نەفڕیوە... شەمەندەفەرمان بە دەستی خۆمان لێ نەخوڕیوە و سککەکەشمان لەسەر ڕووی زەوی کوردستان ڕایەڵ نەکردووە... لە کەڵەک بەولاوە ئەوەی پێی دەگوترێ ناو، هۆی گوێزانەوەی سەر ئاو... (وشەی Navy هەر خۆی ئەو « ناو» ەیە، لە فارسی «ملاح، کەشتی لێخوڕ» کە پێی دەگوترێ «ناخودا» کورتکراوەی«ناوخودا» یە) نیمانە. پێمان ناکرێ بایسکلێک دروست بکەین، تاکە یەک شەقاممان بە فەننی کوردی قیرتاو نەکردووە... ئەوەی پێی دەگوترێ «ژێربینا- ژێرخان» بە مەفهوومی سەردەم جارێ لە ناوماندا نەزاوە... هەرچی ئەسبابی پێوە ژیان و گوزەرانە بە حازری لە دووره وڵاتەوە بۆمان دێت، ناشزانین چۆناوچۆنی مامڵەتی لەگەڵدا بکەین و چەندی لەو ئەسبابانە هی حکوومەت بێت بە ماڵی تاڵانی دەزانین، یا دەیدزین یا تێکی دەدەین...

ڕێنیسانس و هەرچی هەنگاوی بەرەو پێشەوە هەیە پیرۆز و ڕووناکە، بەڵام ناشێ بۆ ئێمە هیچ مومکینێک بە قوربانی نامومکین وەیا پشتشکێنی بکەین... ڕێنیسانس گەرماییەک دەبێت لە خوێن و دەرووندا نەک بەرنامەی هێنانەدی وەک کە بەرنامە دادەنێین بۆ ئاهەنگ و داوەت و وەیا چالاکییەکی خۆبەختکەرانە. خۆبەخت کردن مومکینە بەڵام بێ پێپلکە چوونە سەربان مومکین نییە، کەسیش مانیع نییە لێی. درەخت و سەرلەبەری ڕووەک و مێیینەی گیانلەبەر بەبەر نایەت بەر لە گەیشتن بە تەمەنی مایەگیری... ئەمە لەولا دانێ. دوو نوختەی پێوەندیدار لەگەڵ ڕێنیسانس دەهێنمەوە بەر بیرکردنەوە لە نیگات. نوختەی یەکەم بریتییە لە مەودای جوداکەرەوەی فکریی نێوان ڕۆشنبیری بەکەڵکی ڕێنیسانس بێت و ئاپۆرەی نەخوێندوو و نیمچە خوێندوو و شەختەکردوواندا. نوختەی دووەم حاڵ و باری ئەو

ڕۆشنبیرانه، ئایا چۆناوچۆنی لەسەر بەرنامەیەک ڕێک دەکەون بۆ ڕێنیسانسی کوردانە؟ ئەوان لەو دەمەدا کە هەڕەشەی نەمان و هەپڕوون لە پێش میللەتی کورد دایە لەسەر بەرنامەی خۆپاریزی ڕێک ناکەون و چەندین شەڕی کوشندەی خوێناوی لە نێوان ئەو تاقمانە پەیدا بوو، کە تاقەتی لێکتر هەڵگەڕانەوەیان هەیە و دنیایەک ماڵکاولی و ناوزڕانی کورد و کوردستانی پێوە بوو، ئیتر چۆن... چۆن... چۆن...؟ خۆت وەرامی خۆت بدەوە... !

- پێداویستییە گرنگەکانی خەبات بۆ پێکهێنانی کیانی کوردی لە چیدا دەبیننەوە؟ ئایا تاکە چارەسەر نییە؟

دوای سەرکەوتنی شۆڕشی ئۆکتۆبەر، لینین دەنووسێ، سەرکەوتنی شۆڕش بەندە بە دوو مەرجەوە، یەکیان دەوامی حاڵەتی ڕەزابوونی خەڵق بە جۆری حوکم، دووەمیان عاجزبوونی سوڵتە لە سەپاندنی خۆی بەسەر خەڵق... چی لینین گوتوویەتی، بەلای منەوە، ڕاستە، بەڵام هیچ ڕوونکردنەوەی تێدا نابینم چونکە هیچ تەرازوویەکمان نییە باری کۆمەڵایەتی پێ هەڵسەنگێنین، ئایا بایی لادانی حکوومەت غەزەب و نارەزایی کەڵەکەی کردووە؟ ئایا حکوومەت عاجز بووە لە سەرکوتکردنی خەڵق؟ هەتا تەجرەبە نەکرێت، مەرجەکانی متەقیان لێوە نایەت، لەوە بگەڕێ کە ئەگەر لینین نەگەیشتبایەوە ڕووسیا شۆڕشی ئۆکتۆبەر لە ئیمکاندا نەدەبوو... دەقی پرسیارەکەت لە «پێداویستییەکانی خەبات» نەک «پێداویستییەکانی پێکهێنانی کیانی کورد» دەپرسێت، کە دەزانین بێ خەبات لەخۆوە کیان دروست نابێ، مەگەر هێزێکی دەرەکی ئەو کیانە بسەپێنێ وەک کە ئیسرائیلی سەپاند، وەیا چەند حاکمییەتی لە کەنداوی عەرەب ڕەخساند، پێشتریش عێراق و سوریا و لوبنانی لە عوسمانلی جودا کردەوە... خەباتی کورد بۆ کیانێکی سەرلەبەری کوردستانی گەورە لەو نموونانەی سەرەوە گەلێک گەلێک پتر پێویستی بە هاتنەدی مەرجی لەبار هەیە، کە هێندێکیان لەوانەن هێزی دەرەکی دەستی

لێ ناوەشێنێ و بۆ خاتری کاکە کوردی (وەک سۆفی عەلی دوو فیشەک، کە هەرگیز لە دوو فیشەک زیاتری نەبوو بیخاتە عەنباری تفەنگە شڕەکەیەوە، ئەمما قسەی زۆر خۆش بوو) هەژاری نەدار حکوومەتان تێک هەڵشێلێ کەسیش نازانێ کاکە کورد دواتر چی دەکات. خۆت گوتەنی کاکە شیوعی تازە بە تازە چەکوچ و داس بە دروشم هەڵدەگرێ... هەرای مەزهەبی کڵپە دەکات، ڕۆژ بە ڕۆژ تەقەڵ هەڵدەوەشێنەوە و وەستای پینەچی و کەڵێنبەستە خەریکی بێنە و بەرەیان دەبێت، لە حاڵێکدا بە درێژایی مێژووی قالووبەلایی وەها نەبووە میللەتێک بە تەواوی و بێ کەلەبەر وەکوو کوردی «هەرێم» تەیری ناو قەفەس بێت. کە دائیرەی دوژمنان چوار گۆشەی جیهانی لەسەر داخستووە. ڕێیان هەبێ هەر بە پاڵەپەستۆ جیفلقاوەی دەردەهێنن... ئەو پێداویستییانە بەشێکی زێدە زێدە گرنگیان لە دەست کورددا نییە... نەتەوە یەک(نە)گرتووەکان و مەجلیسی ئەمن و هێزە زلەکان لە دەستیان دێت شتی ئەوتۆ بکەن کە هی کردن نییە، شتی ئەوتۆش لەناو ببەن کە زەق و زرپ و زۆپە، چ جایی ئەوەی مومکین نەزۆک بکەن. لە تای تەرازووی سیاسەتی عالەمییدا، کە بەندە بەو بەرژەوەندانەی سیاسەتمەدارەکان، بە ڕاست یا غەڵەت، بە بنەمای ژیان و گەشەی خۆیانی دەزانن. کە حاڵ وەها بێ دروست نییە مرۆی هۆشیار (بە تایبەت هی هیچ نەدار) بە پاڵەوان پفی، دەوری حەمە ڕەزا ببینێت، لەسەر تەختەوە بۆ تەختی تابووتی ئافەرۆزکراو بە ڕێ کرا... هەڵبەت لەم قسەیەدا شتێکم گوتووە هەر خاوەن نیازی بەرز و بەرین بە دزییەوە بۆی دەکۆشن، هەرچەند لە ڕواڵەتدا نەڕەنەڕی عەنتەرانە و ڕۆستەمانە و دۆن کیشۆتانە دەکەن... با نەختێک بزەت بهێنمە سەر لێوان. لە دەمی جەنگی جیهانی یەکەمدا کە ئەڵمانیا لە سەرەتاوە، وەکوو جەنگی دووەم کردی، دنیای دەپێچایەوە، ماریشاڵ هیندەنبۆرگ شۆرەتێکی ئەفسانەیی وەرگرتبوو (کە بەشی زۆری هی لۆدندۆرف بوو بۆ ئەو ساغ ببۆوە). لەو دەمەدا حکوومەتی قەرەداغ ئیعلانی حەربی لەسەر ئەڵمانیا کردبوو، ڕۆژنامەیەکی تورکی هەزەلی ناوی قەرەگۆز بوو وێنەیەکی کاریکاتۆری

کردبوو بریتی بوو لە هێندەنبۆرگێکی بەقەد کەرتە چیایەک، پەیژەیەکی پتر سەد پلەی بە سینگیەوە هەڵپەساردراوە، مەخلووقێکی هێندەی مشکێک پێی هەڵگەڕاوە تا نزیک سینگی هێندەنبۆرگ پسوولەی ئیعلانی حەربی بە دەستێکەوە و بە دەستەکەی تری وەکوو تەمەنناى عەسکەری بۆ سەر برۆی هەڵبڕیووە و دەڵێ: حەددم نەبێ منیش ئیعلانی حەربم کردا! ئەو هێزە زلانە و سیاسەتی عالەمی زۆر جاران دوژمنی خۆیان بەسەر پێوە ڕادەگرن، چونکە لە حیسابی خۆیاندا سوودێکی لێ ڕەچاو دەکەن دەنا وەکوو نۆرییگای پەنەما بە چەند ڕۆژێک دایدەبەزێنن... کە بەرژەوەندێکی خۆیان پێی ڕازین داخوازی کرد لە بنی گۆمەوە کۆنە خنکاوێک زیندوو دەکەنەوە، یان دەتوانن زیندووی بکەنەوە، بۆ سەر تەختی حوکمڕانی... بە زاهیر ئەو تەرزە هەڵکەوتانە پشکی کوردی تێدا نادیترێت، مەگەر لە پاش پەردەی غەیبی حاڵ و باری بەرەو ڕسکان، یەک موعجیزەی ئاخر زەمان وەک مەلۆتکەی عیسا پێغەمبەری بێباوک لە پزدانی مێژووی هەمیشە ئاوس بکەوێتە سەر لەپی کوردی دەست بەتاڵەوە، ئیتر خۆشی سەد خۆشی... چی کاریگەرێکی سەر بە دروستبوونی کیانی کورد کە لە خواز و ئیرادەی کورددا هەیە ئەویان جێی خۆ پێوە خەریک کردنە کە لە ناوتوێژیاندا، هەرچەند بە هونەری کوردیش نەبێ، تەمای ڕەزامەندی سیاسەتی عالەمی کاریگەرێکی بنەڕەتییە وەک کە وەرزێر بەتەمای باران زەوی تۆ دەدا و بارانیش لە فەرمانی ئەودا نییە. لە دەست کورددایە خۆگیری بکات لە کاری بەدی نامرۆڤانە... لە دەست کورددایە خۆی توند و تۆڵ بکات، بە ڕێکخستنی ڕیزی بەربەرەکانی لەگەڵ باری نالەباردا... لە دەست کورددایە وازبێنێ لە دووبەرەکیی و دەحیزبایەتی و شەڕەدندووکێی عەقائیدی... بە کورتی لە دەست کورددایە هەموو لایەنی ناوخۆیی کاروباری گوزەران و یەک ئامانجی و پتەوکردنی هێزی بەرگری و کپکردنی دەنگی جوداوازی عەقیدە و بیروباوەڕ... ئائەمانە و هەرچی وەک ئەوان هەیە، وەک سەرکاری کارامە و لێزان، بخاتە قاڵبی ڕێکوپێکەوە، بایی ئەوەی کە هەر تاکە کوردێک، بێ مامۆستاش، تا سنووری مومکین ماڵەکەی

خۆی ڕێک دەیەخێت هەرچەندە ڕێکیشی نەیەخێت جوانەمەرگ نابێت ئیتر بۆ دەبێ کورت بێنێ لە بەرژەوەندێک کە بریتییە لە سەلامەتیی هەموو کورد و بێ ئەو بەرژەوەندە چ ماڵێک، بگرە چ حەیاتێک، لە کوردستان هەڕەشەی نەمانی لەسەر هەڵناستێ... چەند سەیرە بابایەک خاوەن خەرمان، لەوەی پێی دەڵێن گەلە خەرمان ئاگربڕی نەکات لەو ئاگرەی بەرەو گەلە خەرمان دێت و بە خۆ و سەتڵە ئاوێکەوە لە تەنیشت خەرمانی خۆی ڕاوەستێت بەخێر کە ئاگری لێ نزیک بۆوە ئاوپرژێنی بکات... موژدەی لێ بێ خۆیشی تێیدا دەسووتێت... کورد وەک لەشکرێکە لە سەنگەردا شەڕ دەکات، شەڕکەریش، مەگەر زێدە گێل بێ وەیا بە کرێ گیرابێ، دەنا بەبیریدا نایەت لە شەڕکەری تەنیشتیەوە بپرسێت تۆ لەسەر چ دین و مەزهەبێکی؟ باوکت مووچەخۆرە یان پارەدار یان ڕووت و ڕەجاڵ یان دەرەبەگە؟ چونکە دوژمن کە تەشریفی بەخێر دێ لە پێناسەی ئەو خەڵقە ناپرسێتەوە گۆیا ڕۆڵەی هەژار یان بەگزادەن... بە کورتی و بە کوردی پلەی ئێستاکەی کوردی تێدایە دوو ئامرازی هەرە گرینگی گەرەکە:

یەکیان خۆ قاڵ کردنەوەیەک (لە هەموو ڕوویەکەوە کە پێی ناوێ فەلسەفەی تێدا خەرج بکەین و لە خۆوە دیارە خۆ قاڵ کردنەوە بۆ هەنگامەی خەتەری لەناوچوون چۆن و چییە) دەست بدات بۆ ڕووبەڕووبوون لەگەڵ هەڕەشەی کوشندە... لەناو توێژی قاڵبوونەوەدا خۆگیری کردن لە داوای موستەحیل، یەکێکە لە مشتوماڵدانی ئەو ئامرازە وەک کە لە خۆڕایی خۆ ناحەزکردن بە لای دۆست و دوژمنەوە ژەنگهێنانەوەیە...

دووەمیان هەست ڕاگرتن بەسەر نەبزی سیاسەتی جیهاندا بە نیازی هاوئاهەنگبوون لەگەڵی. چ شاعیری فارس بەر لە 800 ساڵێک گوتوویەتی: با دوستان مروت، با دشمنان مدارا. دەستوورێکە بە قاڵبی بەرژەوەندی قەومی (800 ساڵەکە لەوەوەیە شیعرەکە هی سەعدیی شیرازی بێت، ئەگەر هی حافظ بێت هێندەی عومر نییە). بە هەمەحاڵ مودارا تەسلیمبوون نییە، خاوکردنەوەی دەمارکشتی و تاوگیریە بەدیار «هەل»ەوە. کوردیش ئەگەر

لەو بوارەدا «هەلپەرست» بێت هەر لە جغزی داواکردنی قەرزی کۆن و نوێی ئینکارکراوی دەخەبتێت...

لە هەندێ نووسین و وتووێژدا دەخوێنمەوە و دەبیستم کە کورد سەبەب بە داواکردنی سەربەخۆیی خۆی وەها وەها چەواشە بووە، گۆیا ئەگەر لە زووێکەوە ئەو ئامانجەی بە دروشم هەڵبگرتایە حاڵ و باری بە جۆرێکی دیکە دەبوو. ڕاستییەکەی ئەم باوەڕە پیرۆز و گەشە ڕێ دەدات بڵێین ئەگەر کورد خەریک بایە پێش ئاینشتاین نیسبییەی دەدۆزییەوە... با بلێین پێش کۆلۆمبوس دەچوو بۆ ئەمەریکا... کوڕە جافێکی شارەزوور کیژی مەلیکی بەریتانیای مارە دەکرد... بنگەیەکمان دەبوو بۆ تیجارەتی گەزۆ لە زائیر. ئەو تەزە تێفکرینە لەگەڵ هەموو سۆزێکی نیشتیمانپەروەرانەی تێدایە، لە خەیاڵێکی بڵندنۆڕ و خەمرەوێنەوە تێپەڕ ناکات... دەچێتەوە بۆ ئەوەی پێشتر گوتم لە بەهاردا بەتەمای هاوین بیت... با لێرەشدا بنبزێوکەیەکی واقیعیت بۆ بگێڕمەوە: قۆناغی برنجی پاییزانەی ئاوی قولەی ڕانیە کە چەند شریکێکی تێروتەسەلی بەسەرەوە بوو، تا بڵێی چەور و شیرین بوو، بە خواردەمەنی بەگزادانە، مەسرەفەکەش لە خەرمانی برنج دەردەچوو نەک لە کیسەی فڵان و فڵان... لە دامێنی هەرە بەرەوەی قاڵبە برنجەکە کە دوو کیلۆمەترێک لە قۆناغ دوور بوو. چەند سەپان و جۆوانێک هەبوون بەحاڵ نانیان دەگەیشتێ، پیاوێکی قسە خۆشی تێدا بوو بەو کابرایە یان ئەو ئافرەتەی نانی بۆ دەهێنان دەگوت: بە متبەخچی بڵێ مریشک و بەرخ نەبێ نایخۆم، برمە و پاقلاوەشی لەگەڵدا بێ، شێخ مەحشیشی لەبیر نەچێ، دەنا بۆ خۆم دەزانم چی بەسەر دەهێنم... ڕووی دەکردە برادەرەکانی، بەڵکوو ئینشەڵڵا دوای هەڕەشە نانەکەمان دۆی لەگەڵدا بێت...

ئەی یاری عەزیزم بەخودا هەڵخەڵەتاوی

مێژوو گوێی ڕانەهێشتبوو بزانێ کاکە کورد چ داوا دەکات هەتا بۆی ئیمزا بکات و لێی بسەلمێنێت... هیندستان بە هەموو عەزەمەتیەوە دەوری 300

ساڵ ژێر دەستی ئینگلیز بوو تا دوای جەنگی دووەم و سستبوونی هێزی کۆلۆنیالیزم ئەوجا بە سێ کەرتی هیند، پاکستان، بانگلادیشی لێ کەوتەوە. بەو حاڵەش لەلایەن گوزەرانەوە ڕەنگە چی ئەوتۆ نەحەسابێتەوە ئەگەر لە حاڵی بانگلادیشدا، مەیلەو پاشەکشەی نەکردبێ. دەبێ بشزانین بەر لەوەی حوکمی ئینگلیز وڵاتی «پان و بەرین و سەد و یەک ڕاجای سەربەخۆ و فەرمانڕەوایی بێ قەید و مەرج»ی هیندستانی کرد بە یەک حکوومەت... بگەڕێوە بۆ خەریتەی هیندی بەر لە 1900، دەبینیت لەوساوە ڕشتەی خەتی شەمەندەفەری دەگمەنی هەبوو... چەندین بنگەی خوێندن و شاری گەورە و نازانم چی هەبوو. لە کتێبی Political Life Myی S. Amery، وەزیر و سیاسی ئینگلیز، دەخوێنێتەوە کە خۆی لە شاری گۆراکپوری هیندستان ساڵی 1873 هاتۆتە دنیا، باوکی چاودێری دارستانی ئەو هەرێمە بووە کە دەبێ بزانین لە جێگەیەکی وەکوو کۆیێ دوای هەشتا ساڵ لەو مێژووە باسکراوە بیر بۆ ئەوە چوو لکێکی دائیرەی غابات (کە یەکجار هەژار و سەرەتایی و بێ سەروبەر بوو) لە کۆیە بکرێتەوە. چەند پینە ئەرزێکی قەد و بناری چیای هەیبەسوڵتان درەختی هەمیشە سەوزی لێ چاندرا، بەڵام ماڵم حەق بەشێکی زێدە بەرچاوی ئەو ڕووپێوە، ساڵانە بە ئاگری پووش و پەڵاش دەسووتا، ئاگرەکەشی لە تاقیکردنەوەی گوللەی ئاگرداری «سیاج الوطن فرسان صلاح الدین»ەوە هەڵدەستایەوە... لە 1918 هەتا 1921 کە حوکمی وەتەنی تێدا ئیعلان کرا لە عیراق و تێیدا ئینگلیز فەرمانڕەوا بوو، پووش و پەڵاشی نوغوردی بیتوێن ئاگری تێ بەرنەبوو... شاری گۆراکپور لە سەرژماری 1971 بە پێی Britannica Atlas – 231 هەزار دانیشتووی هەبوو، کە قیاسی بکەیت لەگەڵ 9،100،000 نفووسی کەلکەتەدا دەزانیت 1873 ئەو شارە چەند بچووک بووە، مولاحظی غاباتی هەبووە... کەلکەتەی 1971 چواردە خەتی شەمەندەفەری لێ دەبێتەوە کەوا بێگومان هەموو هی سەردەمی ئیستعماری ئینگلیزە... من ئەم درێژەیە بە چەنەچەنی خۆم دەدەم بەڵکوو حەقیقەتی بەر ڕۆژی نیوەڕۆ چاوی چاویلکەداری گەشبینی بێ ئەرک و مەسرەف چەند

جارێکیان برژانگ لێک بدات و لە خەیاڵبازی وازبهێنێ، کە دەزانم ئاسمانیشی ببێتە داواکار و ڕجاکار هەر واز ناهێنێ، هەتا خەیاڵەکەی تەجرەبە نەکرێ و تێشکانەکە بە ماڵ نەمێنێتەوە، هەر سوور دەبێ لەسەر حەق و مەترەقی خۆی... دەسا ئەودەمیش قیلەشەرعێک دەبینێتەوە بۆ سووربوون لەسەر ڕێگا چراغانکراوەکەی باوەڕی خۆی... بە هەمەحاڵ بینای کیانی کورد گرێیاویتر و ئەستەمتر و بەئەرک و مەسرەفتر و دوورە دەستترە لەوەی یەکێک، هەرکەسێک بێت ئەو یەکە، بە فکری مووبڕی زەڕەبینی خۆی تریاقی مارانگازی لە دەرمانخانەی فەلسەفەوە بۆ تێک هەڵشێلێ... هەتا کۆڵیتە مریشکێک دروست دەکرێ قۆڵ و باسک بۆ بن هەنگڵ قوراوی دەبێت، کەچی لەسەری زمانەوە پووچەڵ کردنی هەندەسەی State Empire هێندەی دیشلەمەی شەکری قەند بەتام و لەززەتە... دەک ماڵی بێئینسافیم برمێت: دوعا لە منەوە و بێئینسافی لە بێباکانەوە.

- کەرەسە و زەخیرە و خۆراک کەمن بۆ شتنەوەی ئەقڵی سیاسی و ڕۆشنبیریی ژەنگگرتووی کوردی... چ هۆیەک لەمەدا ڕۆڵی بینیوە؟!

ئەبوو نەواس لە برە شیعرێکیدا ڕووبەڕووی مەعشووق دەڵێ:

تعجبين من سقمی؟ صحتی هی العجب

سەیرت لە نەخۆشیم دێتەوە... تەنسازیم جێی سەیر پێ هاتنە!

لە نێوان کوردا مەشوورە، بە حوشتریان گوت ملت خوارە گوتی بەسەدەقەت بم کوێم ڕاستە! بۆ ئەوەی لایەنی ژەنگگرتنی سیاسەت و سەقافەتی کوردی عەیارەی کورتی و درێژی و تەنکی و قووڵی لەگەڵدا بێت، لە تەک پرسیارەکەدا با لە خۆمان بپرسین، «چین»ێکی خاوەن ژیارییەکی چوار هەزارساڵی و حکوومەتی چەندین هەزار ساڵە و تەجرەبەی گەشی سەرکەوتنی حیزبە شیوعییەکەی بۆچی لە ترووکەیەکی چاودا خۆی نەفام و گێل و شێت

و وێت کرد بەو گاڵتەبازارییەی پێی گوترا شۆڕشی سەقافی؟ ماوتسی تونگێکی لە کتێبەکەی ئەدگارسنۆ «ئەستێرەی سوور بەسەر چینەوە» ساڵی 1936... هێندەی پێغەمبەرێکی ڕاستەقینە دانا و ئازا و داخواز و نیگافرەوان بێت، چۆناوچۆنی لە کۆتاییەکانی عومریدا ئەو شەکر و هەنگوین و «شرابا طهورا» ی گوت کە ڕایگەیاند جاسووسەکەی سی ساڵیی سەر بە ئیستعماری دۆزییەوە، گۆیا لیۆشاوشی، سەرەککۆمار و هاوڕێی کۆنینەی خۆی و ئەندامی هەرەچالاک و بەوەفای حیزبەکەی بێت؟ ڕووسیای شۆڕشی 1917 و خاوەن پاشاخان و ژێرخانێکی ماددی و مەعنەویی چەندین سەدان ساڵەی بە هات و بات و پڕ شانازی و چڕ بە ئەدیب و زانا و هونەرکار[٣] و خاوەن شاری «قوببە زێڕەکان»ی دەمی هێرشی ناپۆلیۆن مۆسکۆ بێت چ بەنگێکی خوارد ببێتە قاپقاپەی چەتیمێکی ماڵی ستالینی دڕندەی تاوانبار و خاوەن قەسابخانەی کوشتن و بڕین و نەفی و برسییەتی ساڵەکانی سی.. و فەلسەفەی بەنگکێشانە و شەختەکردن و کاری سوخرەی ملیۆنەها بێگوناهـ و ئەوجا بۆ ماوەی 25-30 ساڵیش و پتریش لەلایەن هەموو چەپی پەڕگیری جیهانەوە بە خوا بناسرێت و ئێستاش بە تەواوی لە خوایەتی نەکەوتبێ و ملیۆنەها ملیۆنەهای چەپ دەستەودۆعا بۆ گەڕانەوەی لە قەبرەوە ئاهـ و نزایان بێت...؟ شۆڕشی فەرەنسە خوێنی خۆی بخواتەوە، لە جیاتی مەلیکێک ناپۆلیۆنێکی عیفریتی دەواڵپێ وەک بوت بپەرستی؟ ئەڵمانیای نیوەی یەکەمی چەرخی بیستەم دوو جاران سواری چەرخوفەلەکی فەنا بێت... ڕۆزڤێلت پەندی چەرچل هەڵنەگرێتەوە لە سنوورکێشان بۆ پڕکێشی ستالین و پتر چل ساڵ ئەورووپای شەرق و ناوەڕاست ببێتە کێڵگەی هەوەس و تاقیکردنەوەی نامرۆڤانە و ئاگری جەنگی فێنک کڵپەدار بکات...؟ ئەفغانستانی خاوەن حکوومەتی چەندین سەد ساڵ دەست لە بینەقاقای خۆی بنێت و بە دەوری یەک ئاینەوە شاپڵتەخۆری بکات... ! هەندەی بتەوێ نموونەی ژەنگگرتن و هێڕبوون و وەنەوزی سیاسی و هۆشەکی و ویجدانی و ئینسانی لە مێژووی کۆن و نوێدا هەیە، ئیتر بۆ دەبێ مامە کوردی دەرکراو لە جغزی تەئریخ... دەست بەتاڵ

له مادده و مەعنا... بێ زێد و مەفتەنی سەلمێندراو... پێناسەنەدار، ئەگەر تەزکەرەنفووسی کوردایەتیی بە دەستەوە بێ، لە جیاتی هی حکوومەتە لە خۆی بێگانەکەی، بە حەرامزادە بژمێردرێت... ئا ئەم کاکە کوردە، بۆ دەبێ لە ناو ئەو هەموو ئاقڵە باسکراوەکاندا، خۆی بکاتە کۆسەبەبی بە واقیعییەت و بەبێ چڵک و ژەنگی سەقافی و زبڵ و زاری سیاسی؟

من لە بێبەرگی محەم پرسی، کە بۆچ ڕووتی، گوتی:
یارەبی شێت بم ئەگەر شاد بم بە بەرگی عارییە

دەڵێن لە ناو شاری کوێران دەبێ دەست بگری بە چاوتەوە! مەتەڵەکە لە مەعنادا ڕاستە هەرچەند دەست بە چاوەوە گرتن لە ناو کوێران بێلزوومە، چونکە نابینن چاو زەقە یان قوپاو، بەڵام لە عادەت دەرچوون دەردی سەری تێدایە. کوردیش هەر نەبێ بە چاولێکەری لە پیاو ماقووڵان، ئەقڵە سیاسیەکەی و سەقافییەکەی ژەنگاوی دەکات... بەڵام... بەڵام داخم ناچێ لێی ناسەلمێنن. شێخ ڕەزا لە بەیتێکی تورکیزمانی ئەمەی گوتووە:

منعمک ضرطەسنە یرحمک الله دینور
مفلسک عطسەسنە صیحەء ناگاه دینور

دەوڵەمەند بای لێ ببێتەوە دەڵێن یرحمک الله، موفلیس بپشمێ دەڵێن ئەو هاوارە چ بوو. (دەشێ ڕێنووسی بەیتەکەم زۆر تەواو نەبێ چونکە لە کۆنەوە تورک هەندێ جوداوازیی ڕێنووسی هەبوو لەگەڵ عەرەب و فارس... )

ڕاستییەکەی لە گۆشەی سەقافەت و فکری ڕووتەوە ژەنگ هەڵێنان وەیا ناتەواوی وەیا مشتوماڵ نەدران خۆی لە خۆیدا ناقوڵاش بێت، ئەگەر «سیاسەتی کوردی» بە هەڵە نەبات زەرەرێکی ئەوتۆی لێ ناکەوێتەوە، هێندە هەیە کە جۆرە سەقافەت هەیە هەمووی سیاسەتە، وەک مارکسیزم وەیا

عەقیدەی دینیی تازەبابەت کە جاران دین بریتی بوو لە دەرس و دەوری مزگەوت و عیبادەت و تەڵاق چاککردنەوە... هتد. ئەوسا مەلای دوازدەعیلم و دینداری تەواو لەوانە بوو هەموو جیهان بە قوربانی «حجر الاسود» بکات بەڵام لە دڵ و فکری خۆیدا، چونکە دەسەڵاتی لەگەڵدا نەبوو... ئیستا حیسابەکەی گۆڕاوە... سەقافەت دەشێ چ دەخلی بەسەر کاری سیاسەتەوە نەبێت وەیا سیاسەت بە تەواوی سەربەخۆ بێت و پەکی لەسەر سەقافەت نەکەوتبێ. پشدەر کە تاک و تەرای سەوادداری نەبێ، بەر لە حەفتا- هەشتا- نەوەد ساڵ تێیدا نەبوو، کەچی بەقەد بریتانیا شارەزای ئەو بەرژەوەند و پلانگێڕی و ڕاوێژی ژیرانە بوو کە پێوەندی بە گوزەران و سەلامەتی و دوورەپارێزی و... و... حەق و حسێبی ئەوتۆوە هەبوو. موسەققەفەکانی تورک کە سولطان عەبولحەمیدیان عەزل کرد و لەنگەری کەشتییەکەیان لە دەست دەرهێنا بە خۆ و کەشتییەوە هەتا بنی دەریا ڕۆچوو، عەبولحەمیدیش بە مێشک وشک دادەنرا... ئەوەی من بۆی دەچم لە مەبەستی پرسیارەکەت شتێکە سەقافەت و سیاسەت تێک دەبەستێت، کە لە ئاکامدا دەبنەوە سیاسەت و هیچی تر، هەر ئەمەیشە ئێستا لە نێوان سەدان ملیۆن مرۆی جیهان پەرەی سەندووە، تا ئەوەی پەیکەرتاشی بۆتە سیاسەت مەگەر چۆناوچۆنی! بەڵێ دەزانم کورد ڕۆشنبیری دەستنیشان و شۆرەت دەرکردووی، جارێ بە خۆیەوە نەدیتووە بەڵام هەرچۆنێک بێ مامۆستایەکی زانکۆ کە باسی مێژووی میسری کۆن بە قوتابیان دەڵێ، لەوانەیە شتێک بڵێتەوە کە لە ئەورووپاش هەر ئەوە بڵێنەوە، مادەم مامۆستاکە فکری خۆی لە سیاسەت مارە نەکردبێت... کتێبێکم خوێندەوە لەسەر مێژووی کۆنی عێراق لەلایەن دەستەیەک مامۆستا و پسپۆڕی تازەپێگەیشتووی ڕووسەوە کە هەموو زانیارەکەیان[4] لە زاناکانی ئەورووپا وەرگرتووە بەڵام لەو کتێبەدا دەڵێی سەیری شارە مێروو دەکەیت نەک شاری ئادەمیزاد، چونکە هەر خەریکی بەرهەم و هۆی بەرهەم و مەفاهیمی چەکوچ و داس و ئەو کۆنە فکرانەن کە دەکاتەوە سیاسەتێکی ئاینیی غەیبیی ڕووت، دەبێ زانست و سیاسەت لێکتر

جودا بن وەک کە تەئریخ و کیمیا جودان... زانست، بە تێکڕایی، و زانستی سەر بە کۆمەڵایەتی، بەتایبەتی، هەقیەتی بە مێشکی ڕوونتر لە هی بابایەکی مێشکتاریک بابەت و کێشەی سیاسی هەڵسەنگێنێت و واجیبیشە بە سەریەوە کە ڕێنموونیی ژیرانە و بەرژەوەندبینانە لە پێناوی سیاسەتمەدار بکات، ئەمیش مەرجی هەیە بایی ئەوەی کە سیاسەت مامڵەت کردنە لەگەڵ پرسیاری زۆر لایەن. تۆ بە ترووکەی چاو دەزانیت فلانە بەیت لە ڕووی کێشەوە لەنگە، بەڵام زۆری دەوێ هەتا بۆت ئاشکرا دەبێ لەگەڵ «س» یان «ج»دا هاریکاری پێویستە، وەیا بەرژەوەندە بۆ دەرهێنانی نەوت... بۆ چەکدارکردنی سوپا... بۆ ئەلەکترکاندنی وڵات... بۆ بەستنی پەیمان لە نێواندا... بۆ ئاڵوگۆڕی خیبرە و زانست... بۆ... بۆ... بە هەمەحاڵ کراندنی ژەنگی سەقافەت وەک کردەوەیەکی بەرخواز (لە جغزی ئیمکانی خواستن بێت) یەکی لەسەر ڕەهابوون لە چەنگی دۆگما و ئایدیۆلۆجیی شەختەکردوو کەوتووە... سەقافەتی سەر بە سیاسەت جگە لە چاوکردنەوەی جیهانبین، وێڕای سەقافەتەکە خۆی، شارەزایی دەوێ بە دەربوونە و چەرخ و دۆلابی گوریس کێشەکێی بەرژەوەندی ئابووری نێودەڵەتان و ئەوەی پێوەندایەتیی بە وڵاتەوە هەیە و دۆزینەوەی جەمسەری تێک بەسترانی ئابووری بە سیاسەتەوە، کە ئەمەش شادەمار و شەقامەڕێیەکی هەرە گرنگ و بە پێز و برشتە لە ژیانی سەردەمدا. بەر لە پێنجسەد ساڵ هەتا خەبەرێک لە مۆسکۆوە دەگەیشتە یەمەن لەوانە بوو ساڵێکی بوێت و هەرچی کاریگەرییەکی لەو خەبەرەدا دەوری هەبووە بەسەر چووبێ، کەچی ئێستا لە ترووکەی چاودا پەخشی نرخی ئاڵوگۆڕی پارەی ڕەواجدار لە بۆرسەی نیۆیۆرک و لەندەن و تۆکیۆ و مۆسکۆ و پاریسدا بەر گوێی کەرولاڵیش دەکەوێ (ڕەنگە کورد جارێ زەرەر نەکا لە نەبیستنی یان ئیهمال کردنی ئەو پەخشە چونکە دەستبەتاڵین... ). من کە شەو بە درەنگە کاتەوە دەکەومە سەر باری خەولەخۆخستن، دەسا بایی تۆسکاڵێک خەفەتی چوونە سەر و هاتنەوە خواری نرخی شتانەم نییە، لەوانەی ڕادیۆ باسی دەکات، چونکە هەڵکشێت... لە قوڕ

بنیشێت... بفرێ بۆ کەشکەڵانی فەلەک... بەرەو ژێر بێتەوە بۆ بنی دنیا، ناتوانێ دەستە تەرازووی لێکدانەوەی ئابووریم ببزوێنێ. جارێکیان منداڵی خزمێکی نزیکم گوتی زستانان قەت سەرکەوا لەبەر ناکەم، لێیان پرسی بۆ؟ گوتی: چونکە سەرکەوام نییە. مەبەستی لەو وەرامەش نوکتە نەبوو، تەمەنی هی نوکتەسازی نەبوو!

تۆ وەرە بە خێری گۆڕی مردووان و زیندووان ژەنگی فکری سیاسی بکرێتە لە فکرستانی کورد و خەڵکەکە بهێنە سەر ئیمانێکی خەست و ساف بە کوردایەتی کە بریتییە لە پاراستنی «کینونة» بەر لە هەموو شتێک. حینجەیی کردنەوەی گوتە فەلسەفییەکان لە دابەشکردنی خەرمانی گەنم و ڕستەی تووتن ماوەیەکی وەهای دەوێ کە چەپرۆ تێیدا بێئۆقرە ببێت. خۆ ئەو لە سەرەتاوە پەلەیەتی بۆ بینەقاقای هەرچی خواپێداوە، یان شەیتانپێداوە، یان بە ئەرکی بازووی خۆی ڕەسیوە... لەم پلەیەدا «خۆپارێزیی» دواخستن هەڵناگرێ تا ئەو ڕۆژەی لە سەر کونهی فەلسەفەی زاراوەکە چەپ و ڕاست ڕێک دەکەون، کە هەرگیز لە کوردستانی خۆماندا چەپ بە ئارەزۆی خۆی و بەقەناعەت، لە باوەڕەکانی سەر بە شۆڕشی ئۆکتۆبەر و سیاسەتی ستالین واز ناهێنێ... ئەویش وەک بابای ئاینی، عەیارەی ڕاستبوونی باوەڕەکانی دەداتەوە بە دوارۆژ، ئیتر درێژەی پێ دەدات و دەڵێ جارێ ماویەتی تا سەر بە قیامەتەوە دەنێت... ئێستا دوای نەهاتنەدیی حەتمییەتی ڕمانی سەرمایە و هاتنەدیی حەتمییەتی ڕمانی سۆڤییێتستان، بە هۆی چۆڵستانی مێژوویی کوردستان لە لایەن نەرسکانی بنەماکانی سەقافەتی کردەکی و نیگایەکییەوە هەم سۆفیەتی و هەم کۆمیونیزم وێکڕا دەتوانن پتر گەشە بکەن چونکە وتوویژیان لە نزمییەوە و لە تەنکییەوە خۆشتر دێتە بەر گوێی کەرسواری سەردەمی ئاسمانگەڕی... ڕۆژێک ژێرخانی بەرهەمهێن و ڕێکخەر و تیژکەرەوە و مەودابڕی وەک ئەو ژێرخانەی بە چاوی خۆت لە وڵاتی پێشکەوتوودا دەبینیت، ئەفسانەی دێوی سپی قودسییەتی چەکوچ و داس - کە خوێڕیترین و سەرەتاییترین هۆی بەرهەمهێنی سەردەمی قالوبەلایەن- کزکز بەرەو ژێر

دێن و لە زارقەڵەباڵغی کەم دەکەنەوە و دێنە سەر باری ڕازیبوون بە لێکتر خامۆشبوون بە ئومێدی هەلێکی داهاتوو، نەک باوەڕهێنان بە «لکم دینکم و لی دیني». ئەو ڕۆژە پڕشانازییەی کە بە فڕۆکەی کوردی لە سنەوە سەفەر بۆ وان دەکەیت بە شەمەندەفەری کوردی گەزۆی شارباژێڕ بە دیاری دەبەیت بۆ ئەرزڕۆم ئەزەل و ئەبەدێکت پەی کردووە بایی ئەوە دەکات فکری ڕوون، ئەگەر شەپڕەی لێ نەدابێ، فکری پسۆک هەڵوەشێنێت یان پەکی گەشەکردنی بیەخێت. جارێ دوورە... دوورە.. بۆ ئەو سەردەمە خەیاڵییە. ڕۆژی خۆ بەردەوام کردنە... بەسەر پێیانەوە ڕاوەستانە... دەرهێنانی گوللەی بەینی پێست و ئێسکە... هەڵبەستنەوەی شکستە... بەرگەگرتنی هێرشی دوژمنە... ڕۆژی ئەو شتانە و ئەو چالاکییانەیە کە لە خۆیان ئاڵتر چنگ ناکەوێت... عەرەب گوتەنی: ثبت العرش ثم انقش (دەڵێی ئەمەم دووپات کردبێتەوە... ) کە عەرش جارێ دروست نەبووە، نەققاشیش دیار نییە.

- لە کتێبی «مسعود محمد» دا کە نووسەری عێراقی «حمید المطبعي» لە بارەی ژیان و بیر و فەلسەفەی ئێوەوە نووسیویەتی، هەندێ جار مەسعوود محەمەد وەک عێراقییەک باس کراوە. پێم وایە دەبوو وەرامی ئەو قسانەی المطبعي بدەنەوە.

تێبینیت لە بارەی ئەوەی لە لاپەڕە 128ی کتێبەکەی «مطبعي» لە ژێر سەرناوی «لهجة مفكر»دا هاتووە دڵخۆشی کردم بەوەدا کە هێندە پەرۆشخۆری بۆ ساتمەیەکی قەڵەمەکەم بیکات، لە لایەکی دیکەشەوە کمێک گلەییم لە بەختی خۆم کرد کە چاوی وردبینت بەسەر دەلالەتی لاپەڕەکانی 167، 168، 169، 170، 172، دا کشیوە کە هەمووی بەپەرچدانەوەی ئەو جۆرە مەفهوومانەیە ناوناوە لە بۆچونەکانی «مطبعي» و، بە تایبەتی لەو «لهجة مفكر»ەدا هاتوون... لاپەڕە 128ی ئەو کتێبە بەشێکی لە نووسینی ئەو

بابەتە بڵاوکردۆتەوە، ئەگەر هەمووی بەسەریەکەوە بایە تامێکی دیکەی دەدا. بە هەرحاڵ من لەو لاپەڕانەی دوایی کتێبەکەدا شتێکم نووسیوە، دە جاران بایی وەڵامی ئەو تارماییە دەکات کە لە پەنا و پەسێوی کتێبێکی وەک ئەو کتێبەدا بۆر دەچێتەوە. ئەو لاپەڕانە بۆ خۆیان ئاوسن بە بیروڕای ئەوتۆ لە شوێنێکی دیکە دەست ناکەون، بە تایبەتی کە دێم لە تەک «قەومایەتی»دا قودسییەتی نیشتمانیش دەپووچێنمەوە بەوەدا کە نیشتمان خۆی لە خۆیدا پێناسەی نییە ئەگەر کۆمەڵە ئادەمزادێک پێناسەی پێ نەبەخشێت... بگەڕێوە بۆ ئەو لاپەڕانە و بە وردی بیانخوێنەوە...

- لە چاپدانی بەسەر یەکەوەی ئەڵقەکانی «گەشتی ژیانم» لە هەندەران مژدەیەکی خۆش بوو، ئایا هیچ بەرهەمێکی ترتان بە دەستەوەیە؟

حاڵ و باری کتێب چاپکردن لە عێراق لە دەسەڵاتی تاکی کەمپارەدا نییە... من وەنییە نووسینم نەبێت، بەڵام کتێب نین، بڵاوکردنەوەیان لە گۆڤار و ڕۆژنامە بووە و دەبێت. نامەی بیندرێژم هەبووە بۆ برادەری ئەورووپایی، وابزانم لە چاپ دەدرێن یان دراون... وا لەگەڵ تۆدا خەریکم و لەگەڵ کەسانی ناو عێراقیشدا ئەو مەشغەڵەتەم هەیە، تا ڕادەیەکی بۆم ڕێک دەکەوێت، بەڵام بەرتەسکترە... «گەشتی ژیانم» قەولە لە چاپ بدرێتەوە دوای ئەوەی خۆم بەسەر چاپکراوەکەدا بچمەوە و کەمووکوڕی و هەڵەی چاپ و ئەو جۆرە کەلێنانەی بگرم و پڕ بکەمەوە...

- لە گەشتی ژیانتاندا ناوی گەلێ کەس هەروەک نیشانە و هێمایەک باس کراون و ڕەنگە ناسینەوەیان بۆ خوێنەر ئاسان نەبێت. هەق بوو هەندێکیان بە ئاشکرا باس بکرانایە.

گەشتی ژیانم لەسەر داوای موصلیح جەلالی، کارگێڕی گشتی «دار الثقافة والنشر» ەوە بووە بابەتی نووسینم. ئەوسا هەرچی ناوێکی وەکوو مەلا مستەفا، پێشمەرگە، شۆڕش، شێخ ئەحمەد، ئیبراهیم ئەحمەد، جەلال تاڵەبانی، پارتی دیمۆکراتی کورد قەدەغە بوو، ببڕای ببڕای نەدەبوو لە هیچ نووسینێکی بڵاوکرایەوەدا دەرکەوێت. من لە هەوەڵەوە ئەمەم نەدەزانی چونکە جارێ باسی ئەو مەمنوعاتە نەهاتبوو. لە پارەوە کە تەکلیف کرام بۆ جاری دووەم یاداشتەکان لەگەڵ ناوی سەریح بە چاپ بگات بۆ ماوەی چەند مانگێک بەو کارە و تەرجەمەی «من هموم الحیاة» بۆ سەر کوردی خەریک بووم. وا ئێستا ئەو نووسینە لە سوێدە و دەبێ لە ئایندەی موناسیبدا هەردوو بابەت چاپ بکرێن، تا بشڵێی پێیانەوە ماندوو بووم. خۆ تەرجومەی «هموم» زراوتۆقێن بوو. گەشتەکە جگە لە ڕوونکردنەوەی ناوەکان وردە باس و بابەتی تازەشی تێکەڵ بووە. دوای چەند ساڵ ڕێگە درا بە نووسینی ئەو ناوانە. هەڵبەت من ئامادە بووم لە هەموو حاڵێکدا ناوەکان بە سەراحەت بنووسرێن بەڵکوو زۆریش دڵنیگەران بووم لەو مەنعە، بەڵام چارم نەبوو. تا ڕادەیەک، وەک بۆی دەچم. هاتنی مەسعود بارزانی و جەلال تاڵەبانی بۆ بەغدا دوای شەڕی کوێت ڕێگەی ئەو ئازادییەی دا لە ناوهێنانیان. بۆ نووسەر ئەو ناوبردنە پاڵەوانپیفیی تێدا نییە تا ئەگەر لێی مەنع کرا بۆی ببێتە عەیبە. بە پێچەوانەوە دۆزینەوەی هێمایەک بۆ ناوێکی مەمنووع کە شکستی ناوەکەی تێدا نەبێ ئەرکێکە سەربەخۆ، چونکە بە عادەتی وڵاتی دواکەوتوو دەبێ ئەو تەرزە ناوانە لەعنەتیان وەپاڵ بدرێت، خۆ دزینەوە لە لەعنەتەکە کارێکە بۆ نووسەر دەبێتە دوو بەختی. ئەگەر مامۆستا ئاسۆس و وریا لە سەرەتاوە داوایان لێ کردبامایە ئەو ناوانە ڕوون بکەمەوە بە منەتبارییەوە دەمکرد، بەڵام بە ڕاسپاردە، نەک یەکسەر، تەکلیفەکەم پێ گەیشت کە ڕێ بدەم بە کۆکردنەوەی ئاڵقەکانی «گەشت» لە کتێبێکدا، منیش هەر بە ڕاسپێردراودا ڕەزامەندیم بۆ دەربڕین. دەرچوو یەکێک لە ئاڵقەکانی گەشتەکە بە سەهوو چاپ نەکراوە، ئەمیشیان بەخێر دێتەوە ناو کتێبەکە. من دەمزانی ئاڵقەی

پێنجەمی ناو کتێبەکە درێژەی ئاڵقەی چوارەم نییە. وا دیارە دوو ئاڵقەی ژمارەی پێنجیان بەسەرەوە بووە یەکەمیان بەر کتێبەکە نەکەوتووە.

- هەردوولا، کە لە گەشتەکەدا بە مەکتەبی سیاسی و چەکداران ناوبراون، غەدر و ناهەقیان لە تەکدا کردوویت، هەر لە سەرەتای وتارەکانی ساڵی 1960 ەوە تا دواتر و ئاشتبوونەوەتان... ئەگەرچی تۆ پاش وازهێنانیشت هەر سەرگەرمی ئاشتبوونەوەیان بوویت و پێیانەوە ماندوو بوویت. لە «گەشتی ژیانم» دا شەرعییەتی حیزبایەتی دەدەنە مەکتەبی سیاسی و شەرعییەتی لەوەش فرەوانتریش دەدەنە بارزانی. من ئەمانەم بە دروستی بۆ ناچنەوە سەر یەک... !

لەلایەن شەرعیەتی حیزبایەتی کە من دەیدەم بە مەکتەبی سیاسی شتێک نییە کەیفە بێ چونکە ئەندامانی مەکتەبی سیاسی کاروباری حیزبایەتییان بە هەموو ئەرک و خەتەرەوە ساڵەها بەئەستۆوە گرتووە، مەلا مستەفاش لە ڕووسیا بوو. هەرچی شەرعییەتی لەوە فرەوانترە کە دەکاتەوە شەرعیەتی شۆڕش، هی مەلا مستەفایە چونکە هەرە زۆری خەڵقەکە بە ڕابەرایەتی ئەو ڕازیبوون. دیتیشمان کە مەکتەبی سیاسی لە ساڵی 1964 چەکی هەڵگرت دژی مەلا مستەفا غەیری بەشێک لە ئەندامانی حیزب کەسی ئەوتۆی بەگەڵ نەکەوت، نەشیتوانی چیی ئەوتۆ بەرانبەر مەلا ڕاوەستێ.

دەبێ لێرەدا بڵێم بایی ئەوەی من ئاگادارم جەلال تاڵەبانی بەو کارە ڕازی نەبوو. چونکە خۆی باوەڕی هەبوو بە پێداویستیی ئەو ڕێکەوتنەی 1964 کە ئیبراهیم ئەحمەد دوای هاتنەوەی لە دەرەوە بەیاننامەی «أصلح ام استسلام» ی بڵاوکردەوە دژی ڕێککەوتنەکە و سەری کێشایەوە بۆ ئەو شەڕەی براکوژیی یەکەمجار لەنێوان خەباتکەرانی کورد. مەسەلەی غەدرکردنی مەکتەبی سیاسی و مەلامستەفا لە من جێی سەیرپێهاتن نییە، هەرچەند مەلا

مستەفا تا ڕادەیەک تێیدا دەهێشتەوە. تۆ سەیری هەردوو لا چی بەیەکتر دەکەن... بەداخەوە!!

- دوکانەکەی مامۆستا بەشیر موشیر مەکۆی کوردایەتی و شوێنی پێک گەیشتنی لاوان و خوێندەوارانی ئەو سەردەمەی بەغدا بووە، چۆنە کەوا ڕێک نەکەوتووە بەڕێزتان بچنە ئەوێ و لەو دانیشتنانەدا بەشدار بن؟!

مەسەلەی چوون و نەچوونم بۆ دوکانەکەی خوالێخۆشبووی بەشیر موشیر شتێک نییە بایەخی هەبێ. هەرگیز نەچوومە دوکانەکەی، قەتیش ڕێکنەکەوت لەگەڵ یەکتر بئاخێوین. ڕاستییەکەی مەبەستم نەبوو بچمە جێگەیەک کە لێی نارەحەت دەبم بە دیتنی پیرەمێردێک چایەی بخورێتەوە و بە تەوسەوە قسەی لەگەڵدا بکرێت.

- سەبارەت بە شۆڕشی 11 ی ئەیلوولی 1961 بەڕێزتان ئاوها دەنووسن: ڕاستیەکەی ئەگەر وردبینی لە دیاریکردنی مێژووی ڕووداودا هەبێ، دەبێ سەرەتای شێواوی و ئاژاوە و بگرە و ببەستە لە هەڵسانی مەحموودەوە دەست پێ بکات نەک لە یازدەی ئەیلوول. ئەو ڕۆژە دەستنیشانەی ئەیلوول سەرەتای بزووتنەوەی لەشکر و فڕۆکەکانی حکوومەتە ڕەنگە یەکی حوزەیران لەبار بێت بۆ ئەو مێژووە (ل 404). ئایا ڕۆژی 11 ی ئەیلوول کە سەرەتای شۆڕشێکی مەزنە و بە قوتابخانەیەکی کوردایەتی و سەرەتای دادەنرێت. بەو ڕەنگە بێت شۆڕشەکە سیفەتی مێژووی خۆ هەڵدەگرێت؟

لە بارەی سەرەتای شۆڕشی 11 ی ئەیلوولەوە، وەک نووسیومە بەر لەو ڕۆژە بە ماوەیەک مەحموودی کاکەزیادی حەمەئاغا لە دەشتی کۆیێ ڕاوی لێژنەکانی «اصلاح زراعي» نا و لە قەزا و ناحیەی کردنە دەرەوە. لە پژدەر و ڕانیەوە عەشرەتەکان هێزیان ساز کرد و بە یاریدەی مەحموداغا خەریک بوون بەرەو کۆیێ بێن، تەنانەت هێزی پژدەر گەیشتە دێی بۆسکێن کە سێ کیلۆمەتر لە ڕانیە دوورە. وەک باسم کردووە من کەوتمە نێوان و ئەو

هەرایەم ڕاگرت (بگەڕێوە بۆ گەشتی ژیانم). کە گەڕامەوە بەغدا چەند ڕۆژێکان لەگەڵ لیوا عەبدی وتووێژی سەر بە داخوازیەکانی ئەو ناوچانەمان دەکرد، لەپڕ بێ ئەوەی عەبدی ئاگادار بێت زەعیم بڕیاری دا بە گرتنی سەرۆک عەشرەتەکان. لەو ڕۆژەوە کە درێژەی هەنگاوەکەی مەحموداغای کاکەزیاد بوو، ناوچەکە بوو بە مەیدانی چەکداری عەشایر و سەرپەرشتانی حیزب. ڕۆژی 11 ی ئەیلوول سەرەتای شۆڕش نییە، بەڵکوو سەرەتای حەرەکاتی سوپایە دژی هەڵستانی حیزب و عەشرەتەکان. لەمەشدا چ گرفت نییە چونکە ڕووداوێکە و ڕووداوی دیکەی دژ بە ئەو بەدوا یەکتردا هاتن، هی یەکەمیان ئیرادەی عەشرەتەکان، ئەوجا باوەش پێداگرتنی لەلایەن حیزبەوە. یازدەی ئەیلوول ڕۆژی شانازی پێوەکردنی عەبدولکەریمە و دەخلێکی بەسەر شانازی پێوەکردنی کوردەوە نییە، بەڕاستیش کارەکە لەو ڕۆژەدا هیچی گەشی تێدا نەبوو کورد پێوەی بنازێ، چونکە چەکداری عەشرەتەکان خۆیان پێ ڕاگیر نەکرا بەرانبەر زرێل و فڕۆکەی سپا. ئەگەر حیزب نەبوایە تروسکەی ئومێد نەبوو بە دەوامەی ئاژاوە (با هەر نەڵێین شۆڕش). لەلایەن لایەقبوونی ئەو بزووتنەوەیە بۆ ئەوەی ناوی شۆڕشی لێ بێت هێشتا سەرەتاکەی لە حوزێرانەوە یاخود ئابەوە بێ، شەرافەتمەندترە لەوەی ڕۆژی زەبری سپا و هەڵاتنی خەڵکەکە بە سەرەتا دابندرێت، هێندە هەیە کە ڕۆژی یازدەی ئەیلوول دیار و ناسراوە لە تەقویمدا لە سایەی هونەری هجوومی سپاوە بە پێی ئارەزۆی عەبدولکەریم، ئیتر لەوانەیە بوو هەشتی ئەیلوول یاخود چواری تشرین بێت. بەینێکی مەیلەو تووڵانی بوو ڕێوبان لە دەست مەفرەزەی چەکداری حیزب و عەشرەتەکاندا بوو، حکوومەت لە قەزا و ناحییەکاندا پەککەوتە بوو، ئیتر بۆ دەبێ ئەو دەمە شکۆدارە «شۆڕشبەدەر» بێت؟!

- زیندانیبوونت و چەرمەسەری کێشان و نمەکحەرامی کردن بەرانبەرت، بانگەشە و پرۆپاگاندەی ئەو ناحەزانە پووچەڵ دەکاتەوە کە گوایە لەژێر

سێبەری ناز و نیعمەتی حەسانەوەی بەغدادا توانیوتە وا ڕووبەڕووی کێشەکان ببیتەوە و بنووسیت، ڕاتان لەم بارەیەوە چییە؟!

لەبارەی چی دەگوترێ بە دەوری ژینم لە بەغدا، ئەگەر لە هەر شوێنێکی دیکەشدا بامایە شتێکی وەک ئەوە هەر دەگوترا. کابرای قسەی وەها دەکات بۆ خۆی لەوانەیە چەکی هەڵگرتبێ دژی کورد، پەکی بە هیچ نەکەوتووە، منیش قوڕە چەورەی دەستی کەس نیم بۆ کەیفی ئەو ببزووم. لە نووسینیشمدا ڕوونم کردۆتەوە چۆناوچۆنی بە ناچاری هاتمە بەغدا. لە بەغدا ببم و لە کۆیە لە هەر شوێنێکی قەڵەم و کاغەزی لێ بە چنگ کەوێت هەر ئەوە دەنووسم کە باوەڕم پێی هەیە، ئەگەر نەختێک ئینساف هەبێ، کە زۆر کەمە، دەبوو تێبینی ئەوەم بۆ بکرێ کە سەڕاحەت لە بەغدادا پتر جێی ڕەزامەندیی مرۆی دڵسوز بێت. بەغدا بەلای کەمەوە 300 - 500 هەزار کوردی تێدایە، بگرە پتریش، لە نیوەیان زیاتر دەوری منداڵییان تێپەڕاندووە و گەلێکیان سەروەت و سامانیان پێکەوە ناوە، هەر نەبێ بە نووسەر و هونەرکار و مامۆستای کۆلێج و زانکۆ و مزگەوت و تەکیە و خانەقاوە دوو هەزار کەسێکیان لێ پەیدا بووە. بۆ دەبێ لەو ناوەدا هەر یەخەگیری من ببن و بە چرای گەنەگەرچەک بە دوا عەیب و عارمدا بگەڕێن؟ بەس نەبوو لەساڵی 1978دا بە ڕەسمی تۆمەتی وەهایان وەپاڵ دام کە ئیعدامی بە دواوە بێت؟ هەڵبەت من لە سەرەتای نووسینمەوە بڕیارم داوە گوێ نەدەمە ڕەخنەی چ کەس و لایەنێک، چونکە کوێر و کەڕ و هێڕیش دەزانێ کوردستان دوو حیزبی سەرەکیی تێدا بوو، پارتی و شیوعی، ئەوجا من کە لە کولانەی بەرژەوەندی کوردەوە ڕەخنە لە هەردوویان بگرم تۆ بڵێی بەتەما بووبێتم ڕوتبە و نیشانم بەسەر سینگ و شانانەوە بدوورن؟ لە لێکدانەوەی خۆمدا ڕق هەڵگرتنی ئەو کەسانە لە من بەڵگەی ڕاستبوونی ڕاڕەوەمە، چونکە هاتنە دی بەشێکی لەوەی نووسیومە مێشکۆڵەی ناو ئێسکیان دەکولێنێ، ئەگەر چەند قسەی لەوجرِی بێ سەروپێم کردبایە کەسێک لەوان بەهەندی هەڵنەدەگرت، بەڵام کە من ستالین تاوانبار دەکەم و دوای چەندین ساڵ پاش مەرگی،

حیزبەکەی خۆی تاوانباری دەکات و قەبرەکەی هەڵدەتەکێنێت، مامە کوردەی ستالینپەرست ئاگر لە عومری بەر دەبێت و هەر لە ڕقی مرۆی وەکوو من پتر پێ دادەگرێ لەسەر پەرستنی، لێی موبارەک بێ. بە هەمە حاڵ خۆت لە خۆت و لەو ڕەخنەگرە دڵکرمییە بپرسە: ئەرێ بۆچی ئێمە لەو شوێنەدا دەژین کە تێیدا دەژیین؟ ئەم حیسابە مندالآنەی شەوکوێرانەی گومڕایانەی ئیفلاسکردووانە کالآیەکی پوایەوەیە بە بەر بەژن و بالآی کوردی دواکەوتووی دوو هەزار ساڵییەوە کراوە، هەتا نەشگاتە پلەی ڕۆشنبیری کوتای سەدەی بیستەم هەر دەمێنێتەوە بە شیرمژی ئەفسانەی ناو بێشکەی شکەفتی شانەدەر بە خۆی و ئێسقانی مرۆی نیاندەرتاڵیەوە. هەمزە لە عەباسی چی... لە تەورداسی چی! کابرای گۆرانیبێژی ناو پەندی ئەوتۆیی دەیگوت: حەیران وەرە لەسەری سەفینی چاوەکی کۆرە ئێکی نابینی و دەست لۆ هەناران دەبا هەنجیران دەپسینی...

- وەک هەر بەردەوامیەکی ئەو پرسیارەی سەرێ و لە ئەنجامی نابووتبوونی ئەو خەڵکانەوە و دەرکەوتنی ڕاستییەکان، ئێستا هاتوونەتە سەر بڕوایەکی دیکە و پێت دەڵێن «ڕەجعییەکی زیرەک»، وەرامی ئەمە چۆن دەدەنەوە؟!

لە بەندوباوی «ڕەجعییەکی زیرەک» ماڵیان ئاوا بێ کە نەیانگوتووە خۆفرۆش. ڕەجعی ئەو کەسەیە کە خۆی بە پەتی پووایەوەی ئایدیۆلۆجیای شەختەکردووەوە دەبەستێتەوە. دەتوانم بڵێم و، بێ پەروا بم کە دەڵێم، کەس نابینم لە زیندووان هێندەی من ڕەهای ڕیس و دوای وشکە باوەڕ بێت... سارتەر بە هەموو مەزنایەتی خۆیەوە دەستی دایە فرۆشتنی ڕۆژنامەی پارتی شیوعی چینی، لەو دەمانەدا کە شۆڕشی سەقافی مرۆڤایەتی و مەردایەتی دەشێلا... کەس لە من باوەڕهێناوتر نییە بەو ڕۆژەی شیوعیەت دەبێتە پرۆژەی ژیان و ژیار، بەڵام نەک لە ڕێی شەڕی چینایەتییەوە بەڵکوو لەو ڕێگایەوە کە سوێد و دانمارک تێیرا دەڕۆن... ڕێم نییە ڕێگەی شەرح و تەفسیر بگرم بۆ شیتەڵ کردنی بیروباوەڕم لە بارەی دوارۆژی ئادەمیزادەوە، هەر ئەوەندەی تێدا دەڵێم ڕۆژەک دێت تەکنیک و زانست و کۆمەڵایەتی

وەها ڕێکوپێک و پێشکەوتوو و تەسەل دەبێت کە خانووی حکوومەتی لە خانووی ملْک ئاسوودەتر بێت و پێویست بە ئۆتۆمبیلی خسووسی نەمێنێت و کەفالەتی کۆمەڵایەتی لە هی شەخسی مسۆگەرتر بێت، تا ئەوەی دەترسم منداڵی ناو شووشە لە هی پزدانی دایک بە ڕەواجتر بێ... مرۆ دەگاتە «خێرایی تیشک» و لێشی تێدەپەڕێت، ئەگەر خۆی بە ئاتۆم و ماتۆم بنەبڕ نەکات... مرۆ لە ڕێی سورعەتەوە دەتوانێ بکشێتەوە بۆ ڕابوردوو، بازیش بهاوێژێ بۆ دواڕۆژ و تێیدا بژیت... هەرچی ماددەی سروشت هەیە یەکالا دەبێتەوە بۆ بەر بیلبیلەی کۆمپیوتەری سەد ساڵ و هەزار ساڵ و ملیۆن ساڵی دواڕۆژ... عەقڵ پەککەوتەیە لە تەخمینی فتوحاتی زانست و تەکنیک.

ئەوانەی وەها بە کەودەنی «ڕەجعییەکی زیرەک» دەبزرکێنن نازانن لە تەپڵی بنی چ چاڵێکی قووڵی تاریکدا دەژین و لێشی دەرنایەن. بێگومان ئەوەی بە ڕەجعی دادەنێن گەلێک گەلێک خاوێنترە لەوەی پێی دەڵێن شۆڕشگێڕ، چونکە بەلایانەوە کوشتن و سووتاندن و ڕماندن شەقڵی شۆڕشە. دەبەنگانە گۆرانی بە بەژنوباڵای سۆشیالیزم و کومیونیزمدا هەڵدەڵێن، ناشزانن ئەم باوەڕانە دەبێ لەسەر بنەما و ژێرخان و پاشخانی مێژوویی وکۆمەڵاتییەکی پێشکەوتووی لایەق بەسەدەی بیست و یەکەم چرۆی کردبێ چونکە سۆشیالیزم و کۆمیۆنیزم «نمو - فراژیبوون»ـە نەک کەیف و مجێزە، تۆ دەتوانیت ناوی خۆت بگۆڕیت... دینی خۆت بگۆڕیت... لە پێویستدا نیشتیمان و ڕەگەز بگۆڕیتەوە، بەڵام ناتوانیت لەتەمەنی هەشت ساڵیدا ژن بهێنیت، هەروەک ناتوانیت لە وڵاتی دوواکەوتوودا سۆشیالیست بیت، تەنانەت دیمۆکراسی خۆی بنەما و پەخشان و ژوورخان و تەکنیک و زانست دەیان سندان و قوزەڵقورتی دەوێت، سۆشیالیزم و دیمۆکراسی لووت بەرزن و بەناز و فیزن لەگەڵ پرزۆڵە کوردی عەبابەیلێ و هەڵاتووی بۆ هەندەران دانووی ناکولێ. «تقدمية»یش لە فیکەی سمێڵەوە زەنە ناکات.

بۆ خۆت دەبینیت بەرەی پێشکەوتووی ئەفغان و کورد چ بە خۆیان دەکەن. دەبێ خۆت لەگەڵ خۆتدا خەریکی لێکدانەوە و بەراورد کردن و پێکگرتن و

هەڵگێڕ و وەرگێڕی سەرلەبەرەی مێژوو وکۆمەڵایەتی بیت... و بیت... و بیت بەدەم تەجرەبەوەش تەعدیلات لە تازە باوەڕەکانت بکەیت، ئەوجا بەخێر لە تەمەنێکی کامڵدا بگەیتە پلەیەک لە ڕوونبینی (نەک گەشبینی) کە بتوانیت لە کیفی کۆنەپەرستی و ئەفسانپەرستی و ستالینپەرستی و «تقدمیة»ی پاڵەوانپفانە ڕەها بیت، ئەوساش ئەگەر باری گشتی گەل و وڵاتت لەبار نەبێ هەر دەمێنێتەوە بۆ حەسرەت و خەفەت... دوور لە تۆ ئێستاش دەرمانی ئەو خەفەتە هەر نەزانینە بەپێی پەندی «نازانم ڕاحەتی جانم».

هەموو ئەو تاقمانەی لە ماوەی 50 ـ 60 ساڵی ڕابوردوودا بەش بەحاڵی خۆیان لە ڕێی هەڵپەی بێبەرەوە برینیان خستۆتە لەشی میللەتانەوە، بێ ئەوەی پرسێکی پێ بکەن، باغربوون بەو پاڵەوانەتییەی بردنی بۆ بەندیخانە و خەڵکیشی تێدا زەدە بوو... دیسانەوە دەرفەت نییە ئەم تێبینیە ڕوون بکەمەوە، بە ناچاری واز لە شریتەی ئەم قسانە دێنم.

- ئەو چەند جارەی بە دیداری سەفیری ئەمەریکی و نوێنەرەکانیان گەیشتوون لەمەڕ دۆزی کوردەوە، پێ دەچێت ئەنجامێکی بەرچاو و دروستی نەبووبێت، هۆی چییە؟!

لەبارەی نەبوونی سوود لە چاوپێکەوتنم و دیتنی سەفیر و بەرپرسانی ئەمەریکا. بە کورتی و بە کوردی و بەوپەڕی سەرڕاحەتەوە، دەرچوو لە بەرنامەی ئەمەریکادا نەبوو دۆستانە تێکەڵ بە کێشەی مەسەلەی کورد بێت، چونکە ئەوسا هەرچی بەرژەوەندێکی هەیبوو لەم ڕۆژهەڵاتەی نزیکدا بەسترابۆوە بەو حکوومەتانەی خاکی کوردیان لە دەستدایە، کوردیش چەندی بووبێت و لە پاڵەوانەتی گەیشتبێتە ڕۆستەمی زاڵ، هەرگیز بایی ئەوە ناکات ئەمەریکا سیاسەتی خۆی بۆ ئازایەتی و ڕەشایی چاوی مامە کوردی پڕزۆڵی بێدەرەتان زەدە بکات. من لە حەفتاکان، 1972 یاخود 1973، پرسێکم لە هەندێ کاربەدەستانی سەربە مەلا موستەفا کرد ئایا ئێوە بوون بە (رقم)ێکی

بنەڕەتی لە هەقوحسێبی ئەمەریکا؟ لە وەرامدا گوتیان: بەڵێ لە حیسابی هەمیشەیی ئەمەریکادایین. گوتم کەواتە پشتی لێ بکەنەوە و ئاسوودەبن. چونکە ئەگەر وەها بایە، ئەمەریکایەکی تاکە هێزی کاریگەر بێ لەو وڵاتانەی تێیدا دەژین و شێخولکێکی خەلیج بە سەرۆک دەوڵەت ڕاست بکاتەوە و ئیسرائیل بەسەر دنیادا بسەپێنێ، بە ئاسانی دەتوانێ پارێزگاری لە کوردێک بکات کە سوودی ئەمەریکای تێدابێ. بەڵام دەرکەوت بەسەهوودا چووبوون و ماشەیەک بوون، بەداخەوە، کیسنجەر پۆلووی پێ دەرهێنان لە بری ماشە. لە مامۆستا جەلال تاڵەبانیشم بیست، کیسنجەر پەشیمانیی خۆی لای ئەو دەربڕیوە لەوەی بەرانبەر کورد کرا. ڕاستییەکەشی ئەو تەرزە بەڵێنی درۆ نەک لە زەبەللاحێکی وەکوو ئەمەریکا بەڵکە لە سعوودیەش هەر بە عەیب لە قەڵەم دەدرێت مەگەر لەوپەڕی هەرە ئەوپەڕی ناچارییەکی لە حەدبەدەرەوە... سیاسەت پیشەیەکی گڵاوە، لە کاری مەیموون دەکات، هەر بۆیەش بوو تێکەڵیم لەگەڵ سیاسەت قووڵ نەبوو، نەکا بەرپرسی کاری ناڕەوا ببم. چی لە منەوە بیروڕا دەربارەی سیاسەت بیسترابێ و خوێندرابێتەوە لە گۆشەی «فکری»ەوە بووە، هیچ شتێکیشم لە بواری سیاسەت ئەنجام نەداوە زەرەری بە کەس گەیاندبێت، ئەگەر نەڵێم هەمووی بەرژەوەندی خەڵقی خوای تێدا بووە، تەنها یەک تورکمانی کەرکووکی لە وەزیفە مەغدوور بوو بەهۆی سەهووی منەوە، ئیستاش خەفەتی لێ دەخۆم. دەسا بە هەرچی پاک و پیرۆزە سوێند دەخۆم، هەڵوەستم بەرانبەر کۆمیونیزم و مارکسیزم لە ڕووی پەرۆشمەوە بۆ «ئادەمیزاد» بووە (لە بەرایی هەمووانەوە: کورد) کە باوەڕ دەکەم هەڵەی کوشندە هەیە لە بۆچوونەکانی مارکس. مێژووش ئەوە نییە مارکس قۆناغەکانی لە ڕێی جۆری گوزەران و بژێوەوە هەڵناوە کە من پێی دەڵێم «تفسير عضلي» کە دەبوو لە ڕێی مرۆ خۆیەوە بە هەموو خەسڵەتی چاک و بەدیەوە و بە ڕێنموونیی «هۆش = عقل» تەفسیری کۆمەڵایەتی و مێژوو بکرێت «کۆمەڵایەتی خۆی مێژووە. ئەم دەمەی قەڵەمم لەسەر کاغەز

دەگێڕم خۆیەتی دەبێتەوە مێژوو». لێرەشدا ناچارم قسە کورت کەمەوە. سەیرێکی «التفسير البشري للتأريخ» بکە.

- دەکرێ ئاماژەیەکی ئەوە بکەن، بۆچی بەشی زۆری نووسینەکانتان بە عەرەبییەکی دژوار بڵاودەکەنەوە؟

لەبارەی توندی و سەختیی نووسینی عەرەبیمەوە قسەم زۆرن، لێیان کورت دەکەمەوە. دەبێ لەبەرایی هەموو شتێکدا لێت سوور بێ کە ئەوەی من لە عێراقی ئەو 20-30 ساڵەدا نووسیومە و بڵاویش بۆتەوە لە ڕاپەڕموونی منەوە نەبێ لە تەما و ئومێدی هیچ کەسێکدا نەبووە. منیش گەلێک هۆی پێشخەر و هاندەر و هیممەتبزوێن و باوەڕ بە خۆهێن کە هێندێکیان میراتی و هێندێکیشیان زاتی و بەشێکیشیان پاشخانی سەقافیم بووە، ڕێگەی سەخت و ئەستەنگی لێ خۆش هێناوم... بەر لەهەموو شتێک بڕیارم دا کۆمە نەکەم لە هیچ لەمپەڕێک و تەماشم نەبێ بەماڵی دنیا و ئاسوودەیی... لە لایەن تەعبیری سەخت و سەرڕەقی نووسینی عەرەبیمەوە چەند هۆیەک وێکرا ئەو بوارەی هێنایە بەر هەنگاوی قەڵەم:

یەکەمیان گرنگی و هەستیاریی بابەتی نووسینەکانم بوو کە لە دەمی دەسەڵاتی شوعییەت و حوکمڕانیی عەبدولکەریم قاسمدا ئەو هەموو سەراحەتەی من بە زمانێکی پاڵاوتەی بژاردەی نومرە «ممتاز» نەبێ مومکین نەبوو ڕێی بڵاوبوونەوەی و بەردەوامبوونی بۆ بکرێتەوە. لایەنی مەتانەت و هێزی نووسینەکان و قەشەنگیی تەعبیر پاسپۆرتی بێ دەمەتەقەی هێرشە بێوچانەکەی سەر دیکتاتۆرایەتیم بوون... هەر ئەو شێوازە دەگمەنە بوو سەرجەمی ئەدیب و مامۆستاکانی عەرەبی عێراقی هێنایە سەر دانهێنانی پاتەوپات و بێ زمان گرتن بە ڕابەرایەتیی ئەو نووسینانە... وا بە ڕاشکاوی لەقەبی «مفكر» بۆ کاکە مسعوود ڕەوا دەبینن... تەوازوعێک لەو مامۆستایانەوە بۆ منی بێدەسەڵات دە جاران پارسەنگی هێرشە نامەردەکەی

بەرەی چەپ دژی ڕاستییە بێفێڵەکەی ڕاوێژم دەداتەوە... ئەوەی تۆ بۆ منت نووسیوە کە شانازیی پێوە دەکەم ناو ناوە لە ئەدیبی عەرەبیش پێم دەگات... ئەوەت وەها!!

هۆی دووەم ئەوەیە کە ئەدیبی میسری تۆفیق ئەلحەکیم پێی دەڵێ «ادب تعالی» مەبەستیشی لێی لەنگەری نێوان ڕوخسار و ناوەڕۆک (شێواز و مادەی نووسین) لە ڕووی هێز و پێز و قەشەنگییەوەیە کە ناشێ قاڵبی لاواز فکری خەست بە خۆیەوە بگرێت... خۆم کە دێم هەندێ شوێنی ئەو نووسینانە دەخوێنمەوە شاگەشکە دەمگرێت. ناڵێی من نووسیومە. لە نموونەدا ئەم چەند ڕستەیەی شوێنێکی «من هموم الحیاة»ت نیشان دەدەم لە زەمینەی پێداویستیی پووچاندنەوەی «باطل»ی زۆردار دەڵێم «... ذلک ان خلو التأریخ من قولة «لا» تلقاء الباطل المستفحل تعطیل لنصف قوة الحق في طلب الکمال لأن دحض الباطل نصف المسافة الی تمام البرهان.» واتە، ئەگەر «باطل»ی دڕ نەپووچێنیەوە و بەڵگەکانی بە درۆ نەخەیتەوە نیوەی هێزی «حق»ت پەکخستووە چونکە پووچاندنەوەی باتڵ بڕینی نیوەی ڕێگایە بەرەو بەدەستەوەدانی بەڵگەکانی... (دیارە لێرەدا نیوەی بەڵگەکان ئەوەیە کە «حق» لە چەسپاندنی داواکانی خۆی دەیانخاتە ڕوو). ئەم دوو دێڕە فەرقێکی نییە لەگەڵ وێنە یاخود پەیکەری هونەراوی کە لێ زیاد کردن و کەم کردنەوە نرخی پێوە ناهێڵێ... بەڵام سەیر لەوەدایە ئەو هەموو سەدان ملیۆنی نیوەخوێندوو بوون بە سەربازی خۆبەختکەری مارکسیزم ناشزانن مارکس وەیا لینین چ دەڵێن... مسڵمانەکان لەیەک دێڕی قورئان و حەدیسی پێغەمبەر تێناگەن، کەچی خۆیانی بۆ دەکوژن... ڕەشوڕووتی بێئەژمار بەدوا بانگەوازێک دەکەون لە کدوولەی تەڕیشدا بە هیچ ئامانجێکیان ناگەیەنێ...

هۆی سێیەم: من کە لە سەرەتاوە دەستبەرداری حیزب دانان بووم. وێڕای هۆی جوراوجۆر، ئەوەبوو کە دڵم هەرگیز نەیدەهێنا خەڵک بەرەو مەترسیی ماڵکاولی و مەرگەوە ڕاپێچەک بدەم بێ ئەوەی بتوانم دەستی یارمەتییان بۆ درێژ بکەم و هیچ ئومێدێکی نیمچە نادیاریش لەئاسۆی دیارەوە ناترسکێتەوە

مۆژدەی بەفیرۆنەچوونی ماڵکاولی و قوربانیدانی لێوە بخوێندرێتەوە. ئەوجا لەو ڕاستییەش تێبفکرە کە من حیزبم دانابایە نە دەشیا لەبەر سێبەری حەسانەوە و کوولەری هاوینەدا گوتاری گەوهەراوی بنووسم ئوممەتی کوردی پێ بهێنمە سەر ڕێی هیدایەت، دەبوو لەپاڵ گرد و بن سێبەری تەڕاشێک سەرەتاتکە لە پۆلیس و لەشکری حکوومەت و لە ناحەزانی کوردی چەپ و ڕاست بکەم بەڵکە لە گوللەیان ڕزگاربم. بەرگەکانی حاجی قادر و چەپکەکەی گوڵزاری نالیش دەبوونە بەرهەمی حەسانەوەی دوای مردنم، چونکە بە زیندووەتی بۆم نەدەنووسران... من لە سەرەتاوە بڕیارم دا ڕووی وتووێژم لەگەڵ ڕیزی هەرە هەرە پێشەوەی ڕۆشنبیر و خاوەندەسەڵاتی سیاسی بێت. بە کورتی ئەو کەسانەی هەم لە فکری خەست تێدەگەن هەم لە دەستیان دێت ئەگەر باوەڕ بە قسەکانم بکەن لەوانەوە چاکەیەک بە ڕەش و ڕووت و هەژار و نەداری ئادەمیزاد بگات. ئاپۆرەی خوێندەواری شلک و خەڵقی کوچە و بازاڕ ئەگەر بشخوێننەوە (کە زۆربەیان خوێندەوار نین) باشترە بۆ خۆیان و خەڵقیش کە هەر تێینەگەن چونکە بێگومان تێگەیشتنیان بەرەواژ دەبێت... خوێندەواری خاوەن شەهادەی بەرزی ئەورووپا بە گەشەی ڕوویەوە ڕەزامەندیی خۆی لە نووسینێکم دەردەبڕی کە گۆیا فڵانە شەکرم شکاندووە، فیسار مەتەڵی فیکریم هەڵێناوە. پێم گوت فڵان، چی تێی گەیشتووی ئاوەژووی بکەوە ئەوجا ئەوە دەردەچێ کە گوتوومە... نووسینەکەشم کوردی بوو.!

بە هەمە حاڵ باوەڕی تەواوم هەیە بەو ڕێبازەی گرتمە بەر لە شێواز و داڕشتنی نووسینم بە تایبەتی کە من لە بەغدایەکی عەرەب دەژیم و بەشێکی نووسینم بە عەرەبییە بۆ عەرەب و غەیری عەرەب دەخرێتە مەیدانی فکرەوە. ئەو قەڵەمەی کە خستمە پەنجەکانمەوە و گەرمای دەروونمی خستە سەر کاغەز لە ڕێی ئەو شێوازە و ئەو لوغەتەوە پلەیەکی پێپلکەی ڕێزی بۆ ڕەوا دیترا کە هیچ پلەی تر لە ژووریەوە نییە تا ئەوەی لە زۆر جاروباردا خەجاڵەتی دەکێشم لەو موجامەلەیەی لەگەڵم دەکرێت... هەروەک لە پیکاسۆ

بەعەیب ناگیرێ تابلۆکانی بەلای زۆربەی هەرە هەرە زۆری ئادەمیزاد نامەفهوومە، عەیبیش لە نووسینی من ناگیرێ یاخود نابێ بگیرێ کە سەخت و خەستوخۆڵە... باوەڕ بکە ئەگەر هاتبامایە نووسینەکەم شل کردبایەوە وەک کە ماستاوی خەست بە زێدە ئاو بێتام دەکرێ ئەویش وەهای لێ بەسەر دەهات. هەر ئەم شەوە (کە ئێستا سەعات 8:30 ی ڕۆژی سێ شەممەی 11ـ10ـ1994ـە برادەرێکی زۆر بەڕێز و قەدرزان بە تەلەفۆن تێی گەیاندم کە ئەڵقەی نووسینێکی حەفتانەم بەر لە پانزە ڕۆژ دەرچووبوو، ناسیاوەکانی خۆی بە فۆتۆ نوسخەی لەسەر دەگرنەوە چونکە لەم ڕۆژانەدا جەریدە هێندە ژمارەی لێ دەرناچێ هەموو کەس دەستی بکەوێت، ئەوجا ئەگەر هەر ڕاستە فکری ساردوسڕم بۆ لە پەرداغی ڕۆژنامە کردبانایە ئەوسا بێگومان وەک ماستاوی زگاو لێی دەبێزان... بۆچی سەرمەشقی خەتخۆش و ڕازایەوە سەد هێندە نا بگرە هەزار هێندەی خەتی عادەتی نرخی بۆ دادەندرێت، خۆ ئامۆژگاریی ناو نووسینەکە لەوانەیە یەک شت بن. خەڵکەکە جوانیی خەتەکە دەکرن نەک بەندی «چاک بکە، خراو مەکە... ».

لە ڕۆژنامەی «العراق» بۆیان گێڕامەوە گوتیان کە گوتاری «تحاور الخواطر في غمرات موت السجادی»م دەرچوو شەوی ڕۆژی دووەمی دەرچوونی، کاربەدەستێکی سەفارەتی ڕووسی هاتبوو دانەیەک لەو ژمارەیە بکڕێت بەڵام هیچ دانەی لێ نەمابۆوە تەنها دانەی ئەرشیف نەبێت. کابرا لەبەر ئەو دانەیە سەرلەبەری گوتارەکەی دەسنووس کردبوو، دوای نیوەشەو لێی ببۆوە... تۆ بڵێی ئەگەر بە شێوازێکی عادەتیی مەیلەو بازاڕی نووسرابایە چ ئیمکان هەبوو سەفارەتێک ئەو زەحمەتە بکێشێت! هەر نەبێ کە گوتارەکە هیچ پێوەندییەکی بە سیاسەت و ئابوورییەوە نەبوو! هەر لەوان ڕۆژانەدا نەجەفی و کەربەلایی کە بایەخ بە ئەدەب دەدەن دیاریی خۆشکەڵەیان بۆ ناردم، داواشیان لە «العراق» کرد گوتارەکە جارێکی دیکەش بڵاوبکاتەوە... ئەمانە و لەمانەش بەرەژوورتر نموونە هەن مەسەلەی سەختیی تەعبیرم بە عەرەبی نەک هەر تەزکیە بکات بگرە بە فەرمان لە گەردەنمی بئاڵێنێ. من درێژە بەو قسانە

دەدەم هەم لە ڕووی تێخوێندنەوەی سوودێکی کە تێیاندا هەیە، هەم لە ڕووی دڵنیاییم کە لێیان وەڕس نابێت، تا ڕادەیەکیش لە نزیکترەوە تێم دەگەیت یان باشتر دەمناسیت هەر چەند قسەی ڕاڕەوی وەک ئەمانەی دەیاننووسم هەرگیز ناتوانێ نوێنەری لایەنە «هەرە تایبەت بە خۆم» بێت کە بەندن بەو باوەڕە سەر لەبەر و بێکەلەبەرەی بەرانبەر حەقیقەتی «بوونەوەر= وجود»م هەیە. من لە گۆشەی گۆشەگیریی پڕ تەوازوعمەوە لە ماوەی 40 - 50 ساڵدا، خەریتەیەکی هەمەگیری جیهانی ماددی و حەیوانی و ئینسانیم پێکهێناوە کە هیچ یەکێک لە ناوەڕۆکەکانی جێگە بە جیرانی دوور و نزیکەکەی لەق ناکات... بەڵێ، بەتاڵایی شتی نەزانراو لەو خەریتەیەدا هەیە، پان و بەرینیش، بەڵام بە بەریانەوە هەیە جێگەی هەموو ڕاستییەکی تازە دۆزراوەی زانستی سەردەم لەو خەریتەیەدا بکەنەوە و بایی خۆیان لەو بەتاڵاییەدا پڕ بکەنەوە. وەها بووە شتێکی تازە بابەت «نیسبەت بە خۆم» لەگەڵ ناوەڕۆکێکی ئەو خەریتەیە ڕێک نەهاتووە ئیتر دە ساڵ، پانزدە ساڵ پێیەوە ناڕاحەت بووم هەتا بە جۆرێک لە جۆرەکان تەگەرەکە ڕەویوەتەوە... چەندی لەم و لەوم پرسی، کە هێندێکیان ئەمەریکاییش بوون، بۆچی هیندییە سوورەکان لە ئەمەریکای باشوور و هەتا دەگاتە سنووری U. S. Aی ئیستاکە حکوومەت و شاریان هەبوو لەگەڵ ئەوروپییانیش وردە وردە تێکەڵییان پەیدا کرد تا بەرەی «نزنتم هضئق» کە دووڕەگەن، بەشێکی بەرجەستی دانیشتووەکانی ئەو وڵاتانە پێک دەهێنێت، کەچی هیندیی سووری دانیشتووی وڵاتە سازگارەکەی U. S. A و کەنەدا نە لە پەراوێزی قەبیلە تێیانپەڕاند و نە شاریان دروست کرد و نە توانیشیان لەگەڵ ئەورووپایی ڕێک بکەون، هەرگیزاو هەرگیز وەڵامێکم وەرنەگرتەوە... سەیر لەوەدایە تاکێکیشیان بەر لە پرسیارەکەی من هەر بیری لێ نەکردبۆوە. یەک لەوانە، مامۆستایەکی عێراقی، کە حەفت ساڵ بوو لە زانکۆیەکی کالیفۆرنیا دەرسی دەگوتەوە گوتی بڕوا بکە ئەمە یەکەم جارە شتی ئەوتۆیی بە بەرگوێم دەکەوێ... هەرچۆنێک بێت سەختیی تەعبیر و وەتەنگ هاتنم لە بێ سەرچاوەیی و لە باری

خەفەکەری وەک ئێستاکەی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست با هەموو لەو ناوە جینگڵ بخۆن، خوام دەکرد لە خەفەتان شەقیان دەبرد...

من لە تەبیاتمدا ئەسیری چەند بنەمایەکی بنەڕەتیم و لەو بیروڕایەی بە نیازی هێنانی قەناعەتی بیسەر و خوێنەر وەدەریان دەنێم. یەکەمیان دەستخاوێنی و نیازپاکیی «مطلق». دووەمیان ڕوونکردنەوەی بابەت تا ڕادەی کوشتنی کرمی گومان لە دڵی مرۆی حەقسەلمێندا. سێیەمیان تێخوێندنەوەی عوزری کەسانێکی بە نیازی پاکەوە هەڵە دەکەن و بەسەر خۆیانیدا دەسەپێنن و بۆی دەبن بە دەروێش بە مەرجێک زۆر لەخەڵق نەکەن بە زەبری کوتەک یان چاو زەق لێ کردنەوە هەست و نەستیان بخەسێنن تا ئەوەی لە ئاست ئەو دەستدرێژییەدا گوتوومە و نووسیومە، مرۆ بە ئازادی هەڵە بکات بە شەرەفترە لەوەی بکرێتە عەبدی سوخرەکێشی حەقیقەت، لە هەموو حاڵانیشدا مەرجی ئەساسی ئەوەیە کەس هەڵە و ڕاستی خۆی نەکاتە کۆت و زنجیری گەردن و دەروونی کەس... .

- لە «گەشتی ژیانم»دا باستان لە دانانی حیزب کردووە، ئایا پێتان باش نەبوو خاوەنی حیزبێک بوونایە و ڕاو بۆچوون و ڕێبازی خۆتان پیادە بکردایە؟! ئاکامی مێژووی کوردتان بە هەوارێکی تر بڕەسانایە؟ کەمتەرخەمی لەم بوارەدا جێی گلەیی ی مێژوو نابێت بە لاتانەوە؟!

لەبارەی هەڵوەستم بەرانبەر پارتی لە ساڵی 1960 حیکایەت درێژ و بە سفتوسۆیە، لە نامە جێگای نابێتەوە، بەڵام لەلایەن خۆنەدانە دەست بۆ هەڵنانی حیزبێکی سەر بە قەومایەتی لەو سەردەمانەدا بە دڵنیاییەوە دەڵێم ڕێبازێکی گرتمە بەر بۆ دەربڕینی بیروڕای هەمە چەشنەی کە هەمبوون گەلێک پتر خزمەتی کوردایەتی و مرۆڤایەتیی دەکرد لەوەی کەشمەکەشی حیزبایەتی بمدزێتەوە بۆ شەڕەدندووکێی نەزۆکی بینبڕکێی سیاسی کە دەزانم و دەمزانی سەر بە هیچ ئامانجێکی ڕوونەوە نابێت...

بەڵێ ئەگەر باری سیاسی عیراق و ڕۆژهەلاتی ناوەڕاست دەرفەتی خەباتێکی ژیرانە و هێمنانە و دیمۆکراتانەی دابایە وەک لە وڵاتانی ڕۆژاوادا دەدیترێت و دەکرێت بێگومان ڕێی تێ دەچوو یەکێکی وەک منی دوور لە تاوگیری و تیژڕۆیی لە ڕێی حیزبێکەوە باوەڕی خۆی بە خەڵک ڕابگەیەنێ ئاسانتر و چالاکانەتر و کاریگەرانەتر بتوانێ سەنجڕاکێش بێ... من خۆم دەناسم، بۆ کام چشت دەست دەدەم و لە کام بوارەوە بەرهەمهێن دەبم و بە چیدا بیر و هۆشم نەزۆک دەبێ... بڕوات ببێ ئەگەر ڕێبازی حیزب حیزبێنەم گرتبایە هەرگیز ئەوە نەدەبووم نازدارێکی وەکوو تۆ یەک ڕۆژ لە عومری خۆی، نەک دە ساڵ، بخاتە سەر عومرم...

من لە حاڵی ئێستاکەمدا خۆم بە وشکهەڵاتوو دەزانم لەچاو مەسعوود محەمەدێکی ئەورووپانشین بایە... من نەمتوانیوە زمان بگێڕم لەو بابەتە ورد و قووڵانەی کە بە دەوری پرسیارە بنەڕەتییەکانی «هەبوون - کینونە - أبد - مطلق... » هەڵدێن، تەنانەت لەو بەغدایە و عیراقەی تێیدا دەژیم دەستم ناگاتە هیچ سەرچاوەیەکی زانستیی ئەوتۆ وەرامی تاکە یەک پرسیارم بداتەوە لەوانەی گیانم دەورووژێنن. دەروونم دەهاڕن. هانام بردە بەر ئەو لایەنانەی پێوەندییان بە بزووتنەوەی زانستی و ڕۆشنبیریی جیهانەوە هەیە بەڵکە تێدەگەم ئایا لەو پرسیارانەی منیان خەریک کردووە و لێیان بە کۆتایی ناگەم (چەند نموونەیەکم خستە ڕوو) چی دەڵێن و چۆناوچۆنی لێی دەرباز دەبن؟ دەرچوو ئەو خەڵکەی من یارمەتیم لێ داواکردن پڕ بە دەم گوتیان: ئێمە نەک هەر نەماندیتووە چی لە بارەیانەوە گوتراوە بگرە بەر لەو قسانەی تۆ هەر خەیاڵیشمان بۆی نەچووە! ئەگەر بۆت باس بکەم کە کەوتمە سەر نووسینی «تأبينية»ی عەبدولمەجید لوتفی و سەرەتایەکم بەم جۆرە دەستپێکرد: انطلقت الطبيعة من رحم الأزل، چۆناوچۆنی تارمایی مەلایێکم بەرانبەر خۆم قوت کردەوە لە زاری ئەوەوە ڕەخنەم گرت لەوەدا کە ئەم سەرەتایە ڕوو لە کفر و شرک دەکات کە ماددە بە «قديم» دادەنێت و دەیکا بە ئەزەلی، ئەوجا چۆن کەوتمە سەرباری پووچاندنەوەی ڕەخنەکە تا

گەیاندمە نەبوونی فەرقێک لە نێوان کۆنی و تازەیی جیهاندا... بڕوام پێ بکە لەو درەنگە کاتەی شەودا کە من دەوری سەعات یەکی پاش نیوەشەو دەستم دایە قەڵەم تێهەڵکشێم بەرەو جیهانێکی سنووربەدەری « (مادە و فکرة» تا گەیشتمە ئەو شوێنەی لێیەوە دوایین باز دەهاوێم بۆ بڕینی مەودای جوداوازیی نێوان «قدم و حدوث» و دەگەم بە یەکسانبوونیان ئا لەوێدا وەستام، چونکە لە فەرهەنگی زماندا ئەو وشانە نین تەعبیر لەو بارە خز و تەماوییەی نێوان خەون و حەقیقەت بداتەوە. ڕەنگ بوو ئەگەر شارەزای ڕیازیاتی بەرز بوومایە وەیا پەیم بە فەلسەفەی فیزیا بردبایە توانیبام، گۆران گوتەنی «هەر چەند دەکەم ئەو خەیاڵەی پێی مەستم» و تێیدا وەستا، من پێی وێرابامایە... فکرەکە لام مەوجوودە بەڵام کەرستەی تەعبیر نامەوجوودە... بەر لە بیست و ئەوەندە ساڵە نووسینی «هاریت دیملر» ناوێکم خوێندەوە لە قاڵبی چیرۆکدا لە دەوری «جنس»ی بێپەردە هەڵدێت و ناوناوە وشە دادەڕێژێت کە پێشتر نەگوتراوە، منیش لە باری ئێستاکەمدا نیازمەندی ئەو جۆرە وشە دارشتنەم بۆ خۆ ڕوونکردنەوە... بە کورتی من لە دەوروبەرێکی تەنگەتاودا دەژیم کە دەرفەت نادا لە ژوورەکەی خۆم بە دەم وەنەوزی سەرەتای خەوی دمەو بەیانییەوە، بێ هەڕەشەی پۆلیس و ئیخبارییەی چوغلای، بتوانم کەف و کوڵی دەروونە ئاخناوەکەم بڕێژمە سەر کاغەز... من تا ئێستا قووڵایی تێفکرین و گڕوگاڵی هۆشی ونم لە دەروونمدا پەنگ خواردوو ماوەتەوە ناشزانم چۆناوچۆنی وەک مەلۆتکە لە پزدانی ئاوس بەردەبێتەوە وەیا وەک تەڕەشقۆی زەنەک دەدەڵێنی یا هەر لە شوێنی نادیاری خۆیدا مردەزاد دەبێ... زۆریش لێی بە پەرۆشم...

- بۆچی هەرا و قەومانی ناوبراو بە «وثبة - 1948» وا بەقووڵی لە ناخ و نووسینەکانتدا چەسپێوە و دەردەکەوێت؟!

لەبارەی ڕاپەڕینەکەی 1948 کە پێی گوترا «وثبة» و تین و تاوی لە ناخی مندا… ئەم وەسبەیە یەکەم هەل بوو کە برا شیوعییەکان خۆیانیان تێدا ڕوون کردەوە بۆ بەر چاوی بینەران. ئەو ڕۆژەی دوای وەسبە هەموو شاری کۆیێ نمایشی کرد… یەک لەو شیوعییانە بە ئاشکرا و دەنگی دلێرەوە بەو خەڵقوڵڵایەی ڕاگەیاند کە پارە و پوولێکی بۆ مەهابادی قازی محەمەد دەچوو لە دەمی سەرۆکایەتیی قازیدا دەستەودایەرەی حکوومەتەکەی بۆ خۆیانیان دەدزییەوە… ئەم شیوعییە لەوێ، لە مەهاباد، دەرکرابوو، یانی خۆی بێرێز کردبوو، بە گێرەشێوێنیی چەپرۆیانە… تازە مەهاباد گەرمەبرینە بە دەست تارانەوە، کاکی شیوعی خەنجەر لە تەرمی قازی و هەڤاڵەکانی دەدات، بەگەشەگەشی ڕوویەوە… دەمی نیوەڕۆ یەکێک لە بەرپرسیارە گەورەکانی پارتی داوای کرد خەڵقەکە بڵاوەی لێ بکات (دیار بوو پەرگیریی چەپ حەزی لێ بوو شێواوی پەیدا بێ) یەکێک لە شیوعییەکانی (کە دواتر بوو بە مەئموور، گڵاوترین بەرتیلخۆر دەرچوو) فرتکی بەست بۆ سەر بەرزاییەک و گوتی چۆن بڵاوەی لێ بکەین، کەر گیای هەیە دەیخوا ئێوە گیاشتان نییە بیخۆن. هەتا خوێن نەڕژێ بڵاوەی لێ ناکرێ… ! نازانم خوێنی کێی دەرشت لەو هەزاران کەسەی نێر و مێ، پیر و گەنج… مەلا و شێخ و حاجی و ئاغا و توجار و بازرگان و عەمەلە و ناعەمەلە کە بەشداریی گەرم و گوڕیان لەو نمایشتە دەکرد… ئەو ڕۆژە بەپێی شیتەڵکردنی مارکسیستانە، دیار بوو گەیشتبوونە ئەو باوەڕەی خۆ دەرخستن و ترساندن هەنگاوێکی پێویستە بۆ زاڵبوون بەسەر جەماوەردا و کپکردنی دەنگی غەیری خۆیان… من لەو ڕۆژەوە خەتی جوداییم لە نێوان خۆم و ئەو جۆرە بەرنامەیە و فکری وەها پسۆک کێشا. لە نموونەی وتووێژم لەگەڵ ئەوانە و خەڵقی دیکەش دەربارەی بمرێ سەرمایەدار ئەم نموونەیەت دەهێنمە بەر چاو. لەو ڕۆژانەدا ڕۆژنامەکان بڵاویان کردبۆوە کە عیمارەتی Empire state ی نیویۆرک لە هەڕاجدایە بۆ فرۆشتن. نرخەکەی بە چل ملیۆن دینارێکی عیراقی ئەو سەردەمە دەقرسێندرا، کە دەیکردە دووسەد ملیۆن دۆلار. بەو خەڵقەی شیوعی و

ناشیوعیم گوت: سەرمایە لە کوردستان پەیدا نەبووە تا سەرمایەداری بڕمێت. وا لە نیۆیۆرک عیمارەتێک بە چل ملیۆن دینار لە فرۆشتندایە... شاری کۆیە بە خانوو و بە دوکانەکانیەوە دەوری 1500 ڕەقەمی هەیە من کردمە دوو هەزار. هەر ڕەقەمە بە تێکڕایی دووسەد دینار ناهێنێ من کردمە هەزار دینار، سەرلەبەری کۆیە بە دوو ملیۆن دینار دەفرۆشرێت. ژمارەی گوندەکانی قەزای کۆیە 160 گوندە، تیکڕای هەر گوندە لە پێنج هەزار دینار نرخ تێپەڕ ناکات، من کردمە بە دە هەزار، و سەرجەمی دەگاتە 1,6 ملیۆن دینار و ئەویشم کردە سێ ملیۆن. سەرلەبەری شار و لادێی قەزا سیهەزار کەسە، خوێنی مرۆ کە دەکوژرێ بە سێسەد دینار یان شتێک زیاد دادەنرێ، هەمووی دەکاتە نۆ ملیۆن دینار ئەویشم کردە پازدە ملیۆن... سەرلەبەری مەڕومالْ و ئاژەڵ و پەڕەووڵی قەزاکە بفرۆشیت دوو ملیۆن دینار ناکات، من کردمە چوار ملیۆن. بەو پێیە و «حساب الفرح»یەوە هەموو قەزای کۆیێ بە مرۆ و نامرۆ و تەڕ و وشک، شار و دێیەوە 24 ملیۆن دینار دەگرێتەوە، کە ناکات نیو هێندەی نرخی عیمارەتێکی وڵاتی سەرمایەدار. پێمناڵێن چ دەرمێنن؟ کوا سەرمایە؟ کێ سەرمایەدارە؟ ئەو دەمە تاکە یەک کۆیی نەبوو ئۆتۆمۆبیلی خصوصیی هەبێت... یەک تاکە کەس نەبوو خانووی نوێبابەتی هەبێت! توجارەکان لە قەیسەریی نوێ بە جگێنە ڕایاندەبوارد... نەهامەتیی تووتن دوای حەرب و تێکچوونی حوکمی مەهاباد ئەو خەڵقەی وەکوو پەپوولە هەڵوەراند... قەبرستانی منداڵی لە برسان و بە مەلاریا مردوو لە بیتوێن (نزیکی کۆیەیە) ئاشکراترین نیشانەی زیندوویەتی بوو (چونکە زیندوو قەبری دەبێت). باوەڕ دەکەم لەو ساڵەی 1948 دا دەرامەدی سەرلەبەری شاری کۆیێ هێندەی مانگانەی دەرگەوانی «ئیمپایەر ستەیت» نەدەبوو، چونکە بێگومان هەزار ماڵی کۆیێ، ئەوسا، یەکی ساڵانە پەنجا دیناری نەبوو کە سەرجەمی دەکا پەنجا هەزار دینار. دەرگەوانەکەی باسکراو پیاوێکی زلی ناوداری نیۆیۆرکی بوو، هەرگیز بە دووسەد هەزار دۆلار ساڵانە ڕازی نەدەبوو، کۆیەش پەنجا هەزار دیناری لەو ساڵەدا نەبوو... ئەو وەسبەیە بوو بە ئیسپاتی

ئەو بیروڕایانەی ئەوسام دەربارەی مارکسیزمی بەسەر زمانانەوە بوو، تا ڕادەیەکیش لە کتێبانم دەخوێندەوە... بۆرە ئومێدێکی پووچەڵم هەبوو بەوەی ڕەنگ بێ کۆمیونیزمی ڕووسیا شتێکی دیکە بێت لە چاو ئەو سەرلێشێواوییەی بەرەی مارکسیستی دەرەوەی ڕووسیا. دوای شۆڕشی 1958 ئەو زرەئومێدەش بە تەواوی سڕایەوە... من لە زووەوە گەیشتم بەو قەناعەتەی کە ستالین تاوانبارێکە ڕۆژەک دێت شیوعییەت بە خۆیەوە ناگرێت. کە ئەمەم درکاند «لە دەوروبەری 1950 و شتێک دواتر» وەک بۆمبام لە هەناوی گوێدێرە شیوعی و پارتییەکان تەقاندبێ... هەر لە سەرەتای ناحەزیی نێوان ستالین و تیتۆ من بە پێی بڕیاری «بەدیهییە» لایەنگری تیتۆ بووم... خولاسە وەسبە گەورەترین و تازە مۆدێلترین بوو بۆ هەڵەشەیی بەرەی چەپی کورد و پشتەو گازبوونەوەی لە ڕاستیی بنەما سەرەکییەکانی گۆڕانی بەرەو پێشی کۆمەڵایەتی...

- بارودۆخی ئێستای کوردستان چۆن هەڵدەسەنگێنن و چ ڕامانێکتان بۆ داهاتوو هەیە؟!

ئەم پرسیارە لە زۆر لاو لە زۆر کاتدا بەرەو ڕووم بووە، گوتوومە و دەیڵێمەوە: مەسەلەی کورد بۆتە هینێکی سیاسیی عالەمی (لە لایەن ناو دەرکردن و تا ڕادەیەکیش بەهەند هەڵگرتنیش) بێگومان ئەو exoduse ی چەند ملیۆنیی کورد بەرەو دەرەوەی عیراق دەورێکی گەورەی بینی لە ناساندنی مەسەلەی کورد بە جیهان... لە ئاست پرسیاری وەهادا دەبێ بڵێم و گوتووشمە، من کتێبگرەوە نیم. لەوەندە دڵنیام بە مەرجی نەگۆڕانی سیاسەتی عالەمی و مەرجی خۆ نەخنکاندنی کورد، دواڕۆژی کورد گەلێک گەشتر دەبێ لە ڕابوردووی و سەر بە چارەنووسێکەوە دەنێت، پێشتر لە تەمێکی خەستدا بوو سەرەدەری لێ نەدەکرا. لە کەسیشەوە ڕوون نییە ژان و ژوواری ئەو زانە چەند دەخایێنێت و پەراوێزی یان قەوارەی بێشکەی ئەو مەلۆتکەیە چەند

دەبێت... بە هەموو حاڵ زەحمەتە ڕووداوی چەند ساڵی دوایین ڕێ بدات بە سیاسەتی عالەمی کە خۆی کەڕ بکات لە دەنگ و بەنگی سی ملیۆن کوردی گەردن بە کێردی دەست قەسابەکانی.

لەوانە بووم ئەگەر مەودای تەواو و باری لەبارم هەبووایە بە بەر نووسینی وەرامەکان بنیشم و دەستی لێ هەڵنەگرم هەتا لێی بە مراد دەگەم، کە زۆر زۆر زەحمەتە ئەو پرسیارانە سنوور بە دەوری هێماکان و ڕاگەیاندنەکان و بابەتی پەیوەست پێیانەوە بکێشرێت، منیش تەبیاتێکم هەیە ئەگەر بۆم بلوێ دوا تنۆکی هۆشم هەڵدەگوشم بۆ ڕوونکردنەوەی هەر مەسەلەیەک بێت تا ڕادەی دڵنیابوونم لە وەدەستهێنانی قەناعەتی خوێنەر یان بیسەرم. ئەم دنیایەش هەموو ناوەڕۆکەکانی و ڕووی دەرەوەشی بەیەکەوە بەستراونەوە، هەتا بەرەو «مرۆڤ» یشەوە بێیت ئاڵقەبەندەکە و خەریتە تێک هەڵکێشەکە سفتتر دەبێت...

بەغدا- سەعات چواری پاش نیوەشەوی، نێوان 20 و 21 - 10 -1994

پەراوێزەکانی بەشی یەکەم

1. وشەی «کۆڵەکە» لە نامەی مامۆستا هەڵۆدا هاتووە کە دەڵێ «بیری کوردایەتیش لەسەر کۆمەڵێ بنەما هەڵساوە، چەند کۆڵەکەیەک ڕایگرتووە».
2. ئەم چەند مەرجانەش لەو نامەیەدا هاتوون. «ئابووریی هەمەگیر» تەعبیری خۆمە لە نامەکەدا «هەستی ئابووریی هاوبەش» نووسراوە.
3. وشەی «هونەرکار» بە واتای «فنان» ڕاستترە و نیشانەپێکاوترە لە «هونەرمەند» چونکە ئەمیان نەک هەر بۆ «فن» بگرە بۆ هەموو مەهارەتێک دەدات.
4. وشەی «زانیار» وەک «پرسیار» بریتییە لە «تجرید» بە واتای «معرفە» نەک ناوی کارا بە واتای زانا. لە وشەی کرێار کە ناوی کارایە پاشگری «یار» چۆتە سەر ڕەگی «کرِی... » و یەک لەو دوو «ی» ە قرتاوە.

کاغەزی ئەم جارەت بە خۆت و هەستی دڵسۆزانەیەوە، ویڕای سی پرسیاری نوێت هەڵێکی ڕەخساند، خۆشی بێت و ترشی بێت - کە من لەگەڵ هەندێ شتی ترشیش دۆستم - بە بەریەوە هەیە بۆ ماوەیەکی بیندرێژ لەگەڵتدا خەریک بم، ئەگەر خۆم نەدزمەوە لە فرەوانیی پەراوێزی بەشێک لەو پرسیارانە، جگە لەوە کە هێندێکیان لایەنی هەستیاری و تەنگەتاوی تەقیە و زمانگرتنیان پێوەیە تا ڕادەیێک لە ڕەهایی و ئازادیی تەعبیر دادەشکێنن و خامە بەرەو ئاستەنگ و هەورازی ڕکەوە پاڵ پێوە دەنێن! لەوەتەی مرۆ هۆشی پشکووتووە و زمانی گەڕاوە هەمیشە حاڵوباری ئەوتۆی بە دەوری خۆیەوە دیتووە بیخاتە سەر هەڵوەست کردن و خامۆشبوون: ئەم دیاردەیە لە جیهانی غەیری مرۆ (هەبوونی هێزەکی - وجود بالقوة - potential)یشی نەبووە،کەچی مرۆ لەوانەیە زمان بگرێ لە باسی نرخی شووتی و کاڵەک نەکا حکوومەتە دیکتاتۆرەکەی وەیا جیرانە بەقاڵەکەی پێی ناخۆش بێ، خۆ ئەگەر زەرەرێکی خۆی لەو باسەدا هەبێ هەر بەجارێ سەرپۆشی و سرپۆشی دەکات.

- ئایین چییە و بۆ ئێوە چی دەبەخشێ؟

لە پێشەوە دەڵێم وەرامی من لە ڕوانگەی دیدی کۆمەڵایەتییەوە نەک غەیبەوە بەرەو بابەتەوە دەچێت، چونکە دەریا و فەزای غەیب سەرەتای هەیە و کۆتایی نا! جارێک لەو جارانەی هەل تێیدا هەڵدەکەوێ شتێکم لەبارەی تەبیاتی بەشەرەوە دەربڕی، دینم تێیدا کرد بە نموونە، چەند مەلایەکیش لەو مەجلیسە، کە هی پرسە بوو، دانیشتبوون، گوتم: ئەگەر لەم زەوییەدا هەزار دین هەبێ، بێ ئەوەی هیچ دینیک دەنگ بەرز بکاتەوە بە پووچاندنەوەی دینەکانی تر، هەر یەکێک لەو دینانە 999 دینەکەی تر بە درۆ دەخاتەوە لەو ڕووەوە کە هەر ڕێگەی خۆی بە ڕاست دەزانێ، ئەگەر نا، پێڕەوی دەکرد لە

دینێکی تر. بەڵام ئەگەر یەکێک گوتی، هەزار دینەکە سەر لەبەریان هەڵەن، بە هەموویان دایدەپڵۆسن هەر چەندە ئەو کابرایە یەک ژمارەی زیاد کردووە لە 999 یەک.

پێویستە بڵێم، لەبەر تیشکی پرسیارەکە، چی گوتم لە جوداکردنەوەی ڕوانگەی کۆمەڵایەتی و ڕوانگەی غەیب بۆ سەر چەشمەندازی ئایین، بەشی هەرە زۆری ئەو ئایینانەی کتێبی ئاسمانییان نییە و لە خۆوە دەچنە ئاڵقەی تێوەرامانی کۆمەڵایەتییەوە، چونکە پێوەندییان بە غەیبەوە نییە، بە تەواوی وەک مێژوو – هونەر – ئەفسانە و بازرگانی... هتد! لێرەدا جوداکەرەوەی ئایینەکان لە ڕووی «غەیب و کۆمەڵایەتییەوە» بوون و نەبوونی «پێغەمبەر»ەکە بە ناوی خواوە و لە وەکالەتی ئەوەوە فەرمانی ئاسمانی بە خەڵقەکە ڕادەگەیەنێ. دینی بێ «پێغەمبەر» نادرێتەوە بە غەیب وەک کە پێشبینیی هەندێ دەروونبینان و فەندی سیحر و شەعبەدە، کە هێندەی موعجیزە سەرسووڕێنن، پێوەندییان بە فکرەی غەیبەوە نییە، لە مەسەلەی «مانی» دوودڵم چونکە بۆم نەلواوە تا ئەم دەمە سەرچاوەیەکی ڕوونکەرەوەی تێروتەسەل پەیدا بکەم و لە حەقیقەتی ئامۆژگارییەکانی دڵنیا بم. کە دەڵێم «دوودڵم» مەبەس ئەوەیە ئایا مانی خۆی بە پێغەمبەر و خاوەن وەحی داناوە یا نا؟ جا ئەگەر ئەم پرسیارە بەلای خوێنەرێکی عادەتیشەوە سەرەتایی و یەکالاکراو بێت بۆ من جارێ داخراوە.

پرسیاری «ئایین چییە» کە لە دیدی کۆمەڵایەتییەوە وەڵامی بدرێتەوە، تا ئەوەی من لێکدانەوەم تێدا کردبێت و – دوور لە بۆچوونی لاهووتیی ئایینە ئاسمانییەکان – یەکێکە لە بەرهەمە هۆشەکییە «عقلی» هەرە زووەکانی گەشانەوەی «زانین» لە مرۆڤدا و دەشێ بگوترێ گرنگترین ژوورخانی کۆمەڵایەتی بێت، نەک هەر لە ڕووی دژواری و ئەستەمیی هەڵێنجانی «تجرید» لە بوونەوەری ماددی بەڵکوو، پتر لەبەر بایەخی قودسییەت و پیرۆزی کە وەپاڵ دەستووراتی تەجریدەکەوە دراوە، چونکە لە سەرەتاکانی کرانەوەی هۆش و کەوتنە سەر لێکدانەوەی جیهانی بەر هەست، بە ورێنە و

خەیاڵیشدا تێناپەڕێت، مرۆڤی تازە هۆش پشکووتوو هیچ شتێکی بەلاوە موحتەرەم بووبێت. لە جغزی «پاراستنی گیان» بە واتا و پەراوێزی نەختێک فرەوانترە لە هی گیانلەبەری بێهۆش، کەوا بێگومان مرۆڤ چالاکتر و بەردەوامتر و زیرەکانەتر خۆی و خێزانی و وەچەی خزمەت کردووە و بۆی جەنگاوە، پتریش نوای تێدا ژیان و حەسانەوەی لە گەزەند چەپارە داوە و قایمەکاریی تێدا کردووە. ئەو بازەی مرۆ هاویشتی لە ئەشکەفتەوە بۆ خانوو «هەرچییەک و چۆنێک بووبێت» هەنگاوێکی هۆشەکیی بەرین بووە بەرەو کۆمەڵایەتیی ڕووەو پێشکەوتنەوە، بەڵام جارێ زۆری مابوو پەندی «حورمەت» لە «خانووداری» هەڵێنجێت. کە دڵۆپەی کردبێت یەک دوو پێلەقەی لە درز و تیکان داوە، تا ئێستاش ئەو خووە لە دەوروبەری دواکەوتوو هەر ماوە و تەنها جوداوازییەک هەبێ لەچاو ڕەفتاری مرۆی سەدان هەزار ساڵ لەمەوبەر هەر ئەوەیە ئەگەر بە شەوی تاریک بانی دڵۆپەکردوو بپەستێتەوە بیسمیللا دەکێشێ بۆ گەزەندێکی بەر جنۆکە بکەوێت. حورمەت بۆ دار و بەردی خانوو پەیدا نەبووە مەگەر خانووەکە هی پەرستگە بێ یاخود کەسی دینداری تێدا ژیابێت. بەداخەوە لە کوردستانەکەی خۆمان کەم جێگەی ئاوەدان هەیە بەهۆی بایەخی پیرۆزی مێژوویی وەیا شکۆی پاڵەوانەتیی خۆبەخت کردووان ڕێزی لێ نرابێ. بەردە قارەمانی لای دەربەندی بازیان ناتوانێ گیسکێک لە دزین بپارێزێت بە دەوری خۆیەوە: کەچی ئێڵە کۆچەرەکان لە گەشتی بەرەو کوێستانیان بەشێکی کەلوپەلیماڵەکەیان تەسلیم بە مەرقەدێک دەکرد و دڵنیا بوون دز ناوێرێ دەستیان بۆ بەرێت... .

مرۆ بەر لە پلەی پێکهێنانی گوند، ئەتڵەسی جیهانی بێ نووسین و بێ خەریتە بەبەر نیگا و هۆشیدا جلوەی دەبەست کە بەشێکی هەرە زۆر و هەرە سەرسوڕهێنەری، وەک ئاسمان بە خۆی و ڕۆژ و مانگ و ئەستێرە و هەورەتریشقە و بەفر و بارانیەوە... وەک بوومەلەرزە... وەک زان و ژین و مردن... وەک پەلکەزێڕینە و پەڕی تاووس و حیلەی ئەسپ و نەڕەی شێر و

پڵینگ و... وەک گوڵ و درک و پەپوولەی ڕەنگین و زەردەواڵە و دووپشک و ماری مەرگبەخش... وەک ئەمانە هەموویان دەبوون بە پرسەکی[1] بێ وەرام لەچاو ڕاوە ماسییەکی خۆی پێ تێر دەکات و دار و چیلکەیەکی مرازێکی خێزانی پێ دابین دەکات و بەردەبازێکی بەسەریدا لە ئاو دەپەڕێتەوە و پێستەڕێوییەکی لە زستاندا پێی گەرم دەبێتەوە... بێ گومان، لە نێوان دیاردەی بە «سەرسووڕهێن»م دانا چی پێی دەگوترێ «ئاسمانی» لەلایەن ورووژاندنی دەروونەوە، بە قۆناغ و مەودا بەر لە هەموو شتێکەوە هاتووە. ئاگریش لە نێوان ئەو ئامێرانەی بەهۆی ئاشنابوونی مرۆ لەگەڵیاندا و ڕاشکانی بەسەریاندا بوونەتە عادەتی و لە پلەی یەکەمدا هاتووە. ئەگەر مرۆ خۆی دەسەڵاتی ئاگر پەیداکردنی نەبووایە و هەر لە برووسکە و بەرکانەوە ڕێی پێ بردبایە ئەویش دەبووە ئاسمانی. بەهەمە حاڵ ئاگر بە بەریەوە هەبووە «تا ئێستاش هەیەتی» ڕێزلێگیراوبێت، خۆ لە دینی زەردەشتدا ئاشکرایە چ پایەیێکی هەبووە، هەر چەند لە نوختەنەزەری پەیدابوونی «حورمەت»ەوە بەر لە سەدان هەزار ساڵ، زەردەشتایەتی و ئەو باوەڕانەی ڕووناکی و ئاگر بە پیرۆز دەزانن دەخلێکیان نەبووە لە چەندوچۆنی هەڵسوکەوتی مرۆ لە ڕاڕەوی هەستکردن بە «نرخی مەعنەوی» کە دەزانین، یا دەبێ بزانین، پژانی هۆش و کرانەوەی بۆ نرخێکی تازەی دەرەوەی جغزی جانەوەری و غەریزە، بریتی بووە لە کرانەوەی جیهانێکی «لە هەموو ڕوویەکەوە نوێ» بۆ بەر دید و هەست و خولیای مرۆ کە بە تەواوی داخراو بوو، تا ئەوەی دەشێ بە نەبووی دابنێین لە هەموو زەمانی بەر لە «مرۆڤایەتی» و هەر داخراویش دەمێنێتەوە بۆ غەریزەی زیندەوەر تا ڕۆژێکی لە حوکمی بوون و نەبووندایە. ڕێی تێ دەچێ زیندەوەری وەک گۆریللا ببێتە خاوەن هۆش؟ نرخی مەعنەوی - تەجرید - چەندێکی لە سەرەتادا سست و کەمبڕشت بووبێ، هەر خۆی بە دەم فراژیبوونی و گەشەکردنەوە، بوو بە سەرچاوەی گەلێک تێڕوانین و لێکدانەوە و هەڵێنجان و ئاکامگری[2]، کە لەواندا دوو شادەماری سەرەتایی گرنگ و گرنگتر بوون بە شەقامەڕێی خەریکبوونی مرۆ بە چەندوچۆنی جیهانی بەرچاو

و بەرهەست و بەرهۆشی. یەکەمیان سروشت بە شێوەیەکی تێکڕایی و ئاسمان بە تایبەتی، دووەمیان پەیوەندایەتیی «بوونەوەر»ی دەوروبەری خۆی، وەک کە ئاگر ئاو دەکوڵێنێ - قۆرتی قووڵ زیندەوەری بچووکی لێ دەرنایەت - دانەوێڵە مەلی لێ کۆمەڵ دەبێ - داشتنی دار و ڕووەک بەردارتری دەکات... و دەیان و سەدان تێبینیی ئەوتۆیی کە دەبوون بە ئاسانترکردنی ژیان و ئاسوودەیی، ڕێگەشیان هەموارتر دەکرد بۆ زێدە گەشەکردنی هۆشی و پێشخستن و فرەکردنی ئامێری ڕاشکان بەسەر هەڕەشەی ناحەز و دەردەستکردنی بژێو و پۆشاک... لایەنی «ئاسمان» و دیاردە سەرسووڕێنەکانی جیهانی چوارکژە و دوو «وەختەی»ی شەو و ڕۆژان کەوا بێ ئەوەی یەکسەر دەخلیان هەبێ بە حاڵ و باری تەپکە دانانەوە و ڕاهاتن بە ئەنگاوتنی مەل و مارمێلکەوە کارێکی زێدە بەهێز و قووڵ و پڕ ئەنجامی کردە سەر خولیا و بۆچوون و لێکدانەوە و ترس و تەمای مرۆڤەوە، بەوەدا کەوا لەبەر حەپەسانی بە شکۆی دیاردەکەوە هەستی «ڕێز و پیرۆزی»ی لە ناخیدا بۆ «ئاسمان» ڕوواند. بێگومان بەدەم ڕۆژگارەوە ئەم «ڕێز و پیرۆزی»یە دەبوو بە تەجریدێکی خەستەخۆڵ کە گوشاری بۆ هەست و هۆشی دەهێنا و سواری خەون و خەیاڵی دەبوو تا ئەوەی بە بڕیاری ناچاری و فەرمانی پابەندبوون و بەجۆرێکی یەکجار ئاسایی و دوور لە دوودڵی و سەرسووڕکێ و زۆرلەخۆکردن ئەو تەجریدە خەستوخۆڵە بنەما و ڕەگی پەیدا کرد و دابونەریتی سەپاند. چ سەیریش لەوەدا نییە کە دەزانین ڕاوەبەراز و هەڵپەڕکێ داوای داب و دەستوورێک دەکات کە لە هیچیاندا ڕێز و پیرۆزی سێبەریشی نییە. لەم قۆناغەدا ڕابەری ئەو تەجریدە هەستی گشتی بوو نەک مامۆستای دەرسدەر و پیتۆڵی فێڵباز، ناشزانین، یان من نازانم، ئەم سەرەتایەی پەیدابوونی هەستی «ئایین» چ کاتێکی دوورودرێژ وەیا مامناوەنجیی خایاندووە. بەڵام بێگومان لە دەورانێکی زۆر کۆنەوە تەجریدە پیرۆزەکە و نەریت و داب و دەستوورەکەی بووە بە ئایین. ئەوجا کە ئەمەی گوتم لە

بارەی ئایینەوە نیشانەی پێکابێت، دیاردەکە دەبێتە ڕووداوێکی سەر بە کۆمەڵایەتی مرۆڤەوە، بە خۆی و دیارییە بێ پێشبینەکەی فکرەی «پیرۆزی».

تا دەمی ئەم نووسینە هیچ سەرچاوەیەکم نەخوێندۆتەوە باسی پەیدابوونی ئایین بکات جگە لەو ڕیوایەتانەی سەر بە کتێبی ئاینییە ئاسمانییەکان کە ئایین بە خەڵقی ئادەمەوە دەبەستنەوە، لەوێشدا یەک دێڕم دەست نەکەوت، چ هی مەسیحی چ هی ئیسلام، تێمان بگەیەنێ چۆناوچۆنی ئایینی ئادەم کە لەم ڕۆژهەڵاتەی نزیک پشکووت، گەیشتە ئەمەریکا و ئوسترالیا و ئەسکیمۆ... کە دەزانین لە نێوان ئەواندا ئادەم و وەحی و شتی ئەوتۆیی تارماییشی نەبووە، ئایینێکی بووبێتیشیان لەوپەڕی سەرەژوورچوونیدا لە شێوەی Totem ی تێنەپەڕاندووە، لەوە هەر بگەڕێ کە پاش تۆفانی نووحی باسکراو زورڕییەتەکەی بە کوێدا سەرلەنۆی بڵاو بوونەوە بە هەموو جیهاندا تا دوورترین جەزیرەکانی دەریای ئەتڵەسی و هێمن، بێ ئەوەی پاپۆڕیان هەبووبێ، ئەوجا لە ماوەی چەند هەزار ساڵدا ئەو هەموو زمان و زار و ڕێزمانی لەیەکترنەکردوو کە هیچی پێوەندایەتیی بە زمانی تەورات و تیرەی سامییەوە نییە، تەنانەت لەگەڵ زمانی هیندی ئەورووپایەکانیش هەر بێگانەیە، خۆ زمانی هیندی ئەورووپاییش لە هەموو ڕوویەکەوە جودایە لە زمانی سامییەکان... چۆناوچۆنی هوتنتۆتی ئەفەریقا و ئەبۆریجنەکانی ئوسترالیا و هیندییە سوورەکانی ئەمەریکا و ئەسکیمۆ و قەفقازی و نازانم کێ و کێ لە یەک تۆو کەوتوونەتەوە کە نژادی سامیش دەبێ لەو تۆوە مابێتنەوە کەچی لەگەڵ هیچیان خزم نین. ئەمە دەڵێم بەڵکە خێرەومەندێک بە هانای ئەو پرسیارانەوە بێت، بەڵکوو ئوستادانە نەک بە زۆرەملێ و هەڕەشەی تەکفیر ڕاوێژێکی متمانەبەخش، هەر نەبێ بۆ دڵی خۆی، لەم ڕووەوە بخاتە بەر نیگای خوێنەرانەوە...

لە ڕووی بایەخی پەسەند و بەدیی ڕسکانی تەجریدی «پیرۆزی»یەوە (هەروەها لە ئاست ناوەرۆکی بەشێک لە پرسیارەکانی وەک هی پێنچەم و شەشەم و حەفتەم) بێ دوودڵی دەڵێم، چەندێکی بشێ دروشمی «پیرۆزی»

که هەڵێنجانەکەی بە دیاردەکانی سروشت لە ڕاڕەوێکی ئەفسانەییش بوو بێت، خۆی لە خۆیدا، «نوێکاری - ابداع» و داهێنانێکی ڕوونکەرەوەی دەروون و مێشک و ڕەفتار بووە بە لای چاکەی مرۆڤدا شکاوەتەوە، لەمەشدا بەڵگەیەکی کورتی متمانەبەخش (بە لای خۆمەوە) بە کافی دەزانم. وا دادەنێین فکرەی «پیرۆزی» لە پزدانی مرۆڤایەتی نەڕسکا و، ئەویش وەک هەرس و پشیلە لە سەرەتای بوونیەوە تا هەزاران هەزار ساڵ بێ دروشمی تەجریدی و بێ فکرەی تەقدیس و پیرۆزی ژیانی ڕۆژانە و ساڵانەی بەسەر دەبرد و سێ و دووی لە هیچ شتێک نەدەکرد کە دابینکەری ئارەزۆی بێت. لەگەڵ خۆتدا لێکدانەوە بکە کە «مرۆ» ڕێزی لە هیچ شتێک نەناوە و «نرخ»ی مەعنەوی بەلایەوە وڕێنەش نەبووە، لەم ڕوانگەوەش دەبێ تەمات نەبێ بە پەیدابوونی نرخی مەعنەوی و ڕێز و قودسییەت، چونکە کە هاتیت لە حیسابی چاکە و خراپەییێکی بۆ بەرژەوەندی مرۆی دەکەیت، ماکی ڕووانی «قودسییەت»ت لە مرۆدا نەبوو کرد و بە قازانجت زانی، ناشێ دواتر لە بڕیارەکەت ژێوان ببیتەوە چونکە ناشێ «بانێک و دوو هەوا» و «قیامەت هەر لە بۆ مەڕی مەلای مەشهوور دابێت»... مرۆ بە لای ڕوانینی «مادییەت»ی ڕووتەوە کە قودسییەتی مردەزاد کرد تێیدا، دەبێ هەتا دەورانێکی چەندین سەد هەزار ساڵەیی ئەو مرۆیە گورگانە و پڵینگانە و مەیموونانە بخوات و بزێت و زایەندی ڕەها بگرێتە بەر... دەگوترێ مرۆ لە کۆنی هەرە کۆنەوە ئەو شتەی پەرستووە کە لێی ترساوە. ئەم گوتەیە تەنها نیوەی ڕاستە چونکە هەموو شتێک نەپەرستراوە. شێر و پڵینگ و هەزاران شتی ترسناک هەبووە بەڵام هەتا سەرپۆشێکی تەنکی شەفافی «نامۆیی» خۆڕسک لە هۆی ترسناکە نەئاڵابێ و بوونێکی ئەفسانەیی پێ نەبەخشێت نەچۆتە پلەی ڕێز و پیرۆزییەوە. ئێمە دەزانین، یان دەبێ بزانین، بەرەوپێشچوونی باری کۆمەڵایەتی و فرەبوونی پێوەندایەتیی مرۆ، بە کۆمەڵ و بە سروشتەوە و دەوڵەمەندبوونی تاقیکردنەوەکانی، بە فەرمانی ناچاری و حەتمی، ژیان و دەستووراتی کۆمەڵایەتی ڕێکتر و سەقامگیرتر بووە و نرخی تازە بە تازەی چاک و بەدی

پێوە بووە. بەڵام نابێ لە بیر بکەین، ئەو گۆڕانکارییەی ڕووەو پێشەوە ئاکامی هەموو ناوەڕۆک و هاندەر و پەکخەر و سەرکەوتن و تێشکان... و... هتد... ەوە بووە نەک بە مراندنی پێکهێنەرێکی هەرە گرنگی وەک «پیرۆزی». کە هاتین ئەو پیرۆزییەمان لە مرۆی کۆنینە داڕنی، بۆچی «پیرۆزی» لە نیشتیمانیش دانەڕنین، بەڵکوو مرۆی ئەم سەردەمە دەحەسێتەوە لە شەڕ و هەرای بۆسنە و کوردستان و چیچان و فەلەستین و ئەبخار و باسک و ئیرلاندە... و... هەتا تیبەت و پەنجاب و بەرەکەتەکانی مامە پۆلپۆتی نازانم کوێ... کوردستانەکەی خۆمان، لە بەشی عێراقدا، بەهۆی دوو زێی بادینان و کۆیێ (کە گۆیا ئاو ئاوەدانییە) بۆتە سێ کەرتی لێکتر دڕدۆنگی بابان و سۆران و بادینان، هەر چونکە ئەو دوو ئاوە لە بەشی زۆری ساڵدا خەڵکی ئەمبەرەوبەر لێکتر دادەبڕن، لە دروستبونی عێراقیش تەنها پردێک لەسەر زێی کۆیێ، لە پردێ و یەکێکیش بەسەر زێی بادینانەوە لە کەڵەک هەبوو، ئەویش بۆ هاتوچۆی سەرباز و مەئموور و بەریدی حکوومەتی عوسمانلی... ئەوجا ئەگەر خێرەومەندان بە نیازی زەرەردان لە تورکی داگیرکەر، ئەو دوو پردەیان بڕماندایە قازانج سەری مایەی کوردانی دەخوارد.

بێگومان ئەگەر لە ئیمکاندا بووایە، دەستبژێرکرابایە لەو ماکانەی چاک و بەد و چاکەکانمان گل دابایەوە - ئەویش بە خەیاڵ - و موتربەمان بکردایە بۆ هەمەچەشن کردن - دیسانەوە بە خەیاڵ - لەوانە بوو مرۆڤ لایەنی ئاسوودەیی زاڵ بێ - دیسانەوە بە خەیاڵ - چونکە نازانین بە مراندنی تەماع و درۆکردن و بێگانە نەویستی و گومانکاری... و... چشتی ئەوتۆیی چەندیەکی مرۆیەتیمان تێدا دەمایەوە و ئەو پشکەی لە گوزەران و بەسەربردنەوە بەر مرێنراوەکان دەکەوێ چ کەلێنێکی دەخستە لێهاتوویی و کاریگەریەتی و بەرژەوەندبینی و پیتۆڵی تاک و کۆمەڵ... خولاسە لەوانەیە مراندنی خەسڵەتێکی بەد لە مرۆدا بکێشێتەوە بۆ بێهێزبوونی خەسڵەتێکی پەسەندی وەک ئەوەی کە توانای درۆت لە مرۆدا مراند بەشێکی زۆری مەهارەتەکەی لە تەپکە و تۆڕی ڕاوکردن دادەلەنگا، چونکە ئەمانەش درۆن، نەیدەتوانی

پەنای بێتاوان بدات لە زوڵمی بەدکار و زۆردار... دڵی نەدەچوو بۆ شاردنەوەی زێڕ و پارەیەکی هەیبێ لە بابایەکی موحتاجی یارمەتی بێت.. یا دەبوو هەموو ئارەزووی زایەندی خەفە بکردایە یان خۆی و خەڵکیشی ناوزڕاو دەکرد بە ئاشکراکردنی ئەو قەباحەتانەی لەگەڵ جینسی بەرابەر لێی دەقەوما... بە دەنگی دلێرەوە ناحەزیی خۆی دەردەبڕی و شەڕی بە ناحەزەکەی دەفرۆشت... هتد. چاکتر ئەوەیە لە کورتی ببڕمەوە و بڵێم: نازانین چ جۆرە مرۆ و کۆمەڵایەتییەکمان دەبوو ئەگەر توانای درۆ نەڕسکابایە. لە جەوابی دەقی پرسیارەکە: ئایین چییە؟ دەبێ بڵێم ئایین ئەو بیروباوەڕ و نەریت و دەستوورەی لە سەرچاوەی «ئەفسانە»وە هەڵدەقوڵێ و فڕی بەسەر حەقیقەتەوە نییە و زادەی لایەنی سەلبیی هۆشە کە بەرانبەر «نامۆیی تریفەدار» واقی وڕ دەمێنی، ئا ئەمەیە ئایینی مرۆکرد کە لەوپەڕی سافیلکەیی و سەرەتایەتیی لێکدانەوە و هەڵێنجان و پێوانە، خۆی سەپاندووە بەسەر هەست و هۆش، دەشبێ لێرەدا بڵێم ئەو ئەفسانانە و داب و نەریتیان لە هەموو جیهانی مرۆدا یەک شێوە نەبووە: بێگومان بەفرستانی گرینلەند بە شەو و ڕۆژی هاوینە و زستانەیەوە، کە هەر یەکە بە نۆرەی خۆی درێژ و کورت دەبێ تا ڕادەی نەمان و نەبڕانەوە، ئەفسانەیەکی کز و شلۆک دەزێت لە چاو ئەفسانەی ئوستراليا و وەیا هیند و چین و سیبریا و ئەورووپا... ئەمانەیش لە نێوان خۆیاندا خوار و ژوور و سافیلکە و گرێیاوییان هەیە نەک هەر گۆڕانی ئاووهەوای وڵاتەکان و بەس، بەڵکە لەبەر جوداوازیی نێوان جۆری بیرکردنەوە و لێکدانەوەی خەڵکەکە و فرەچەشنبوونی تەجرەبەیان و هەڕەشەی دەوروبەریان و گەلێک هۆی تری سروشتی و سەر بە مرۆڤ...

کەواتە ئایین، وەک لەو ڕووپەڕانەدا باس کرا، دیاردەیەک نییە لە جغزی ئارەزۆ و ڕەفزکردنی مرۆی بەر لە سەدان هەزار ساڵ بووبێت، بگرە وەها بە ملەوە بووە بەر لە پەیدابوونی کشتوکاڵ و گوندسازی، لە مێشک و دەروونی مرۆدا نرخی «پیرۆزی – قدسية» و بە دوا ئەودا ئەفسانەیی تەنیوەتەوە. یەکێک بیەوێ لە پەیدابوونی ئایین و، بە دوا ئەودا ئەفسانە، دڵگیر بێ و

گلەیی بخاتە ئەستۆی مرۆوە، دەبێ زووتر لەسەر پەیدابوونی ملّکدار و زۆردار و سوودخۆر... و... چی و چی و کێ و کێ ببێتە ناحەزی مرۆ، نەک هەر خاوەن گلەیی، چونکە، بێگومان، بە لێکدانەوە، بەرهەڵستیکردن لە ملّکداریی زێدە فرەوان ئاسانترە لە بەربەستکردنی «ئایین» چونکە ئایین بێ ئەرک و بێ پلان و بێ بەرنامە و بێ هەناسەسواری لە خۆوە و بە شێوەیەکی هەمەگیر لە دەروونی سەرلەبەری تاک و کۆمەڵی مرۆڤایەتی دەزێتەوە، تا ئەگەر نەزێتەوە لەوانەیە بڵێین کەموکووڕییەک هەیە لە ماکی «مرۆیەتی»ی ئەو خەڵکەی خولیای بەلای لایەنی پڕهەست و خواستی «پەنام، نامۆ، نهێن» لە دیاردەی تریفەداری سروشت نەچووبێتەوە. من نازانم زانا و فەیلەسوفەکان لەم بارەوە چ دەفەرموون بەڵام بە پێی بڕشتێکی، کەم یان زۆر، لە هۆشمدا هەیە بێ پەروا دەڵێم: ئەگەر ڕەگەزێک هێوێنی ڕسکانی تەجریدی «پیرۆز» لە وزەی هەست و هۆش و سۆسەی نەبێ، ئا ئەو ڕەگەزە هاوتای ڕەگەزەکانی دیکەی مرۆڤایەتی نییە و بە زەحمەت «یاخود ناشێ» هەڵگری قورسایی زانستە سەرسووڕێنەکانی پاش هەزار ساڵ بێت... لێرەدا ڕێکەوت قسەیەکی مەیلەو کۆنم بە بیردا دەهێنێتەوە. لە بەهاری 1979 سەردانی لەندەنم کرد. لە وتووێژێکی سەر بە «ئادەمیزاد» و بە پێی داخوازی ئەو دەمەم گوتم: مرۆی نیاندەرتاڵ بەر لە ئێمە بە 100 هەزار ساڵ هەبووە لە پلەی «ئادەمیبوون»دا بەرەوژێری ئێمە بووە. ئایا ئەسکیمۆ (هەروەها دانیشتووە ئەسڵییەکانی ئوستراليا و ئەمەریکا) کەوا لەوەتەی هەیە، بابڵێیم 30 هەزار ساڵە، لە خەتی شارەستانەتیی ئەو وڵاتانەی ئادەمزادی عادەتین دابڕاوە، ئایا نەشێ ئەو دابڕانەی کاری نەکردبێتە سەر لایەنی پلەی «هۆشداری»یەوەی و دایلەنگاندبێ؟ گوێگرەکەم، بە دەمار گرژییەوە گوتی: هەر چی مرۆڤایەتی هەیە هاوچوونن... پێم گوتەوە: من پتر لە پەرۆشی ئەواندام چونکە ئەگەر دەرچوو لە ئەزمووندا، هێندەی ئێمە لە «ئادەمیبوون» ڕەگداکوتاو نین، ناشێ ئەرکی خۆمانیان بە ملدا ببڕین، وەک کە ناشێ تەکلیفی قورسی لە منداڵی ساوا بکرێ و دەشبێ مافی تەواوی مرۆڤی ئاساییان پێ بدرێ. هەڵبەت ئەم

بۆچوونەش لە منەوە، کە بە دوو دێڕ لێی بوومەوە، لە واقیعدا هەموارکردنی کۆسپی زل و ڕکی بە دمەوەیە، چونکە بە چاوی خۆت دەبینی فارس لەگەڵ فارس و عەرەب لەگەڵ عەرەب و کورد لەگەڵ کورد چی بەیەکتر دەکەن، سەرێکیش لە ئەفریقیا خوار بکەیتەوە و گۆشەیەکی چاویشت بۆ مەیدانی نازانم کوێی پەکین لاربێتەوە... ڕوونتر و قووڵتر کێشەکە بۆ بەر نیگات خۆی ئاشکرا دەکات... هێندە هەیە مەسەلەکە هەر لە خەیاڵ و خولیای مندا خرت و پرتیەتی، جارێ نەبۆتە «کێشە»ی سەر بە مافی مرۆڤایەتی.

بێگومان هەڵە و ئەفسانە و هێڕی و گومڕایی و وەستان و پاشەکشە و گەلێک ئەنجامی ناقۆلا و ئێسک قورس و بەئەرک لەو ئایینە باسکراوە زەنە دەکات و بەدەم ڕۆژگارەوە دەبێ بە کۆت و زنجیر لە مل و دەست و پێی مرۆ، تەماکاری زیرەکیش بە دڵی خۆیان سوود لەو بارە نالەبارە و ئەو ئاووهەوای ناسازگارە وەردەگرن و تێشووی لێ پڕ دەکەن، خۆ ئەگەر بە دەستم بێ هەرچی درۆ و ساختەکاریی و باوەڕی چەوت و کوێر هەیە لە دەفتەری ئادەمیزادی دەسڕمەوە، بەوەشدا بەشێکی زێدە پۆزی بیروباوەڕی سەر بە ئایدیۆلۆژیی سیاسی کە برا برا بەشەڕ دەهێنێ و لە هیچە ئاگری «چینایەتی» هەڵدایسێنێ (لە حاڵێکدا هەموو وڵاتێکی پێشکەوتوو چارەی ئەم لایەنەی داوەتەوە بە دیمۆکراسیی بێفێڵ) دەپووچێتەوە. ملیۆنەها ملیۆن مرۆی خوێندەوار و تێگەیشتوو دەبن بە دەروێشی زەرگوەشێنی کەفدەرکردووی چاو ئەبڵەق، لە سەردەمێکدا مرۆ گەیشتە ناو مانگ و ڕاسپاردەی بۆ بۆشایی جیهانی بێ برانەوە هەنارد، چ گلەییەکم هەبێ لە گەمژەڵی بەر لەسەدان هەزار ساڵ کە نەیزانیبێ بروسکە کارەبایە و پەڵکەزێڕینە ڕەنگەکانی تیشکن. لە منەوە ئێزنە، هەرچی خەباتگێڕی کوردی کوردستان هەیە با بدەنەوە لای پەرستنی Totem و واز لە براکوژی بهێنن. سا میرییەک بێت و گۆلکێکی بەردیان بۆ بکات بە پەیکەر و بە خوای بناسن، هەزاران جار بەشەرەفترە لە فەتوای فەیلەسووفێک کە بە هێزی بەڵگەی عیلمی «براکوژی» بکات بە پێداویستی قوناغی سەدەی بیستویەکەم. دەبێ بزانین کە مرۆ بوو بە خاوەن

هەست و زانین و سۆسە کردن، ڕووبەڕووی ئەم جیهانە زێدە مەتەڵاوی و بە گرێوگاڵ و بێسنوور و پەردەپۆش کراوە، لە حاڵێکدا هەمیشە هەڕەشەی مەرگ و بڕانەوە و بەسەرچوون ورەی ناخی گیانی خاو دەکاتەوە و جڵەوی خوار و تەما و ئومێدی دەداتە دەست «هەبوون»ێکی پەنامی نادیار و خاوەن دەسەڵات بەڵکو... خوا و ڕاستان... هانا وەبەر مەجهوول... تا ئەوەی لەم ڕۆژەدا ملیۆنەها خاوەن شەهادەی بەرز چاو لە گومان دەنووقێنن و سەر لە گۆری پیاوچاک دەدەن و «چزی دووپشک ڕەقباها»[3]. دەسریوێنن، هەر چونکە گۆشەی لایەنی ئەفسانە «بە پێی باوەڕی ئەو خاوەن شەهادانە» ترس و تەمایەکی خۆشی و عەزابی پاش قەبری لێ کردوون بە هات و نەهاتی تیروپشکێ و بیتاقەی یانەسیب، ئیتر بۆ دەبێ سەرسوڕکێمان بگاتێ لەوەدا کە مرۆی بەر لە پەنجا هەزار ساڵ مل ڕاکێشێ بۆ بەر فەرمانی ئەو شەبەنگە پەنامەی لە هەست و نەستیدا جلوەی بەستووە... ! با بێمەوە ئەم ڕۆژگارە و بڵێم: کە ستالینی خوێنڕێژی ستەمکاری تۆمەت هەڵبەست لە لایەن خاوەنانی «اشتراکیەی عیلمی»یەوە بپەرسترێت بۆچی گلەیی بکەین لە سۆفی بارامی ئەشکەنەیی دەست و پێچی شێخی تۆپاوا ماچ بکات، خۆ هەر نەبێ کەسی بۆ نەکوشتووە؟ ئیشتراکیەی عیلمی خۆی دەڵێ سۆشیالیزم دوای گەندەڵبوونی بورژوازی نۆرەی دێت، کەچی مامە کوردی ئەم سەردەمە، دوای هەرەسی یەکیەیی سۆڤیەت و لە ڕووتەنی ئیفلاسی دوو هەزار ساڵی، خەریکە لەسەر بەردی سەنگی سەخری کۆمیونیزمم بە جیهاندا بڵاودەکاتەوە. هەزاران وێنەی لەمەش سەیرتر هەیە شەوکوێریی چاوساغانە بە دەستەوە بدات کە نەهێڵێ کەس سەیری بێتەوە لەوەدا ئایین یەخەی مرۆی گرتووە و بینینی لێ لێڵ دەکات... لە عەشرەتی سارەیی دەگێڕنەوە گویا یەکێک ددانی ژان دەکات و ناوێرێ بۆی دەرکێشن... یەکێکی لەو بەساڵداچووتر و لەخۆڕازیتر دەڵێ: دەک هەناوت کەوێ، ددان چییە زات ناکەیت دەریکێشن. ئادەی وەستا ئەم ددانانەم بۆ دەرکێشە... ئەمجارە ئەمەشیان... ! ئازایانە دوو ددانی مەردانەی بێلزوومی دەرکێشا.

ئایین، وەک بۆی دەچم، ئەوەیە باسم کرد و وەک گیای بەهار و بەفری زستانەی شاخی بەرز یاخود ڕەسینی مێردمنداڵە بۆ گەنجایەتی، ئاکامێکی ناچارییە بەڵام بەردەوامترە لە گەلێک دیاردە و نەریت و دەستووری کۆمەڵایەتی و ئابووری و ڕامیاری، هەر چونکە پاڵپشتەکەی جۆرێکە لە غەیب و پەنامی و چڵکی ماملەتی ڕۆژانەی لێ نانیشێ.

- ئایا ئایین چ ڕۆڵێ لەسەر دروستبوونی نەتەوە دەگێڕێت؟

ئەوەندەی زانیبێتم هەر جوولەکەیەتی بریتی بووە لە نەتەوە و ئایین! تیرە و تیرێژ هەبوون و هەن بە پسۆکبوونی پێوەندایەتییە ئاینییەکەیان کێشاوەتیەوە بۆ هەڵوەشانەوەیان. مێژووی ئیسلام چەندین نموونەی ئەوتۆیی تێدا پەیدا بووە و پوواوەتەوە، بەڵام لە نوختەنیگای «دروستبوونی نەتەوە»وە تەنها نموونەیەک بەر ئەم مەفهوومە بکەوێت، ئەویش بە نەختێک چاولێپۆشی، نموونەی «عەرەب و ئیسلامی»یە کە سەرەڕای «تاکبوون»ی، خۆی یەکێکە لە دیاردە و ڕووداوە هەرە گرنگەکانی مێژوو تا ئەوەی لە ماوەی 30 ساڵدا عەرەبی نیوەشارستان و بێسەواد و بێدەوڵەت بوو بە جێنشین و میراتگری ساسانییەکان و ماڵخۆی ڕۆمانەکان لە سووریە و میسر، جگە لەوەی کە مۆرکی خۆی لە هەموو سەقافەت و بەرهەمی عەقڵی ئادەمیزاد دا، بۆ ماوەی سەدان ساڵ زمانی بووە تەرجومانی مێشک و دەروونی بەشی هەرە گرنگی جیهانی هۆشپژاو، ئەگەر هاتبایە عەرەبایەتی و ئیسلام وەکوو «جوولەکەیەتی و دینی مووسا» دەرگەی داخستبایە بە ڕووی غەیری خۆیدا، ئەویش هەر لە توێکڵی بەرتەسکی عەرەبچییەتیدا دەمایەوە و هەرگیز نەیدەتوانی بە هێزی بازوو ئەو جیهانە بەرینە بگرێتە باوەشی حوشتر و خورماوە، ڕێگەخۆشکەری یەکخستنی عەرەب بوو، دواتریش کە دەستەڵاتی عەرەب لە زۆر وڵاتی ئیسلامدا وشکایی هات، ئایینەکەی و زمانەکەی تا ئەم ڕۆژە جێگەی باوەڕ و، تا ڕادەیەکیش، کلیلی زانستە، کەچی جەنگیزخان و نەوەکانی، هەر چونکە

قورئان و زمانیان نەبوو لە ئیسلامەتیدا توانەوە. لە تەشبیهدا دەتوانین بڵێین سەلاحوددین و عەشرەت و بنەماڵەکەی کە کەوتنە باوەشی «عەرەبستان» و قەڵغانێکی مەعنەوییان نەبوو جەوهەری نەتەوایەتییان بپارێزێ، هەموویان لە ماوەیەکی کورتدا بوون بە عەرەب، هەرچەند حوکمڕان و پارێزگاری ئیسلام و عەرەبایەتیش بوون لە حاڵێکدا کوردی کوردستاننشین، هەروەها بەشێکی زۆری دیانی عیسەوی بە پشتیوانیی ئینجیل، نەتوانەوە. ئەم خاڵەش درێژەی هەیە، من لێی کورت دەکەمەوە. لە نووسینی دیکەمدا بەش بە حاڵ ڕوونم کردۆتەوە «جوداوازیی خێزانەزمان»ی سامی و غەیری سامی چۆن بۆتە مانیعی توانەوەی کوردی و فارسی و تورکی... هتد

لەم ڕۆژگارەدا تاکە نموونەیەک هەیە دەوڵەت و ئایین تێیدا تەواوکەری یەکتر بن، ئەویش ئێرانی موجتەهیدەکانی شیعەیە، لەگەڵ تێبینیی کوردی سوننی کە لە نژاد و مەزهەبیش سەربەخۆن، وێڕای بەشێکی شیعەی ئێران کە دانوویان لەگەڵ حکوومەتی ئیستادا ناکوڵێ و ئەو ڕۆشنبیرانەی خۆیان لە دەرەوەی جغزی مەزهەب دەدۆزنەوە... ئەم نموونەیەش، تەنانەت دەوڵەتی ئیسلامی بەر لە نزیکەی 1400 ساڵیش، بە تەواوی نایەنە بەر مەفهوومی سوئالەکەت، چونکە تۆ لە «دروستبوونی نەتەوە» دەپرسیت کە دەزانین بەر لەوەی ئایین دەوری هەبێ دەبێ نەتەوە دروست بووبێ. هەق و حسێبی مرۆی بەر لە 100 هەزار ساڵ لەوە سادەتر بووە توانیبێتی هەڵگری ئەو هەلومەرجانە بووبێت کە تێکەڵ بە ماکە دروستکەرەکانی نەتەوە بوون و لەوێشدا ڕۆڵی ئایین بۆ ئێمەی دوارۆژێک کە بە خەیاڵی ئەو مرۆیەدا نەهاتووە بە میرات بەجێ بهێڵێ.

نەتەوە بریتییە لە کۆمەڵە ئادەمیزادێکی ئاخێوەری زمانێک بن: هەڵبەت ئەو کۆمەڵە لەسەر خاکێکیش ژیاوە کە ئیستا پێی دەڵێن نیشتمان. بە دوا ئەمەدا دەوری یارمەتیدەر و بەرهەڵستی ئەو هێزانەی تێدا کاریگەرن، نەک داهێنەر و خالقن، دێت، چونکە نەتەوە لە زووەوە خۆی دروست کردووە. ئایین و هەر ئایدیۆیۆلۆگییەکی لەوانە بێت مرۆ خۆی پێوە بلکێنێت، چ لە سیاسەت و

غەیری سیاسەت بێ، بە بەریەوە هەیە ڕەنگی خۆی بکات بە شەقڵی کۆمەڵ، ئیتر خۆوبەخت لەوەدا چەندی ڕەنگەکە بەدە و چەندی پەسەندە. لێرەدا مەودا نییە هەلومەرجی چاک و خراپەی باوەڕی ئایینی و سیاسی شیتەڵ بکرێ (هەر نەبێ بە پێی تێڕوانینی خۆم) بەڵام دەتوانین بڵێین چەند ئایینێک و ئینتەرناشناڵ لە بانگەوازیاندا یەکسانیی نەتەوان، تا ڕادەی تواندنەوەی قەپێلکی ڕەقی نەتەوایەتی، دەکەن بە دروشم، لە ڕواڵەتدا ئەم بانگەوازە بە سوودی نەتەوەی بێهێز دەچڕێت و دەخەبتێت، لە نموونەدا دەڵێم ئەگەر سوڵتانی تورک، کە خۆی بە خەلیفە دادەنا، کورد و تورک و عەرەب و ئەرنەئووتی یەکسان سەیر بکردایە، بێگومان کوردەکە و ئەرنەئووتەکە پشکی گەورەیان دەبوو لە بەرەکەتی یەکسانی و بێفەرقی. هەروەها ئەگەر سۆڤێتستان کە دروشمی ئینتەرناشناڵی هەڵگرتبوو، لایەنی تێشکاوی داڵدە دابایە، دەبوو پشتگیریی کردبایە لە کورد دژی موستەفا کەمال وەیا قازی محەمەدی نەکردایەتە قوربانی نەوتی ئەزربێجان... بەڵێ نە سوڵتان و نە لینین و نە ستالین و غەیری ئەوانیش (غاندیی لێ دەرچێت) کەسانێک نەبوون بتوانن دەست بە داروەکازی «داد و ڕاستی»یەوە بگرن و وەک عومەری عەبدولعەزیزی ئەمەوی سەرلەبەری خەڵق بە یەک چاو سەیر بکەن و یەک کێشانەیان بۆ بەکاربهێنن کە دەزانین سوڵتان لە ژوورەکەی حەرەمی خۆی فەرقی لە نێوان جاریەی جوان و ناشرین دەکرد، لینینش لە ڕوانگەی فەلسەفەی سەر بە پرۆلیتاریا چەندەها هەزار کەسی دڵسوزی کوشت هەر چونکە دەیاندیت بەڵێنی بەر لە ساڵێک و دوو ساڵ دەکرایە پەت و دەخرایە ملی ئەو کەسەی سوور بایە لەسەر داواکردنی هێنانەدیی ئەو بەڵێنانە، لەوە بگەڕێ کە سەپاندنی سوڵحی برێستلیتوڤسک بەسەر ڕوسیادا لەلایەن لینین و هاوڕێکانی کورتبینیەکی زێدە بەسفتوسۆ و زیانبەخش بوو لە دوو سەرەوە، یەکێکیان ئەوە بوو کە بە پێی کتێبەکەی غورباتچیڤ «پیرسترۆیکا... ». ڕووسیا وازی هێنا لە ڕووپێوێکی خاکەکەی بە پەنجا ملیۆن دانیشتوەوە بۆ ئەڵمانیا، ئەوە بوو هەر لە هەمان ساڵی سوڵحەکەی برێستلیتۆڤسک ئەڵمانیا

شەڕی دۆڕاند و بەوەشدا هەلی بەشداربوونی ڕووسیا وەک شەریکێکی سەرکەوتووی تێشکانی ئەڵمانیا لە سوڵحی ڤێرسای دۆڕاند و قورسایی حاڵوباری گۆشەگیری و لاتەریکی و کاوێژکردنەوەی Phraseology بێ ناوک و بێ بنەما بۆ ماوەی ساڵەهای پشتشکێنی برسێتی و بێئومێدی لەژێر قەمچیی ستالینی بێڕەحم. لینین، خۆی، ئەسیری بریقوباقی نەزەرییەی سەرکەوتنی شۆڕشی پرۆلیتاریا بوو وەک کە لە کتێبەکەی «لینین: عن الامبریالیة والامبرياليين - دار التقدم، موسكو 1971» ئەم ئاگربارانە دەخوێنیتەوە:

«ولكن جميع الكاوتسكيين وهيلفردينغ والاكيين، ومارتوف وشركاؤهم، في الواقع متفائلون... من الانتهازية. وكل المسألة هنا، ان البروليتاريا هي نتاج من الرأسمالية العالمية، لا الاوروبية وحسب، ولا الامپريالية وحسب، ويقينا ان «الپروليتاريا» «ستكون» واحدة على النطاق العالمي بعد خمسين سنة أو قبل خمسين سنة... وبها ستنتصر الاشتراكية - الديمقراطية الثورية «بصورة لا مرد لها»...

دوای چەند دێڕێک دەڵێ:

«ان دعايتكم «للوحدة» مع الانتهازيين، مع ليغن وداڤيد، مع بليخانوف أو تشغنكيلى، وبوتريسوف، وغيرهم واضرابهم، انما تعني، موضوعيا، الدفاع عن استبعاد البورجوازية الامبريالية للعمال بواسطة خير عملائها في صفوف الحركة العاملة، ان انتصار الاشتراكية الديمقراطية الثورية على النطاق العالمي أمر محتم اطلاقا ولكنه سيجرى وسيجرى، يقوم وسيقوم ضدكم فقط وسيكون وسيكون انتصارا عليكم» (الكتابة من سنة 1916)

بێگومان لینین کە ژوانی سەرکەوتنی شۆڕشی پرۆلیتاریای جیهانی خستە دوای پەنجا ساڵێک تێبینیی حاڵوباری نالەباری کردووە کەوا ڕەنگە شۆڕشەکە نەختێک بوەخرێنێ دەنا بەڵێنی نەدەخستە پاش نیو سەدە... دیتیشمان شۆڕشی خودی لینین پاش سەرکەوتنی ڕووسیا و سوێندخواران لە شەڕی جیهانیی دووەم بە ماوەیەکی کورت هەرەسی هێنا.

به تێکڕایی هەرچی ئایدیۆلۆژیی ئایینی و غەیری ئایینی هەیە کە دەقەکانیان قاڵبەستوون و گۆڕان و سازاندن ناسەلمێنن، بە ناچاری و بە فەرمانی «بەدیهییەت» و حەتمی، دەبن بەو سەددەی پەنگاو بە ئاوی بێدەرفەت دەدات و بەرەو دواوەی دەگێڕێتەوە. لەوەشدا ئایین بەردەوامترە لە ئایدیۆلۆژیایی دنیایی چونکە سەر بە غەیبە و بەهەشت و جهەنەمی بە دواوەیە وەیا، هەرنەبێ، لایەنی «پیرۆزی - قدسية» لەو ئایینەدا کە بەتەمای ژیانەوەی دووبارەیە پتری دەژێنێ لە بیروباوەڕێکی سەر بە دنیای سیاسەت و ئابوورییەوە کە بە لای تەبیاتی مرۆوە بابەتی مامەڵەی بازاڕین، لەگەڵ ئەمەشدا دەشێ فکرەی سەر بە سیاسەت بەرگێکی قنجیلانەی قودسییەتی لەبەر بکرێت بەتایبەتی لە دوو مەیدانی: 1- نیشتمان 2- چین. لەوێشدا نیشتمان بەردەوامتر خۆ دەنوێنێ چونکە سیاسەتێکی «چین» دەیرازێنێتەوە بەرگەی گۆڕانی مێژوویی - کۆمەڵایەتی ناگرێت، مەگەر بەو شەختەگرتنەی ستالین سەپاندی بەسەر واقیعی سۆڤێتستان و بردیە قاڵبی قودسییەتی مەککە و ڤاتیکان.

وەک لە قسەکانمەوە بۆت ڕوون دەبێتەوە ئایین خۆڕسکە، سیاسەت و ئابووری دەستکردە، بەو پێیە ئەگەر هەردوو لا بدرێنەوە بە دڵ و دەروونی ئاپۆرەی هەرە زۆری پێنج ملیار مرۆی سەر ئەم زەوییە، بێگومان ئایین بە مەیدان پێش فکرەی دنیایی «وەک سیاسەت» دەکەوێتەوە. دەبێ لێرەدا بە مێشکی کرایەوە و چاوی بینا سەیری ئەم ڕاستییە گرنگە بکرێ کە هەر ئێستا بۆ خوێنەری دەربڕم: شەڕە دندووکێی ئایین و ئایدیۆلۆژیایی سیاسی، هەرچی هەیە با هەبێ و تام و شامی پێدا هەڵگوتنی بوتی تەقدیسکراو چەندێکی شیرن و تامەزرۆشکێنی دەم و شەویلەی مریدەکانی بێ، لایەنی ڕۆشن و ڕوونبینیی جیهانی زانست و تەکنیک و داهێنان و دۆزینەوە و کارگوزاریی شارستانەتی و گیانی بەرەوپێش چوون هەر خۆیەتی وەتەنگ دێت لە لەمپەڕ و کۆسپ و هەڕەشەیەکی کە بیری تاریک و جنۆکاوی و ئەفسانەیی ڕێگەی ئازادیی تەعبیر و ڕەفتاری دڵخوازی لێ وەتەنگ دەهێنێ،

وەک کە قەشەکان زانای فەلەکیان دەسووتاند لەسەر دانهێنان بە خولانەوەی زەوی، بگرە لەسەر دانهێنان بە خڕایی زەوی، و کۆلۆمبۆسیان بە کافر دادەنا کە دەیەویست بەرەو ڕۆژاوا تێبنێشێت بۆ گەیشتن بە هیندستان لە ڕۆژهەڵات... ماڵم هەقە مەلاکانی ئیسلامیش لە سەرەتای دەورانی تەرجەمەی زانستەکانی یۆنان چ نەما نەیڵێن لە تۆمەتی کافری و دەبەنگی دژی هەرکەسێکی پەڕەتیرێکی لەو زانستەی کافران تەرجەمە کردبێ وەیا بکات، تا ئەوەی هەندەسەش بە کوفر دانرا. بەڵام خۆو تاڵع خەلیفەکانی ئەو سەردەمە لە کەهەنووت نەبوون، تا وەهای لێ هات زانستی فەلەک (کە ئێستا دەزانین ئەو زانستە فەلەکەی یۆنانی هیچی بەسەر هیچەوە نییە، هەرچەند لەو ڕۆژگارانەدا نموونەی فکری ڕۆشن بوو) لەگەڵ قورئان گونجێندرا یاخود قورئانیان لەگەڵیدا گونجاند. هەر ئەم گونجاندنەش بوو وای کرد کە زانستی فەلەکی کۆپەرنیکۆس و گالیلیۆ لە لایەن مەلاکانەوە بە کفر حیساب بکرێت و کەسێکی بڵێ زەوی گەڕۆکە مولحید و زەندیقی پێ دەگوترا... لە ئایدیۆلۆژیای سەر بە فکری ماددی پرۆلیتاری و ئینتەرناشناڵیش دوژمنایەتیی ئەو زانستانە دەکرا کە بێنی بۆرژوازیی لێ دەهات وەیا دانی بە لکە زانستی وەک جەلبی ڕۆح و دوورەهەست و پێشبینی و خەونی ڕاست نابایە، کەچی بەو دواییە ڕووسەکان پتر لە ڕۆژاواییەکان ئاشقی ئەم جۆرە لکانەن وەک بڵێی تامەزرۆیی سەردەمی کۆنتر دەشکێنن بە تایبەتی هی دەورانی ستالین...

بێگومان خوێنەر دەبینێت و دەزانێت قسەکانی من سیخناخ نەبوون لە قەپێلکی تەسکی پرسیاری سەر بە ڕۆڵی ئایین لە دروستبوونی نەتەوە. خۆ کە هەڵوەستی ئایدیۆلۆژیای سیاسیم هێنایە جغزی پرسیارەکە لە ئاست فکرەی چینایەتی و نەتەوایەتی، بە ڕواڵەت لە بابەت دوور کەوتوومەتەوە: بەڵام بێگومان وەڵامی قوت و قرتاوی وەک: «ئایین ڕۆڵی نەبووە... ڕۆڵی کەم بووە... » دێتە ڕیزی بێ وەڵامی... تۆ دوو کەسی هەرە نەزان بێنە و لێیان بپرسە، ئایا بێرناردشۆ ئەدیبتر بوو یان هە.گ. ویڵز؟ ئەوجا ئەگەر

هەریەکەیان یەکێکی هەڵبژارد بێگومان یەک لەو دووانە ڕاستی گوتووە هەرچەند تەقەی سەری دێ لە پرسیارەکە و فەرقی ناکات لەگەڵ دونبەڵان و سێباز. لە نموونەی ڕوونکردنەوە دەڵێم، پارسییەکانی دانیشتووی هیندستان، بەزۆریش لە شاری بۆمبای، کە لە سەردەمی غەزای موسڵمانان هەڵاتن بە خۆیان و باوەڕی زەردەشتییانەوە تا لە هیندستان گیرسانەوە و گەورەترین بنگەی سەقافەتی سەر بە دینی زەردەشت پێک دەهێنن، هەرچەند بەشێکی زۆریان ڕەنگە کۆنە زمانی خۆیانیان هەر نەبیستبێ و لە باوەشی سەقافەتی هیندی و ئینگلیزی دەژین، ئایا بەر چ وەڵامێک دەکەون کە بپرسین: ڕۆڵی ئایینیان لە پاراستنی نەتەوایەتییان چی بووە؟ پرسیارەکە وەردەگێڕین و دەڵێین: ڕۆڵی نەتەوە چی بووە لە پاراستنی ئایینیان؟ وەک دەبینیت بابەتی ئەوتۆ هەیە وەک لاستیک لێک دەکێشرێتەوە و لەگەڵ بابەتی دراوسێی تێکەڵ دەبێتەوە. لە تەجرەبەی بەرچاو و هەستمان دیتمان ئەو برایەتی و یەکسانییەی لە سۆڤیەت کرابووە مەشقەڵی نێوان نەتەوەکان فرِی بەسەر ڕاستییەوە نەبوو، ئیتر ئازەری و ئەرمەن و جۆرجی و ئەبخاز، ڕووس و چەند گەلێک، گەلان، لە نێوان خۆیاندا یەخەگیری یەکتر بوون، لە دوورەوە ئیستیعمار دەیگوت: کوڕینە عەیب و شورەیی و نابەرژەوەندە ئەوەی لەگەڵ یەکتردا دەیکەن، تومەز سۆڤێتستانیش وەک یۆگۆسلاڤیا درۆیەکی زڕەدرۆی برایەتی و یەکسانیی بەسەر دەبرد... بە زەبری کوتەک! بەهەمە حاڵ، درۆکە و ساختەگەرییەکە بۆ ماوەی پتر لە پەنجا ساڵ ڕەنگێکی قاڵبگرتووی بەسەر ئەو گەلانەدا هێنابوو تا ڕادەیەک لەگەڵ بابەتی پرسیارەکەت جووت دەڕوات بەوەدا کە ئایدیۆلۆژیای سیاسیش لە هەلومەرجی «سازگار»دا دەیەوێ ببێتە «دروستکەری نەتەوە» چەنداوەکوو دروستکردنەکەش بیژۆک بێت. بێگومان لەم بوارەدا ئایین لە ئایدیۆلۆژیای سیاسی - بێ کوتەک - دروستترکەری شێوە و سیمای نەتەوەیە. جاران کە دەگوترا، فڵانە گەل دیندوژمنە ئەوپەڕی دزێویی وەپاڵ گەلەکە دەدا، تا ئەوەی لە مرۆی بەساڵدا چوومان دەبیست دەیگێڕایەوە کە لە ساڵی 1916 ڕوبەڕووی لەشکری ڕووس بووین لە

کوردستانی ئێران چەند ئەسیرێکمان گرتن خێرا شادەیان دەهێنا هەتا بە مسڵمانیان بزانین بەڵام دەرحاڵ دەمانتۆپاندن... ئەو عرووسی کافر!! تومەز ئەو ئەسیرانە لە مسڵمانەکانی ڕەعیەتی ڕووس بوون... بێگومان لەوانە بوو ئەگەر شادەیان نەهێنابایە سەلامەت دەرچووبان.

- دەکرێ ئایین وەکوو فکر و ئایدیۆلۆژییەک بخرێتە مەیدانی هەڵسوڕاندنی کاروباری سیاسی و ئابووری و ڕۆشنبیرییەوە و لەم ڕۆژگارەدا ئیدارەی دەوڵەتێکی پێ بکرێت؟!

نموونەی هەرە گەورەی دەست بدا بۆ ئەم پرسیارە دەوڵەتی «آیة الله»کانی ئێرانە لەگەڵ تێبینیی ئەوەدا کە ئەگەر ئایینەکە تەنها «وەکوو فکر و ئایدیۆلۆژیا» بوایە نەدەشیا تێکەڵ بە لایەنی «ئابووری» بێت چونکە نوێژ و حەج و عەزای «حسێن» هەقی بەسەر گوزەرانەوە نییە و خەتی گوزەریان ناگاتەوە یەکتر کەچی لەگەڵ کاروباری سیاسی و ڕۆشنبیریدا تا بڵێی شەیدای یەکترن، خۆ ئەگەر «ئابووری»ی ناپەسەند شەڕ بە میزاجی مەلای ڕەوزەخوون نەفرۆشێ هەر لە ئێستاوە هەتا ڕۆژی پێش قیامەت فرمێسکت بۆ دەبارێنێت. تێکرای بەرنامەی ئایینی و سیاسی، بە تایبەت هی ئایینی، بە ئاسوودەی دەنگی دلێرەوە بەر لەوەی بگاتە دەسەلات هانی خەڵک دەدات بۆ نارەزایی و شۆڕش دژی حکوومەتی کارگوزار، تا ئەگەر بەدبەختی، یەکێک لەو بەرنامانەی گەیاندە سەر تەختی حوکمڕانی، بە تایبەتی بەرنامەی دەرەوەی جغزی ئایین، لە هەفتەیەکدا کلۆڵی و بێچارەیی و سەرشێواوی و هیچ نەزانی دوچاری ئاستەنگی وەهای دەکات و خەڵکی پێوە تێ دەگلێنێت، هەرگیز حکومەتی کۆن قەزاو بەڵای ئەوتۆیی بەسەر میللەتدا نەهێناوە. قسەش لێرەدا لەگەڵ وڵاتە دواکەوتووەکانی خۆمانئاساییە نەک وڵاتە پێشکەوتووەکان کە دەمێکە لە قۆناغی هەرزەکاریی کاڵوکرچی چەپڕۆیانە تێپەڕیوەتن و واقیعبینانە دادەبڕن. ئا لەم ئاستەنگەی تازە باسم کرد

بەرنامەی سیاسیی دنیایی دۆشداماوتر دەبێ لە حکوومەتێکی وەکوو ئێرانی مەلاکان چونکە بایی ئەوەی پێرەوێک پێویست بێ بۆ کارگوزاری، خۆ و تالع، ئایینی ئیسلام ڕووپێوێکی بەرینی لایەنی ژیان و گوزەران و داد و بێدادی گرتۆتەوە و یاسای حازر بە دەستی هەیە بۆ کۆمەڵ کە بە ئەساس لەسەر ئەو یاسایە هەڵساوە. هەڵبەت مەلای تازەگەیشتوو بە حوکمیش ڕووبەڕووی واقیعێک دەبێ بە سیفەتی فەرمانڕەوایی کە ڕەوزەخوونی و فرمێسک هەڵڕژاندن تیماری دەردەکەی ناکات، ئیتر بە پێی ئیمکاناتی بەردەست کەلێنان دەگرێت و هەڵوەشاوان دەدوورێتەوە و کڵاوی عەلۆ لە سەری جەلۆ دەنێت، هەرچی سیاسییەکەی دنیاییە بەرشەقی هێندە خۆش نییە چونکە لە سەرەتاوە یاسا و نیزامی بەر لەخۆی تاوانبار کردووە ئیتر ناشێ بە هەمان ڕێگەدا بەرەوپێش بڕوات، ڕێگەشی لە واقیعی حاڵدا کوێرە و نەزۆکە. لێرەدا پێویستە تێبینییەکی بنەڕەتی بخرێتە بەر نیگای بینەر و خوێنەرەوە:

لەم جیهانەی سێیەمدا بە زۆری و لە هەموو بەرنامەی «شۆڕشگێڕ»دا، گەیشتن بە دەسەڵات لە ڕێی کوشتن و برین و سووتاندن و ڕماندنەوە دەبێت، جاریّ دیمۆکراسی لای ئەم تاقمانە بنێشتۆکەی سەرزارانە و بەس، لە زۆر حاڵوباردا تاوانباریش دەکرێ لەلایەن خوێنگەرمی بێرەحمی دڵکوێری هیچنەزان و جانەوەرسروشت کە دەڵێی تازە، دوێنێ و پێرێ، پێستی مەیموونایەتیی دارنیوە و نەشبووە بە ئادەمی. من ڕێ بە خۆم دەدەم پرسیارەکەت لە ڕووتەنی «فریضیة - گریمانە» وە ڕاگوێزم بۆ چرگەنی واقیعی سەخت، کە هەرگیز ناسەلمێنێ لە خەیاڵەوە ئایینێک بە یەک باز بگاتە سەر تەختی حاکمایەتی کەوا یەکسەر بێ سێ و دوو لێ کردن لە خەیاڵەوە کاروباری سیاسی و ئابووری و ڕۆشنبیری بە ملەوە بگرێت چونکە هاتنی خەیاڵی بۆ حاکمایەتی لێی خۆش دێت، کارگوزاری خەیاڵی بێت بێ کۆسپ و تەگەرە، ئەوجا ئەو جیهانەی تێیدا دەگاتە دەسەڵات، چ بە خەیاڵ چ بە کردەوە، ئەویش چۆڵێکی کاکی بە کاکی نییە مەلای ڕەوزەخوێن، یان گەنجی ناپوختە، تەراتێنێی تێدا بکات، تەنانەت ئەگەر لە دەوراندەوری مەلا و

قەشەی تازە حاکم هەموو حکوومەتەکان ئایینی بن ئەمجا درِدۆنگی و حەسوودی و خیلافیی بیرورِا و بەرژەوەند تێکیان بەردەدا و بە یەکتریان دەفۆتێنێ. هەروەها حکوومەتی خەیاڵکردی ئایدیۆلۆژی سیاسی، بارتەقای مەلا و قەشە، لەگەڵ هاومانەندی خۆی لە فکری سیاسی، با هەموو مارکسیست بن، دەکەوێتە شەرِەچەپەڵۆکێ و بە ناچاری نوختەی خیلاف دەدۆزێتەوە، هەر نەبێ بە نیازی خافڵاندنی میللەتی رِووتوقووت و، تا رِادەیەکیش، بۆ ئابرِووپارێزیی خۆی بە هانەی گۆمرِایی و خیانەتی دراوسێی ناپاک... وڵاتی پێشکەوتوو ئەو جۆرە مۆرفینە درۆزنە تێیدا موفلیس بووە تا ئەوەی بە دەگمەن نەبێ رِۆژنامەیەک جورئەت ناکات درۆ و دەلەسە تێک بەستێت، هەروەها رِێکخراوی سیاسی هەزار جار لێکدانەوە دەکات بەرلەوەی بوێرێ برِوایەک دەربرِێ لەگەڵ میزاجی خەڵک نەگونجی. نیکسۆن بە هەڵەیەکی بچووک لە سەرۆکایەتی هاتە خوار... ئیدن لە تێشکانی شەرِی کەناڵی سوێس رِووپەرِەی لە دەفتەری سیاسەت سرِایەوە... سەد نامی خوا لە سەرۆکانی جیهانی سێیەم بێ بە دەگمەن نەبێ کارێکی رِاست ناکەن و هەر لە گەشەکردنیشدان هەتا وەک، بزنەکی نانی شوان بخوات، ئەوانیش سەرەنگرێ دەبن. بەهەمە حاڵ چەندێکی بمەوێ وەڵامم بۆ پرسیارەکەت لە جەرگەی واقیعەوە بێ دیسانەوە لایەنی abstraction ی پرسیارەکە کە تێکەڵ بە واقیعی زەق و زۆپ دەبێ گەلێک دەربوونە دەکاتەوە بەملاوبەولادا باخصووص سەبارەت بە فرەچەشنبوونی واقع و فەرمانەکانی لە وڵاتێکەوە بۆ وڵاتێک، کە هەریەکەی بە پێی داخوازی حاڵوباری خۆی پرسیارەکە هەڵدەچەقێنێ.

لە نموونەدا دەڵێم: سعوودییە جێنشینی پێغەمبەرە و ماڵی خوای لێیە بە قەبری پێغەمبەرەوە، کەچی بەشێکی کاریگەری سپای ئەمەریکا مێوانیەتی. بەڵێ سعودیە خۆ لە «ربا» دەدزێتەوە، رِەنگە دەستی دزیش ببرِێت. وەک لە بیرمە ئەمیر و ئەمیرەیەکیشی بە کوشت دا لە پێناو پاراستنی ئابرِوو، بەڵام کاتێک هەرِەشەی عێراق چەند داوێکی مووی رِیش و سمێڵی هەڵکرِووزاند بە

سەدویەک فەتوا دەرگەی داخراو کرایەوە و پەندی «کە زۆر هات قەواڵە بەتاڵە» دە جاران بە ڕاست گەڕا...

من کە دێم ئەم نموونانە و، ناوناوە، لە برِیە بیروڕایەک دەردەبڕم، مەبەستمە چەندێکی بشێ ڕووناکی بخرێتە سەر پرسیارەکە و سەر بابەتێکی وەک هی پرسیارەکە، لە دەرەوەی جغزی ئایین، کە دەزانین، یان دەبێ بزانین، ئایدیۆلۆژیای دنیاش هەتا نەبێتە شێوە ئایین مرۆ گیانبازیی بۆ ناکات چونکە گیان بە کێشانە و پێوانەی دنیایی لە هەموو شتێک عەزیزترە هەتا دەیدەیتە تای تەرازوویەکی کە تایەکەی تری ئایینی تێخرابێ، زۆر جاران شەیدای ئایدیۆلۆژیا بە ڕکەبەری لەگەڵ ئاییندا دەبێتە سۆفی و دەروێشی پەرستگەی خوایەکی ئادەمی وەک لینین، ستالین، ماو و نازانم کێ. گەنجی شلک لە وڵاتی پێشکەوتوودا دەتوێتەوە لە شکۆی شەقوەشێنێکی یاری فووتبۆڵ وەیا کۆڵەمستی عەلی کلای بێ ئایدیۆلۆژی و دەردی سەر. کاوێژکەری ستایشی بوتی ئادەمی گەلێک پترە لەوەی بە خەیاڵدا دێت. گەلێک جار کە دەبینم خۆ دۆڕاندنی خەباتگێڕێک دەگات پلەی گەمژەڵی بە دەست خۆم نییە دەمارێکی masochismی تێدا ڕەچاو دەکەم چونکە بێگومان ئەو تەرزە خۆدۆڕاندووە لەو پلەیەش بەرەژێرتر دەچێت کە خوا - ئادەمییەکەی لێی داوا کردووە و دەیکات. لەو خەرمانە هەڕەمەی قسەکانم، کە هەندێکی زێدە کەمە لە چاو بارستی سەرجوملەی ئەو گەشتە حیکایەتبێژییەی کە لە پرسیارەکەتەوە ڕچە دەبەستێ، دەمەوێ وەک گوڵبژێر ئەم چەند دێڕە بکەم بە کۆتایی.

ئایین و هەموو لکەکانی بەرنامەی ئابووری و سیاسی دڵگەرم و هەموو بیروڕایەکی خودپەسەند کە بە عادەت لە گۆشەی ژوورێکی لاتەریکی کۆندیشناوی دروشمەکانی دەگەشێنێتەوە، ناشێ و نابێ و ناجایەزە و دژی بەرژەوەندە ئەگەر تەنگی هەڵچنی بە ئازادیی گوتار و کردار، ئەو گوتار و کردارەی زۆرینەی گەلی هۆش کرایەوە بە خوایشتی بێ فێڵ پەسەندی کردووە و بە تەجرەبەی نوێتریش ئاڵوگۆڕی تێدا دەکات. هەر زێدەڕۆیییەک، بە ناوی «چاکەی کۆمەڵ» لە ڕێی یاسای سەپێنراوەوە، ئەو ئازادییەی

داڵەنگاند، ستەمێکی دڕندەیە و ڕێ خۆش دەکات بۆ ستەمی گەورەتر. ناشێ بە ناوی دادی کۆمەڵایەتی لە چالاکیی بەرهەمهێن و خزمەتگوزاری کەم بکرێتەوە چونکە هەرگیز کەم کردنەوەی توانای بەرهەمهێن نابێتە پارووی برسییان و پۆشاکی ڕووتان. هەر ئامانجێکی بە چاکەی ئاپۆرەی خەڵک بکەوێتەوە گەڕ، هەرگیزاو هەرگیز پەکی نەکەوتووە و ناکەوێ لەسەر هەڕەشەی منداڵتۆقێن و بەستنی دەستی بەرهەمهێن. سۆشیالیزم و کۆمیونیزم، هەتا دەگاتە anarchism و ئەو بەهەشتە دنیاییەی خێرخوای دەروێش مەشرەب بە زەکات و سەرفترە دەیئافرێنی، تێکرایان و لەوانیش پتر بە ڕەوتی ئاسایی ڕووەو پێشەوەی ئازادیی کردار و گوتار، بێ قەمچی و دڵۆپێک خوێن و شەوێکی بەندیخانە، بێ هوتاف و بمرێ و نەژی، دەبێتە بەرنامەی ڕۆژانە. هەر کاتێک ئەم ڕەوتە ئاساییە بە ڕەوانبێژی و فەندی هەڵخەڵەتاندن و ترساندن وەستێنرا، ماڵم حەقە هەرچی خۆشی و ئازادی و کەرامەت هەیە دەبێتە وڕێنە و لەوچەلەوچ. جیهانی سێیەم جارێ دەستی ناگاتە ئاڵقەی دەروازەی ئەو جیهانەی ئازادیی گوتار و کردار... هەڵبەتە جیهانی سێیەمیش لە پشکی بەدبەختی، خواروژووری هەیە... لێی پیرۆز بێ!

- ئایا ئایین و سیاسەت پێداویستی یەک هاوکێشەن، یاخۆ دەکرێ بگوترێ: دوو جەمسەری جیاوازی پێداویستەکانی ژیان بن؟! جا لە دیدی بەڕێزتانەوە ئەم مەسەلە چۆن دەبینن؟

لە وەڵامدا دەڵێم: بە درێژی باسی پەیدابوونی ئایین و تەجریدی «پیرۆزی»م کرد کە بە پێی باوەڕی خۆم و واقیعی حاڵیش بە ڕۆژگارەها بەر لە پەیدابوونی سیاسەت، ئایین سەقامگیر بووە.

سیاسەت بە مەفهوومی سەلمێنراوی، لەگەڵ کمێک دوای پەیدابوونی حکوومەت سەری هەڵداوە چونکە لە خۆوە دیارە کە سیاسەت خەریکبوون بێ بە بابەتی ئەوتۆوە بەسترابێتەوە بە بەرژەوەند وەیا گەزەندەی گشتییەوە،

مومکین نییە بەر لە پەیدابوونی حکوومەت ئەو جۆرە بەرژەوەند و گەزەندە بڕسکیت، خۆ ئەگەر وردخوێنتر بین لە پەرتووکی ژیاریی «حضاری» ئادەمیزاد، لە سەرەتاکانی پەیدابوونی حکوومەت، زۆر بە تەنبەڵی و لەسەرەخۆ مەفهوومی بەرژەوەند و گەزەندەی گشتی خۆی جودا کردەوە لە هی ناوچەیی وەیا سەر بە مەرزبانێک و وەزیرێک و قوماندانێک کە ئەوانیش بە دەم ڕۆژگارەوە، لە پاش پەیدابوونی دەوڵەت، بوون بە بەشێکی گرنگی سیاسەت. لەوانەبوو پارێزگارێکی سەر تخووب خۆی گێل بکات لە پێوەندایەتیی پارێزگاکەی بە حکوومەتی مەرکەزییەوە «ئەم لایەنە و هی وەک ئەم، زۆرن قسەی لێوە بکرێت بەڵام ناتوانم خۆمی بۆ تەرخان بکەم» واش دەبوو لە دەرفەتدا ئاڵای یاخیگەریی دژی مەرکەز بەرز دەکردەوە چ بە نیازی جودابوونەوە بێت و چ بە نیازی خۆسەپاندن بێت لە شوێنی حوکمداری مەرکەزی، چونکە پێوەندایەتیی نێوان کەرتە جوداکانی هەرێم و مەرکەز و هی هەرێم بە هەرێمەوە هێندە چڕوپڕ نەبوو هەڵبڕینەوەی ئەستەم بێ، وەک حاڵوباری ئەم ڕۆژگارانە کە دەزانین ئەگەر مانگانەی مووچەخۆران لە مەرکەزەوە بۆ هەرێمەکان نەچێت نە پۆلیس و نە سەرباز و مووچەخۆر گوزەرانی نابێت و تا ڕادەیەک کاری سەلبیش لە بازاڕ و دەرامەتی هەرێمەکە دەکات. لە هەندێ کتێبی سەر بە مێژووی نەتەوە ئێرانییەکان بەر لە ئیسلام، بە تایبەتی هی سەردەمی ساسانییەکان، خوێندوومەتەوە کە سەرۆکایەتیی دەوڵەت و سەرۆکایەتیی ئایینی زەردەشت دوو هێزی یەکگرتوو بوون تا ئەوەی ئاڤێستای ڕەسمی هەبوو کارگوزاری بەرژەوەندی حکوومەت بوو و پێڕەوی لێ دەکرا بۆ بەڕێوەبردنی سیاسەتی حکوومەت، ئاڤێستایەکیش هەبوو لە سینەی مووبەد و هیربەدەکان ڕەنگی سەرەتایەتیی پێوە مابوو. ئاڤێستای ڕەسمی، بەپێی داخوازیی بەرژەوەندی شاهنشاهەکان و دنیادۆستەکان کە خۆپەرست بوون پتر لەوەی گەلپەرست بن، بەڵغێکی تاریکی ساختە و درۆی پێوە بوو چ گونجانی نەبوو لەگەڵ چاکەی بێدەسەڵاتان، ئەوساش نەتەوەی کورد کە چەندین سەد ساڵ بوو هێزی

زەمانی مادی نەمابوو لە پلەی چوارەم و پێنجەمی ڕەعیەتی دەژیا، چونکە کەسی دەسەڵاتداری سەر بە حکوومەتی نەبوو لە بەرەکەتی ئاڤێستای ڕەسمی پشکێکی بووبێت، هەرچی فارسەکە بوو دەیان، بگرە، سەدان ناوچەی هەبوو هێزی (ساتراپ)[4]و فەرمانرەوای ئوستان و مەرجەعی دینیی هەبوو، تێکرایان، بەرەکەتی فەرمانڕەوایی نەتەوەی دەسەڵاتداری بە بەشێکی بەرچاوی ڕەعیەتی فارس دەگەیاند. ئەمەش حاڵوبارێکە لەم سەردەمەدا بە کوردەوە دیارە بە پانایی کوردستان، کە هەمیشە ڕەعییەی کورد بێبەشتر بووە لە ڕەعییەی عەرەب و فارس و تورک. بێگومان ڕەعییەی کوردی سۆڤێتستان لە ڕەعییەی هەموو ئەو نەتەوانە بێبەشتر بووە کە دەوڵەتیان هەبووە، تێکڕای ئەوانیش لە ڕەعییەی مۆسکۆ و لێنینگراد بەرەژێرتر بوون. لە ئایینێکی وەکوو ئیسلامدا کە چەندین جار بە قورئان و حەدیس و فەتوای مەلاکانەوە یەکسانی و بێفەرقیی نێوان موسڵمانانیان ڕانواندووە، هەروا بە ئاسایی، قوماندان و والی و خەلیفە عەرەب بوون... وڵاتی بە شەڕ داگیرکراو هی لەشکری موسڵمان بوو کە لە 95%ی عەرەب بوو، ژنەکانیان جارییە و پیاوەکانیان عەبدی عەرەب بوون... «لسان اهل الجنة عربي»... هەرچی نووسینی خەڵکی داگیرکراو هەبوو لەنێوان بردرا... فەتوا دەرچوو لە بەشێکی مەلایان کە پیاوی ناعەرەب نەبێتە هاوکوفی ئافرەتی عەرەب، هەڵبەت سەلەبەری ئیسلام دەبێ ڕووەو قیبلە بێت و حەجی کەعبە بکات، مادەم بۆی بلوێت... دوای هەزار و هێندە ساڵە هیندستان و پاکستان لەسەر بنەڕەتی جوداوازیی دین بوون بە دوو، دواتر سێ، دەوڵەت.

بۆ پتر ڕوونکردنەوەی بابەتی پرسیار دەڵێم، تۆ لەوە بگەڕێ کە دوو دین لێکتر جودا بن چەندەها پێوەندایەتیی پەسەندی نێوان خەڵکی دوو دینەکە هەڵدەبڕێتەوە، کە دینیک مەزهەبی جودا جودای لێ دەکەوێتەوە بایی ژمارەی ئەو لکانە کەندەکی جوداوازی دەکەوێتە دینەکەوە، واش دەبێ دژایەتیی دوو مەزهەبی یەک دین دەگاتە پلەیەک دژایەتیی نێوان دوو دینی لە بیر دەباتەوە. ئەوەی قزڵباشی سەفەوییان بە سونییەکانیان کرد هەر دەبێ

سڵەواتی بۆ لێ بدەی... بەر لەوەش سوننییەکان پەرتان پەرتانیان بە شیعەی سەردەمی فاطمییەکان کرد، تا ئەوەی شتی وەها لێ باس دەکرێت دوورە لە هەرچی پێی دەڵێن «بەرژەوەند» با نەڵێم «انصاف» کە لە یەکەم هەنگاودا دەبێتە قوربانی هەوەسبازی.

وەک دەبینیت ئایین و سیاسەت هەر لەوەدا یەکتر دەگرنەوە کە تەرەشقۆی مێشک و دەروونی مرۆیە، وەک یاریی سێباز و ڕادیۆش هەر هی مرۆن و چ پێوەندایەتیشیان بە یەکترەوە نییە، بە بەڵگە ئەوەی کە سێباز بە سەدان و هەزاران ساڵ پێش ڕادیۆ پەیدا بووە. دۆستایەتیی نێوان پیاوانی ئایینیی زەردەشت لەگەڵ شاهنشاهەکان لە جەمسەری بەرژەوەندەوە سەری هەڵداوە نەک پێوەندایەتیی نەسەبی. دەشیا هەر هەمان دوو دەستەی پیاوی سیاسەت، هەر لە ڕوانگەی سوود و بەرژەوەندەوە یەکتر ببڕنەوە. لە میسالدا دەڵێم، ئومەوی و عەبباسییەکان گەورەترین دوژمنی ماڵی پێغەمبەر بوون. بەرژەوەند وەک خوێی چێشتە هەمیشە بزوێنەری هیممەتی مرۆ بووە، هەرچەند واش بووە کە ئەوەی بە بەرژەوەند خۆی نواندووە کوشندەترین زەهر بووە. دیاریدەیەکی سەیر هەیە لەو تێبینییەی «دوو جەمسەری جیاوازی پێداویستییەکانی ژیان» کە یەکێکیان ئایین و ئەوەی دیکەیان سیاسەتە. زۆر بە سەیری و بەدەم ڕۆژگارەوە ئایدیۆلۆژیای سیاسی بە پێی دوورکەوتنەوەی لە بەرژەوەندی «ناوەڕاست»ی کۆمەڵ و داکۆکیکیردن لە ئامانجی خۆشکەڵەی حەزبزێوی تێکەڵ بە تریفەی خەباتی پاڵەوانان و نزیکخستنەوەی «تێربوون و حەسانەوە» سەر دەگەیەنێ بەو حاڵەتەی دوچاری سۆفیی حاڵگرتوو دەبێ، کە هیچ پێوەندایەتیی بە پەنیر و هەنگوینی بازاڕەوە نییە، تا حاڵ دەگاتە پلەیەک تاکە حیزبێکی ئەوتۆیی لە ڕێی تەئویل و شەرح و پەراوێزکارییەوە دەبێ بە دوو کەرت و چوار کەرت، هەریەکەیان وەک دینێکی سەربەخۆ سێ دینەکەی تر بە کافر دادەنێت... نموونە لەم بابەتە نەفامییە هێندە زۆرە لە ئەژمار نایەت، تەنانەت ئەورووپای، لەچاو ڕۆژهەڵات، زێدە پێشکەوتوو بۆ ماوەی دەیان ساڵ ئەو دەروێشایەتییەی گرتەبەر... لە

بەهاری 1959 گوێت لێ دەبوو لە شیوعیی کورد دەیگوت، هەموو خۆشی و دارایی و کەیف شادی حازرە، هەر ماوە پڵاو و گوشت لە قاپان بکرێت، ئەمما پارتی لێ ناگەڕێ پڵاولۆغانەکە بگەڕێ. خولاسە ئایدیۆلۆژیی سیاسیی پەڕگیر بە ئاسانی دەبێتە ئایینێکی نوێ، چ خزمایەتییەکی لەگەڵ مەنتیق و هۆش و لێکدانەوە نامێنێ. ئەگەرنا چۆناوچۆنی گەنجی کوردی ئەورووپاناس دەڵێ، بۆرجوازیەتی لە کوردستان دروست دەکەین و دەیرمێنین، تاکوو تیۆریی قۆناغەکانی مارکسیزم بە ڕاست بگەڕێ! لەسەر بەردی ڕەقی کاولگەی کوردەواری. کاکە کورد، خەریکە کۆمیونیزم بە دنیادا بڵاوبکاتەوە!! کۆمیونیزمێکی بە پێی خاوەن نەزەرییەکە، پاش گەندەڵبوونی Bourgeoisie دێت کە دەزانین تا ئێستاش کورد لە خاوەنایەتیی خۆیدا تاکە بانکێکی نییە، نەخێر تاکە «صراف»ێکی نییە.

تا ئێستاش لەم جیهانەدا نەتەوە هەن لە گوزەرانی ناوخۆییدا سیاسەت پەیدا نەبووە، ئەگەر نەختێک بە وردی سەیری حاڵوباری تێکڕای کورد بکەیت دەبینیت یاخود دەتدیت، کۆمەڵگەی وەرزێر لە ئاست سیاسەتدا تەقەی لە سەریەوە دەهات، ئێستاش ئەو و کۆمەڵێکی زۆر لە خەڵقی شار، سیاسەت نەبۆتە هێوێنی گوزەران و بەرژەوەندی وەک کە شارستانییەکی سویسرە سیاسەت و ئابووری بە یەک چاو سەیر دەکات، چونکە نانەکەی بەندە بەو بەرنامانەی لەگەڵ داهاتی ڕێک دێن و لە دەمی هەڵبژاردندا هەر چین و تیرە و تیرێژە، بەرنامەیەکی بۆی دەست بدات دەنگ بەو دەدات، لەوە هەر بگەڕێ دەنگدانی کوردێک یا لەژێر هەڕەشەی بێگانە یاخود هی دەسەڵاتداری کورد بووە و دەبێ لە خەونیشدا بەرژەوەندی دەنگدەر دەخلی بەسەر هیچ حسابێکەوە نەبووە. بە خەیاڵ دەشێ دڵ بەوە خۆش بکەین کە بەشێکی کاریگەریی کوردی ئازاد و ئازا ببنە پاڵپشتی خۆیان و میللەتیان و بیروباوەڕی زۆرینەی کورد ببێتە یاسا و پێڕەو. بەڵام ئەم خەونە خۆشە جارێ زڕەخەونە وەک خەونی نوێژی نیوەڕۆ، دەبێ ئێوارە دابێت و ژەمی ئێوارە بەسەر چووبێت و خەو پێڵووی چاوانی بەسەر بیلبیلەکاندا بەردابێتەوە ئەوجا

خەونی ڕاستینە هەڵفڕێ بۆ ئاسمانی خولیا. جارێ ڕۆشنبیرەکانمان، بە زۆری، نوقمی دووبەرەکی و چوارشەقامی و هەشت باوەڕی هاتوون، هەر یەک لە ئاوازێک و بە سازێک لێ دەدات، خۆ ئەگەر تێکڕای کورد، یەک نەوا، کوردپەروەری یەک باوەڕ و یەک شەقام بن، ئەوجا ئەگەر باری ڕامیاریی جیهانی یاریدەدەر نەبێ، نە کورد دەتوانێ ئەو هەموو زنجیر و قەڵاو حەساری بە دەوریەوە، بە هێزی بازووی خۆی تەفروتوونا بکات، نە دوژمنەکانیشی وەها خاوپێچ کراون لێی غافڵ بن چی دەکات، نە ئەو وردە حکوومەتانەی بە قەدەر دەشتی شارەزوورن، بێ ڕەزامەندیی زلهێزەکان سمێڵ با دەدەن. لە موناسەبەدا ئەم وتووێژەت بۆ دەگێڕمەوە: لە کۆبوونەوەیەکی برادەرانەی چەند کورد و عەرەبێک لە ماڵی مەرحووم عەبدورەحمان موفتی لە پشووی بەر لە ژەمێکی چەور و شیرن، پاش ئەو ژەمەش، یەکێک لە برا عەرەبەکان باسێکی گێڕایەوە کە لە سەردانێکی ڕەسمی ئێران، لە دیدەنی ئاریامیهر، بە ناوی سەرۆک کۆماری عێراق لێی داوا کردبوو، کە بۆ ڕەواندنەوەی گومان، شا واز لە یارمەتیدانی مەلا مستەفا بهێنێ... شا گوتبووی ئێوە واز لە عەبدوناسر بهێنن، مەلا مستەفا وەکوو سیسرەیەکە لە نێو دوو پەنجەمدا. ئینجا ئەو برادەرە گوتی: چۆن ڕەوایە یەکێک زەعیمی گەلێک بێت قبووڵ بکات بچێتە بارێکەوە پێی بگوترێ «سیسەرەی نێو دوو پەنجان؟» من پێم گوتەوە: ئایا شای ئێران خۆی هێندەی سیسەرەیەک نەبووە لە نێو دوو پەنجەی ئەمەریکادا؟ کام سەرۆک دەوڵەت هەیە لەم جیهانە ڕەجاڵەی ڕۆژهەڵات سیسرە نەبێ لە لەپ و پەنجەی یەک و دووان لەم دەوڵاتانەی هەڕوگیڤیانە؟

بە هەمە حاڵ پرسیارەکەت زۆر دەربوونە دەکاتەوە بە دەوری خۆیدا. ئەگەر وازیان لێ بهێنم کەسەرێک دەخاتە دڵمەوە، ناشکرێ داستانی هەزار و یەک شەوە بۆ تاکە پرسیار بگرمە بەر. لە نووسینەکانی دەمی گلاسنۆست خوێندمەوە، شیوعییەک نووسیبووی, من مولحیدم بەڵام دەبێ لە ئاکامی پەروەردەبوونم بە بیستنی تەقدیسی خوا جوزئێکی خوا لە مندا هەبێ، ئەگەرنا

به ئادەمی حیساب ناکرێم. هەر خۆی نووسیبووی, فلان و فلان و فلان «کەسانێکی دەسەڵاتداری شیوعی» چونکە «خوا»یان تێدا نەبووە بۆیە هێندە دڕندە بوون. ئەم قسە پەرۆشدارە لە ڕووییێکی مەیلی جودادا بە کەڵکی پرسیارەکەت دێت. بەشی زۆری بیرکەرەوەی چەپ و ژمارەیەکی بە پۆزی غەیری چەپیش بە فەخرەوە دەڵێن: ئێمە مولحیدین، بەڵام چەپڕۆیەکە، بە تایبەتی، هەر لەو دەمەدا کە خەریکی ئینکارکردنی خوایە، ئاگای لە خۆی نییە خوایەکی بە سەنگ و پۆز و بە ترس و تەماع و شەهوەت و ڕق لە قاڵبی یەکێکی وەکوو ستالین دەپەرستێ، کە ئەگەر لە جیاتی ستالین خوای پەرستبایە یان بوتێکی بێنوتقی کردبایە خوا، بۆ خۆی و بۆ میللەتەکەی لە قازانجدا دەبوو. خوێندوومەتەوە، نووسراوە، ئەو کوشتوبڕینەی ستالین کردی بووە هۆی ئەوەی سەرژماری سۆڤێتستان لە جیاتی ئەوەی لە 400 ملیۆن تێپەڕ بکات گەیشتە 250، 260 ملیۆن... بەڕاستی قەسابی چاک بوو، ئێستا و تا ڕۆژگارێکی بیندرێژی دوا ڕۆژیش هەر بە فەرخەخوا دەمێنێتەوە. لێرەدا بۆ خۆت لێکدانەوە بکە، جەمسەری سیاسەت و ئایین بە چ ڕێچکۆلەی پێچەڵپێچدا دەگەنەوە یەکتر، کە دەبوو ئەم تەرزە پێکتر گەیشتنە بەولای موستەحیلەوە بێت. ماشەڵڵا کێم ئێل سۆنگ خوایەتییەکەی خۆی بە میرات بۆ کوڕەکەی بەجێ هێشت. لێی پیرۆز بێت!!

- ئایا بەڕێزتان دەگەڵ بیروبۆچوونی ئەو کەسانەدا یەک دەگرنەوە کە پێیان وایە ئایین بە تایبەتی ئیسلام کۆسپ و تەگەرەی سەرەکیی گەشەنەکردن و بەرەوپێشەوە نەچوونی ئەو وڵاتانەیە کە ئایین تێیدا باڵادەست و دەستووری ژیانە، لە کاتێکدا دواکەوتوویی و هاوشان دەرنەچوونی ئەو وڵاتانە دەگەڵ زانست و تەکنۆلۆژیا و شارستانەتیدا بەڵگەی بەرچاو و هەستی ئەو ڕاستییەن؟

بمبەخشە ڕەخنە لە وشەی «تیایاندا» بگرم کە بریتییە لە «تێدایاندا» و دالەکەی سوواوە بە پێی ئاخێوەری سلێمانی. ڕاستە وشەکە «تێیاندا»یە وەک «تێیاندا» - «تێماندا». «تیا» دەگرێتەوە وەک کە نالی دەڵێ «... هەر دەڵێی مانگە شەوە کوڵمی تیا» واتە:کوڵمی تێدا نەک «کوڵمی تێ». وشەی «جیا، جیاوازی»یش زاری ناوچەیی سلێمانییە، دەبێ «جودا، جوداواز» بنووسرێت مادەم نووسینەکە پێڕەوی بکات لە دەستووراتی زمانی ئەدەبی. دەشێ لە شیعر، لە وتووێژ، زاری ناوچە بەکار بێت، بەڵام ناشێ کۆیی و ڕەواندزی و دزەییاتی بنووسن «ماری حەرار» لەجیاتی «ماڵی حەڵاڵ»، بە بەهانەی بەکارهێنانی زمانی، یان زاری ناوچەیی... ناشێ «دەخوێنمەوانێ» بەسەر زمانی ئەدەبیدا بسەپێ چونکە لەوانەیە یەکێکی بالیسانی بڵێ «ئەم مریشکەوانێ کورکە... »... هتد! وشەی «شارستانییەت»یش کوردی نییە چونکە ڕێژەی «مصدر صناعي» وەیا «نسبة»ی عەرەبیی بەکارهێناوە، دەبێ: «شارستانەتی» - بە کورتکردنەوە لە «شارستانیەتی» - بە کار بێت دەنا دەبێ لە بری «باوکەتی» و «دایکەتی» «باوکییەت» و «دایکییەت» بەکار بهێنین...

پرسیارەکە بەو جۆرەی داڕێژراوە و ناوەڕۆکی پەیداکردووە، دوورە لە ڕووداو. بەڵێ، لە سەرەتادا وەکوو هەر بیروباوەڕێکی تازەداهاتوو، چ گوتە و کردەیەکی لەگەڵ دەقی زەق و زۆپی ئایینەکە ناجۆر بووبێت تا ڕادەی تەفروونوون کردن دژی وەستاوە، بەڵام ئەگەر ڕێکەوتیش بێ، تەورات و ئینجیل و تا ڕادەیەکیش ئاڤێستا «مەبەست ئایینی زەردەشتە نەک کتێبی ئاڤێستا» کە چەپارە دران لە تۆمەتی «شرد و الحاد» ئەو داخراوییەی «تاکە باوەڕ»ی نەختێک لەبەر یەک کێشایەوە و یەکنەوایی «مزگەوتایەتیی» بۆ پەرستگە، کرد بە سێ نەوایی و پتریش کە دەزانین «مسیحیة» چەندین مەزهەبی لێکتر جودای هەبوو بە خۆی و فەلسەفەیەوە، چ جایی ئەوەی کە خەڵقی ئەوسا لێکدانەوەیەکی خۆی نەبوو بەرهەڵستی فەلسەفەی دنیایی وەیا بیر و باوەڕی ئایینی پێوە بکات، مەگەر لە کولانەی عەینی باوەڕە دینییەکەی

خۆیەوە، بێ بەڵگە و دەلیل و بێ بینینێکی سەر بە لێکدانەوەی هۆشەکی، باوەڕی غەیری خۆی ڕەفر بکات وەک کە عەرەبی حیجاز بە دەوری کەعبە و بوتخانەکانیانەوە بە گژ ئیسلامدا دەچوونەوە، کە هەر نەبێ ئیسلام لە پەرستنی بوت و سەنەمەوە بۆ پەرستنی تاکە خوای ئافەریننەدەی جیهانەوە دەچوو. دەبێ بزانین فەلسەفەی یۆنان و زانستەکانی، لەدەمی هاتنی ئیسلامدا، خەفە کرابوو لە لایەن مەسیحییەتەوە، کە دەسەڵاتی ڕۆمانەکانیش پشتگیرییان دەکرد لەو خەفە کردنە، بەوەشدا ئاشکرایە ئیسلام یەکەم هێزی تازەپشکووتوو نەبوو ڕێی سەقافەتی یۆنانی کوێر کردبێتەوە، دروشم و ڕێ و ڕەسمی تەورات خەریتەی جیهانی کێشابوو بۆ پێڕەوانی ئایینی ئاسمانی، هەرچەند جوولەکەیەتی، خۆی، چ دینێکی دوای مووسا غەیری تەورات هاتبێت، هەمووی بە درۆ دەخستەوە بەڵام نەیدەتوانی، بەڵکوو نە دەشیا بۆی، مەنعی مەسیحی و مسڵمان بکات لەتەسدیقی ڕاگەیاندنەکانی خۆی.

ئێستا، بۆ پشوویەک هەل بە خۆمان بدەین، تەجرەبەیەکی خەیاڵی بخەینە مەیدانی دەمەتەقەی نێوان ئیسلام و دوو دینە ئاسمانییەکەی تر، بەوەدا کەوا ڕابنوێنین ئیسلام لە زانستەکانی یۆنان بەسەر فەلەکناسییەکەیاندا کەوت و باوەڕی پێ هێناو یەخەگیری مەبدەئی خەڵقی جیهان بوو، گویا خوا لە شەش ڕۆژاندا لێی بۆوە و ڕۆژی شەمۆ بە پێی تەورات خۆی حەساندەوە، گوتی ئەم شەش ڕۆژە ئەفسانەیە و خەڵقی جیهان وەها نەبووە و فەلەک نۆن نەک حەفت، ئایا ئەو ئیسلامە بەو بینینە کە ئایینی ئاسمانی لە بنەڕەتەوە دەڕمێنێ، چۆناوچۆنی خۆی بەسەر عەسای وەحیەوە ڕادەگرێت لە حاڵێکدا وەحی بە درۆ خرابێتەوە و بنگە بنەڕەتییەکانی ناو تەورات کە جیهانی دیار و پەنامی لەسەر هەڵنراوە فشابێتەوە؟ کە ئادەم و حەوا و سەرلەبەری حیکایەتی شەیتان و دارگەنمی بەهەشت و هەرچی پێغەمبەری دوای ئادەم ناویان هاتووە هەمووی درۆ و فیشاڵ بن، چۆناوچۆنی ئیسلام بەو ڕووداوە خەیاڵییە نەبێ، نەبێتە دینێکی پێشرۆ کەچی دەقی پرسیارەکەت وا ڕادەنوێنێ لەو ناوەدا هەر ئیسلام لەمپەڕی بەر هەنگاوی ئەو گەلانەیە بەرەوپێش ناچن، وەک بڵێی هەر

ئیسلام پێی داگرتووە لەسەر ئەفسانەی خەڵقی شەش ڕۆژە، خۆ ئەوەی ڕاستی بێ بەینێک دوای بەسەرچوونی دەوری «خولەفای ڕاشید» کتێبەکانی زانستی یۆنانی تەرجەمەی عەرەبی کران. لە سەرەتاوە مەلاکان بە گژیدا چوونەوە، بەڵام گوشاری ئەو زانستانە دریان بە لەمپەڕ و مەمپەڕ دا و وڵاتیان تەنییەوە تا وا بوو قورئان تەئویل کرا بۆ بەرتیشکی فەلەکییاتی بەتلەمیۆس، لە هەمان کاتدا قەشەکان سوور بوون لەسەر قسەی کۆنیان... بەڵام بەر لەوەی بگەینە ئەم قۆناغەی 150 ساڵێک دوای سەرەتای ئیسلام، هەر لە دەورانی پێغەمبەر و یارانیدا، قورئان و شەخسییەتی پێغەمبەر و مەتانەتی سەرامەدانی «صحابة» تەقڵەیەکی بەرەژووری ئەوتۆی بە نەتەوەی عەرەبی نەجد و حیجاز و پەراوێزەکەی لێ دا و ماوەیەکی وەها بیندرێژی لە کاتێکی کورتدا بەو نەتەوەیە بڕی گەلێک بەولای خەون و خەیاڵەوە بوو «بۆ دوو دەقیقە عەرەبی ئەوساکە و کوردی هەرێم بە یەکتر بگرە و بزانە موحەمەد و قورئان چ موعیجیزەیەکیان لە نامومکینەوە کرد بە مومکین».

بەر لەوەی قەڵەم بگێڕم لە ڕەشنووسکردنی وەڵامی پرسیارەکەت، بەو جۆرەی کە لە ئیمکاندایە و پۆڕگی هەناوی مرۆی عادەتی پێ هەزم بکرێ، دەبێ بە خوێنەر بڵێم، چی ئیسلام بۆ عەربی کرد نە هەرگیز پێشتر دەیەکی ئەوەش کرابوو، نە هیچ بورکانێکی دیکەی سەر بە کۆمەڵ دەیتوانی عەرەبی ئەو سەردەمە لە خەوی بەداوەت هەڵستێنێ بۆ جیهانگیری. مێژوو بۆمان دەگێڕێتەوە بەر لە ئیسلام، عەرەب لە نەجدەوە بۆ «فیرتل کریسنت - الهلال الخصیب» بارەها ڕۆیشتوون بەڵام بێ هیچ مایەیەک و ئاکامێک و دەنگ و سەدایەک. بەڵێ: جەنگیزخانیش وڵاتی گرت و وەک برووسکە کەوتە گیانی خەڵک، بەڵام هەر چونکە قورئانی نەبوو بێ سەر و شوێن مایەوە و نەتەوەکانی لە قورئاندا توانەوە. بیریار چەندێکی دژی غەیب و ئەفسان بێ ناشێ خۆی وەها گێل بکات چاو لە دیاردەی بێ پێشینەی «محمد و قورئان» بچووقێنێ. دەبێ بیریاریش دان بەوەدا بهێنێ کە ئەگەر موحەمەد بە مەنتیق و فەلسەفە و هەندەسە خەڵکی بانگهێشتن کردبایە بۆ جیهانگری هەزار و

یەک و دەهەزار یەکی ئەو خەڵکەی بە دوا قورئان کەوتن نەدەهاتنە ڕیزیەوە، کە دەزانین فەلسەفە و مەنتیق و هەندەسە ناویشیان نەبیسترابوو لە حیجاز. ئەوەی پێی دەڵێن جیهانی مەسیحی و مەشوورە بە پێشکەوتن، لە ئینجیلەوە ئەو پێشکەوتنە نەباری، بگرە قەشە شەڕی لەگەڵ زانست دەکرد بە گوتنەوەی دەقەکانی ئینجیل و تەورات... خۆ و تالعی مەسیحییەت، مەڵبەندی سازگاری ئەورووپا تۆوی ئینجیلی لێ ڕوا. خەڵکەکە بە ئەرکی خۆی دەبوو بە ڕۆشنبیر و زانا و لێهاتوو. تەنانەت زۆریان لە دڵدا وەتەنگ دەهاتن لە ڕاگەیاندنەکانی قەشەکان، هەر نەبێ لەبەر ئەوەی کە هەمیشە بیروڕای سەر بە زانست، لەلایەن ئایینەوە قەدەغە دەکرا و بە کوفر دەژمێردرا... دیانەتی مەسیحی بە خەڵکەکەوە سەربەرزە نەک بە عەکسەوە. فەرموو سەیری دیانی هەرمۆتە و بێتواتە و عێنکاوە بکە، کوێی ڕۆشنترە لە موسڵمانەکە.
ڕاستییەکەی بێ لایەنگیری و بێ دڕدۆنگی، زانست و ڕۆشنبیریی ئەورووپا گەلێک دۆش داماو بوو بەدەست کەنیسەی بەر لە دەورانی ڕێنێسانس، کە حوکمی پاپا و سەرۆک کەنیشتەکان بە کافر کردن و بە بەخشینی پاش مەرگ، مەلیک و مەزنە پیاوی هەرە پێشەوەی کۆمەڵی دەگرتەوە. کە بڕیاری ئافەرۆزکردنی مەلیکێک لەلایەن پاپاوە دەردەچوو (وەک لە کتێبانم خوێندۆتەوە) تەنها بە گەردەنکەچی و تەسلیمبوونی مەلیکەکە بۆ فەرمانی پاپا چار دەکرا. حوکمی ئەوتۆیی لە ئیسلامەتیدا بە دەست هیچ لایەنێکی ئایینییەوە نەبوو. تەنانەت خەلیفەی دەورانی ئومەوی و عەبباسیش لە خۆوە و بێ بوار لەو خوڕاوەی نەداوە... وەنییە لە ڕێکەوتەوە بێ، کە شەریعەتی ئیسلام بەسەر زۆربەی هەرە زۆری حاڵوباری دینی و دنیایی ڕاگەیشتووە، چونکە قورئان و حەدیس بە دەقەکان و بە لێهەڵهێنجان و پێوانە لێ کردنیان لەلایەن مەلا موجتەهیدە زلەکان (کە 16 موجتەهیدی لێ سەلمێنراو هەبوون لە مەزهەبی سوونە، بەڵام تەنها چواریان ئیجتیهادەکەیان بوو بە مەزهەب، سەبەب بەهەندێ کە لە دوا خۆیان، ئەو دوازدەیە، تەڵەبەی لێهاتوویان بەجێ نەهێشت. دەوام بە حوکمی ئیجتیهادەکەیان بدات..) چی بە بیردا هاتبێ لە

کێشەی ئەوتۆ داوای بڕیاری «قانوون» بکات حوکمی بۆ دیاری کراوە، ئیتر مەلاکان بە پێی تێگەیشتنی خۆیان فەرمانی شەریعەتیان دەستنیشان کردووە، لەمەشدا «فرەوانی» هەیە نەک «تەسکی»، کە دەزانین لە دەمی دەسەڵاتی لینین و ستالین و ماو و کیم ئیل سۆنگ، ڕێ بە کەس نەدراوە ڕەخنە لەو وەکیلانەی «خوای سەر ئەرز» بگرێ وەیا تەئویلی تێدا بەکار بهێنێ. تا ئەم دەمەش سۆفی و دەروێشی شیوعییەتی نسکۆهێناو، ماددییەی تەئریخی و ئیشتراکییەی عیلمی و شۆڕشی پرۆلیتاری جیهان بە سێ چەرخەی بایسکلی پێشکەوتنی حەتمی دەزانێ (بایسکیل، واتە: دوو چەرخە. بەڵام لە کوردیدا خۆی بەسەر سێ چەرخەشدا سەپاندووە).

با بچینە سەر دەقی پرسیاری پێنجەم کەوا بێگومان هەویرەکەی لە ڕادەبەدەر ئاوخوازە، سرکە و کورکە تێداکردنیشی هەتا بڵێی هەستیارە، کەسیش بە تەما نەبێ شڵەقاندنی گۆمی داوەستاوی بیروباوەڕی ڕەگ داکوتاو بە پەندی پەندیار و پیتۆڵی هۆشدار و بەڵگەی بێ کەلەبەر، خێرا خێرا گومڕایان دەهێنێتەوە ناو جغزی بیری ڕووناک. بە پێچەوانەوە، هۆشی جنۆکاوی و کاوێژکەرەوە و بەخۆوە گلاو، هەتا بڵێی قینی لەو بیروڕایەیە کە ڕیسی لێ دەکاتەوە خوری... لەم نووسینەی بەر دەستیشدا بە تەما نیم خەریک بم مەتەڵی دواکەوتوویی و پێشکەوتوویی میللەتان بخەمە بەر چرای تیۆرییەکی تازەزادی کەس نەبیستووی دڵنیاکەر، کە من لە گۆشەی تەوازوعکارانەی لێکدانەوەم تا ئێستا بۆم ڕوون نەبۆتەوە، ئایا بۆچی هیندییە سوورەکانی ئەمەریکای باشوور تا دەگاتە سنووری U.S.A حکوومەتیان هەبوو بەر لە کۆڵۆمبۆس. شاری سەد هەزار نفووسیان هەبوو، بەدەم ڕۆژگارەوە لەگەڵ ئەورووپاییەکان ئاشنا بوون تا ئەوەی بەشێکی بەرچاوی دانیشتووانی ئێستایان (mestizo)ن کە دوو ڕەگەن لە ئەورووپایی و هیندیی سوور، کەچی دانیشتووانی U.S.A و کەنەدا لەگەڵ ئەو هەمووو هەمواریيەی خاک و هەوا بۆ پێشکەوتن هەر لە دەوری گوندنشینی و عەشیرەتی مانەوە، قەتیش لێیان خۆش نەهات لەگەڵ ئەورووپاییان ئاشنا بن، بەر لە دەساڵێک ئەم پرسیارەم

خستە بەر بیری مامۆستایەکی عێراقی کە ئەوسا حەوت ساڵ بوو لە جامیعەی کالیفۆرنیا دەرسی بە قوتابیان دەگوتەوە، هەر ئەوەندەی پێ گوتمەوە کەوا تا ئەم دەقیقەیە شتی ئەوتۆیی بە بیردا نەهاتووە و لە کەسیشی نەبیستووە. بەو دواییە کەوتە بەرچاوم، یەزتێکەکان جۆرە نووسینێکیشیان هەبووە...

لەگەڵ ئەمەشدا کە ناتوانم تیۆری دابنێم بۆ ڕەوتی مێژووی هەر گەلێک کە جودای دەکاتەوە لە ڕەوتی گەلێکی دیکە (ئەگەر گەلاڵەی بیرێکی ئەوتۆیشم هەبێ، لە ئیمکاندا نییە بەبەریەوە بنیشم چونکە باسەکە کاری ئەوە نییە بکرێتە ناواخنی باسێکی سەرەکی... لێ بوونەوەی نامومکینە) دیسانەوە ڕێم هەیە، وەکوو هەر کەسێکی بیەوێ بیروڕای خۆی دەربڕێت، چاوێک بە ئەحواڵی کۆن و نوێی ئەو گەلانەدا بگێڕم کە مسڵمان نین و لەگەڵ حاڵوباری مسڵمانانی بەراورد بکەم. هەڵبەت ناشێ عەرەبی پێش ئیسلام بگرم بە گەلانی هاوقۆناغی ئەوسای عەرەب، چونکە مەبەس سەنگاندن و نرخاندنی کاری سەلبیی ئیسلامە لە دواکەوتوویی مسڵمانان و دابڕانیان لە قافڵەی ئەهلی زانست و تەکنیک کە مسڵمان نین. بەڵام لە نوختەی نیگای ئەو ڕاستییە زلەی کە ئیسلام خۆی درێژەکێشانێکی بەرەژووری تەورات و ئنجیلە، هەر لە دیدی سەلبی و ناسەلبیی ئایینەوە دەتوانین تەورات و ئنجیل بەو سەقافەتە زێدە پێشکەوتووەی یۆنان بگرین کە دوای تەورات و بەر لە ئینجیل گەشەی کرد و بوو بە مەشخەڵی دوارۆژ و تا ئێستاش. تەورات بخوێنەوە و بەو سەقافەتەی بگرە و پێم بڵێ لە کام گوتە و بۆچوون و شیتەڵکردن و «تسبیب»ی ئەم جیهانە یەکتر دەگرنەوە؟ کە تەورات بۆی نەلوا بە گژ سەقافەتی یۆناندا بێتەوە، چونکە جارێ ئەو سەقافەتە لە منداڵدانی مێژوودا پەنهان بوو، خۆ دواتر کە ئینجیل بوو بە میراتگری «عهدی قدیم - تەورات» و دەسەڵاتێکی پەیدا کرد لە ڕێی دەسەڵاتی ڕۆمەکانەوە، کە بوون بە مەسیحی، دەزانین چۆن ئەو زانست و سەقافەتە بە کوفر و Heresy حیساب کرا و دەرگەی لەسەر داخرا. کێ دەیوێرا بڵێ زەوی خڕە؟ یان

ڕۆژگیران و مانگیران بداتەوە بەو هۆیە ڕاستینەی کە فەلەکناسیی یۆنانی بەر لە مەسیح بە 500 ساڵ زیاتر مەتەڵەکەی یەکالا کردبوو. زۆر بە سەیری و بە پێچەوانەی ڕاگەیاندنی پرسیارەکەت، جیهانی ڕۆشنبیریی پتر لە حەفت سەد ساڵ دوای مەسیح چاوەنۆڕ بوو هەتا زاناکانی ئیسلام دەرگایان لەو سەقافەتە ڕۆشنە بەندیکراوە کردوەو و بە خەڵکی ڕاگەیاند ڕۆژگیران و مانگگیران کاری شەیتان و جنۆکە نییە، دیاردەیەکی فەلەکی و بەدیهییە، بەڵێ دەزانم ئایینی ئیسلام هەروەها لە خۆوە بە دەقی ئایەت و حەدیس نەهات تێمان بگەیەنێ فەلەک چییە و لە قوتبەکان شەش مانگ شەوە و شەش مانگ ڕۆژە، بەڵام دەبێ دان بەو ڕاستییە تەئریخییەدا بهێنین کە قەشەکان دەرگەیان لەسەر ئەو فەلەکناسییە داخست و مەلاکانی ئیسلام دەرگایان کردەوە... مەلاکانی ئیسلام بوون فکری فەلسەفییان هێنایە مەیدانی عەقیدە و تێکەڵ بە ئایینیان کرد تا ئەوەی زانستی «کلام» بەرهەمی بەرتەکی گوشاریی فەلسەفە بوون لەلایەن عەقیدەوە، کە خۆی بەسەر داروەکازێکی مەحکەمەوە ڕابگرێت و چەژێکی عیلمانی بە دەقە سادەکانی بەڵگەی میراتی ببەخشێت... هاتنی «فی ستة ایام»یان گێڕا بە «ستة اوقات» و عەرش و کورسییان بە دوو فەلەک حیساب کرد تاکوو ژمارەی نۆ فەلەکی یۆنانییان لەگەڵ «سبع سماوات» ڕێک بکەوێت... فەیلەسووفە ئیسلامییەکانی ناعەرەب وەک «ابن سینا» لە «قدم العالم - کۆنیی جیهان» دەدوان بە پێڕەوی کردن لە باوەڕی یۆنانییان کە ماددە لە عەدەمەوە پەیدا نابێ، تەنانەت بەڵگەیەکی مەیلەو بێهێزیشیان وەپاڵ دەنا کە دەیانگوت: خوا ئەگەر جیهانی لە هیچەوە هێنابێ خۆ دەبێ لە دەمێکی مەعلوومدا خەڵقەکەی کردبێ، ئەوسا پەسەندکرنی ئەودەمە بۆ خەڵق دەبێتە «ترجیح بلا مرجح» چونکە دەمی پێشتر و پاشتر هەر لە ئەزەلەوە هەتا ئەبەد چون یەکترن... گوشاری فەلسەفە گەیشتە ڕادەیەک «ئیمامی غەزالی» کتێبی دانا بە سەرناوی «تهاتف الفلاسفة»، یەکێکی وەکوو «جاحظ» قسەی بەرەیەک ڕەت دەکاتەوە کە لە ئاست ئایاتی «کونوا قرتدة خاسئین» گوتوویانە. ئێمە

دەسەلمێنین بەپێی حاڵوباری گەرمی و ساردی و بەرزی و نزمی و خاسییەتەکانی جێگە و دەوروبەر، جۆرە گوڕانێکی ئاسایی پەیدا ببێ لە شکڵ و سیفەتی جانەوەر، بەڵام نایسەلمێنین یەکەندەردوو مرۆ ببێتە مەیموون...
دەبینیت ئەم ڕایەی زەندیقان باپیرە گەورەی بیروڕای داروینە کە نزیکی 1000 ساڵ دوای ئەوان هاتووە... نموونەیەکی دیکەی ئەم بابەتە لە لاپەڕە 311، 312 ی کتێبی «رسائل فلسفية»ی «ابوبكر محمد زكريا الرازي» دەخوێنیتەوە کە لە موناقەشەدا دەڵێ: حەرەکە دوو جۆری سەرەکیی هەیە «طبيعي و قسري» یەکێکی تریشی هەیە «فلتی». ئەم حەرەکەیەی «فلتی» هەر خۆیەتی لەم سەردەمەدا دەگوترێ «Critical point، نوختەی تەنگەتاوی» کە «چەندایەتی» دەگۆڕێ بە «چۆنایەتی»، بەڵام بە جۆرێکی سەرەتایی دەربڕاوە، بە پێی سەردەمێکی هەر هێندەی بەبەرەوە بووە.

نموونەیەکی زۆر گوتراوی فڕینەکەی «عباس بن فرناس» کە پەڕ و باڵی لە خۆی ئالاند و لە بانێکەوە فجووقی بەست و کلێنجەی شکا، هەرچەند یەکجار سادەلەوحە و دوورە لە تەکنیکی فڕین، دیسانەوە دوو نوختەی نیگاڕاکێشی تێدایە، یەکیان ئەوەیە کە گوشاری زیندوویی کۆمەڵگەی ئیسلام پاڵی ناوە بۆ ئەم کارە. دووەمیان ڕوبەڕووبوونی ئایەتێکی قورئانی تێدایە لەبارەی فڕینی مەلەوە «... لا يمسكهن الا الرحمان... » واتە هەر خوا بە هەواوەیان ڕادەگرێ «سورة الملک، آية 19»[5]. لەمیاندا جۆرێک قیاسی زرینگ و زیت هەیە کە بە زاهیر فڕینی مەل لە ئایەتەکەدا هەر بۆ مەلە. ڕەنگە فەرناس دیبێتی پووش و پەڵاش بە دەم باوە ڕەهەوا دەکەون، ئیتر جورئەتی بە خۆی دابێت و چاولێکەریی ئەوانی کردبێت.

بۆ پێش ئیسلام بچینەوە و بزانین گەلان چۆن بوون لە چاو یەکتر. هاخامەنشییەکان هاوڕۆژگاری فەلسەفە و زانستی یۆنانی بوون و چ گیرۆدەی ئیسلامەتیش نەبوون کەچی کەم و زۆر بە لای ئەو سەقافەتەدا نەچوون. فکریشیان بەند بوو بە باوەڕێکی لە ئاڤێستاوە هاتبێت و هەندێ پەند و حیکایەتی ئەفسانەیی کە زۆر و کەم لە نەتەوەکاندا دەدیترێت و دەبیسرێت...

دابەزە بۆ سەردەمی ئەشکانی و ساسانییان. وەک بزانم گەشترین بەرهەمی عەقڵی لە هەموو ئەو دەورانانەدا نووسینەکانی «مانی» بوون کە بە داخەوە تاکە یەک لاپەڕەی دەستی من نەگەیشتووە، هەرچەند باوەڕ دەکەم لە دیدی «علمانی»یەوە نەگەیشتبێتە ڕێکاری هیچ یەکێک لە مەدرەسە مەشوورەکانی فکری ئیسلامی، کە دەبینین لە جەرگەی لێکدانەوەی سەر بە غەیب، بیریاری ئیسلام، لەوانەی بە خۆدا ڕاپەڕموون، بەڵگەی ڕاستبوونی بۆچوونەکانی لە فەلسەفە و مەنتیق هەڵدێنجێنێت. یەکێک لە گوتە هەرە مەشوورەکانیان ئەمە بوو: «حقائق الاشياء ثابتة والعلم بها متحقق خلافا للسفوسطائية» بەوەشدا تا بڵێی دوورکەوتوونەتەوە لەو فەلسەفەی «مثالی» کە «هۆش، هەست... » دەخەنە بەرایی ماددەوە لە هەبووندا. نووسەرێکی سۆڤێتی ڤ. ئاڤاناسییێف لە کتێبی تەرجەمەکراوی عەرەبیی «اسس الفلسفة الماركسية»دا، هەرچی دین و «مثالية» هەیە بە بەکرێگیراوی بورجوازیی دادەنێ و بەڵێنی ئەبەدییەتی لینینیزم و مارکسیزم و سەرەنگرێبوونی سەرمایە و دروشمەکانی، هەر لەو نزیکانە، بە خوێنەر ڕادەگەیەنێ. من مەبەستم نییە ئەبەدی نەبوونی شیوعییەتی مارکسیزم بکەم بە عەیب لێی، تەنها مەبەستم ئەوەیە، کە بێ لایەنگیریی، ڕاستی زاناکانی ئیسلام لە دەوڵەتی ئیسلامدا بەرانبەر ئازادبوونی خەڵک لە بیروباوەڕدا، بە مەرجێک نەخزێنە کوفر و ئیلحاد بخەمە ڕو. دەزانین گوتراوە ئیسلام بوو بە حەفتاودوو کەرت لە بیروباوەڕدا، ئەو بیروباوەڕانەش یەک تاکی دەسکردی حکوومەت نەبوو. لە مزگەوتێکدا دەدیترا ئەو خەڵقە بە چەندین جۆر نوێژ دەکات... کتێبی مەلا زلەکان هەریەکە بە جۆرێک مەعنای قورئان لێک دەداتەوە... تەڵاق خواردوو بە دوو مەزهەبان تەڵاقی دەکەوت و بە سێ مەزهەبان نەدەکەوت... جوداوازیی فکر گەیشتە ڕادەیەک هەندێ لە بیریارە زلەکان دەیانگوت؛ خوا واجیبە بە سەریەوە شتی هەرەیەک قەرارادە بکات... فەتوای لادانی خەلیفە لە خیلافەت بە مەرجی دەرچوونی لە حوکمی شەریعەت مەبدەئێکی سەلمێنراوە بوو... ئیتر لەم بابەتە چی بە دڵتدا دێت وا لە کتێبە کۆنەکاندا

هەڵئاخناون. لە تەک ئەمەدا دەڵێم و دەپرسم: ئایا ڕێژیمی شیوعی هیچ کوێرەرێی بە کراوەیی هێڵابۆوە بۆ ئەوەی شیوعییەک فەتوا بدات دژی بیروڕای لینین و ستالین و ماو؟ نامەوێ لە بابەتی گرنگ و بنەڕەتی ئەو کوێرەرێیە هەبێت، نەخێر هەر ئەوەندەم دەوێ، ئەگەر ستالین گوتبێتی دۆنبەڵان خۆشترە لە قارچک کەسێک جورئەتی کردبێت بڵێ: من قارچکم پێ خۆشترە!! ئەو باغەڵ فەڕاحییەی حکوومەتی ئیسلام هەیبوو بۆ زاناکانی ئیسلام، بەر لە هەزار ساڵ، هەزاریەکی ئەویش لە حکوومەتی شیوعیی پاش نیوەی سەدەی بیست نەدیترا و نەبیستراوە، قەتیش نادیترێت و نابیسترێت ئەگەر کیفی شۆڕشی پرۆلیتاریا لە خۆی دانەڕنێت و باداتەوە بۆ ڕێگەی دیمۆکراسی. هەرچی یاسا و دەستووره هەیە لە سێبەری ئیشتیراکییەتی عیلمی، هەمووی لە قەفەبلوولی ئیرادەی سەرۆکی دەوڵەت (وەک لینین و ستالین و ماو) وەیا سەرۆک و چەند یاریدەدەرێکی (وەک بریژنیف و هی تریش) دەرچووە، کەچی یەک یاسا و دەستوور و بڕیاری شەرعی لە خەلیفەیەکی عەبباسی دەرنەچووە. هەمووی فتوا و مەزهەبی کەڵە مەلاکان بوو دەبوون بە یاسا و قاضی بەپێی مەزهەبی خۆی بڕیاری لێ هەڵدێنجان. یەکێکی وەکوو ئەبوو یووسف کتێبی «الخراج»ی دانا بێ ئەوەی پرس بە هیچ کاربەدەستێکی حکوومەتی بکات... مەدرەسەی ئیمامی ئەعظەم «ئەبوو حەنیفە» مەشوورە بە مەدرەسەی ڕەئی، بیروڕا و قیاس.. تا ئەمڕۆژەش مسڵمانی عادەتی بە نیکاحێکی لە مەحکەمە کرابێت دڵنیا نابێ و دەچێتەوە بۆ لای مەلا، چونکە بەلایەوە حکوومەت بێدینە و حەقی نیکاح و تەڵاقانی نییە..

سەرنجێکی مەیلەو بە پەلەش تێمان دەگەیەنێ بۆچی دینی عیسا لە ئەورووپا بڵاوبۆوە، کەچی لە مەڵبەندی خۆی و نزیک لە خۆی ئەو برەوەی نەبوو. هەرچی هێزوپێزی دنیایی بوو، لە سەرەتادا بە مەسیحییەتەوە نەبوو، زۆر دەروێشانە و مسکێنانە دەیکرد و دەیگوت، خۆ لە بەرانبەر دەوڵەتی ئەشکانی و، بەدوا ئەودا، دەوڵەتی ساسانی جگە لە نەبوونی دەسەڵاتی دنیایی، دینی مەسیحی، نەیدەتوانی بەرانبەر دینی زەردەشتیش ڕاوەستێ. هەرچی ئەورووپا

بوو هێزی یۆنانی و ڕۆمانی تێدا بوو، بەڵام دینێکی وەهای نەبوو سەقامگیر بووبێ و بەبەریەوە بووبێ بیروڕای لاهووتی بزێتەوە و گوشار بۆ دەروونی ئەو خەڵکە بهێنێ کە شەڕەدندووکێ لەگەڵ دینێکی نەیار بکات. کە ڕێک کەوت قەیسەرەکانی ڕۆما ببن بە مەسیحی، یەکجار بەئاسانی مەسیحییەت برەوی سەند... ماوەیەک پاش برەوسەندنی، قەیسەرێک کەوتە دژی مەسیحی، بەپێی خوێندنەوەم لە نووسینی مەسیحییان ئەو دەمە بووە کە سەرگوزەشتی «اصحاب الكهف»ی وە پاڵ درا و دواتر کە قەیسەرێکی باوەڕپتەو بە مەسیحییەت داڵدەی دینەکەی داوەتەوە، سەرگوزەشتەکەی «اصحاب الكهف»ی ژیاندۆتەوە... هەڵبەت ئەم ڕیوایەتە زەرەر لە باوەڕی مەسیحییەت نادات، کابراییکە و قسە هەڵدەبەستێ، بەڵام بۆ ئیسلام وەک بۆمبای ئاتۆم وێرانکەرە کەچی نەمدیت مسڵمانێک بەدەم ئەم ڕیوایەتەدا بێتەوە کە لە گۆڤارێکی بەغدادا بڵاوکرایەوە لەلایەن یەکێکی مەسیحییەوە کە پایەی هەبوو لە سەقافەتی تەئریخییەوە بەتایبەتی، هی سورەیانی. بەهەمە حاڵ من ئەم باسە لێرەدا دەور دەکەمەوە، مەبەسێکم نییە لە چاکە و خراپەی ئیسلام و مەسیحییەت، ئەوەی بایەخی هەیە بەلامەوە ڕوونکردنەوەی بابەتی پرسیاری پێنچەمە کەوا بێ پەروا ئیسلامەتی دادەنێ بە هۆی دوواکەوتوویی مسڵمانان کەچی هەرنەبێ ئەو ئیسلامەتییە چ قیاسێک هەڵناگرێ لەگەڵ تەوراتدا، بە مەوداش لە ڕووی فکرەوە پێش لاهووتی مەسیحی کەوتۆتەوە بە تایبەتی بەر لە بووژانەوەی ڕێنێسانس.

زۆر بە سەیری، ئیسلامەتی، وەک دین، تەنها لەدەورانێک یەکسەر تەنگی بە بیروباوەڕی خەڵک هەڵچنی، کە تاقمە هەرە مەشوورەکەی ئیسلام بە ڕۆشنبیری و علیمانییەت، واتە «معتزلی»یەکان کاتێک خەلیفە باوەڕی هێنا بە «خەلقی قورئان» وەک کە موعتەزیلی دەیانگوت قورئان مەخلووقە، ئیتر شێوە «محاكم تفتيش»ی مەسیحی لە سەدەکانی ناوەڕاست، لە حوکمی عەبباسی و بەتایبەتی لە بەغدا خۆیدا بەرپا بوو. کەسێکی نکۆڵیی کردبایە لەو داوایەی موعتەزیلی دووچاری نەگبەتی، تا ڕادەی کوشتن، دەبوو. ئەم

نموونەیەی مەسەلەی خەلقی قورئانیش وەک هەر نموونەیەکی دیکەی فرزەبر و سەرکوتکەر دەچێتەوە بەڵگەخانەی ڕووڕەشیی خەفەکردنی بیروباوەڕ ئیتر، لە ئایین یان لە سیاسەت یان لە هەر مەیدانێکی کۆشەش و چالاکی و میزاجی خەلق بێ مادەم زیان بە کەس نەگەیەنێ.

لەلای خۆتەوە ئیسلام پێش ڕەوی مەغۆلەکان بەو وڵاتانەی ڕۆژهەڵات بگرە کە ناموسڵمان بوون. ئایا هیندی و ڤێتنامی و مەغۆلەکان و تورکەکان، تا دەگاتە گەلی چینش کە لەدەمێکی چەند هەزار ساڵییەوە لە خەڵکی دەوروپشتی خۆی پێشکەوتوتر بوو، چ فەلسەفە وەیا بیروباوەڕێکی سەر بە عیلمانییەتی هەبوو پێشکەوتووتر بێ لە فکری «ابن سینا و خوارەزەمی و بەیرونی و غەزالی و ئیبن ڕوشد و خەییام وابن الجوزی»؟. بەر لە شەڕی عێراق و ئێران لە سەفارەتی چینەوە کتێبی تازە چاپی چینیم بۆ دەهات کە بە ئینگلیزی نووسرابوون. یەکێک لەو کتێبانەی سەر بە مێژووی چین، دەگێڕێتەوە کە لە ئاکامی شەڕ و کوشتاری ناوخۆیی و قاتوقڕی و نەخۆشیی کوشندە دانیشتووانی سەرلەبەری چین دابەزیوە بۆ حەفت ملیۆن کەس!! کەچی مارکۆ پۆڵۆی گەڕیدە ئیتالیایی باسی چینێکت بۆ دەکات لەژێر فەرمانی نەوەیەکی جەنگیزخان هێندە پێشکەوتووە بەولای تەسدیقەوەیە. نە نسکۆی پێشتری چین و نە گەشەی دواتریشی دەچێتەوە بۆ ئایین، ئەمە دەڵێم بە دووپاتکردنەوەی چی گوتم و نەمگوتووە لەو کاریگەرانەی گەلێک و نەتەوەیەک بەرەو پێش دەبەن وەیا بەرەو پاش. فەرموو مێژووی کۆنی وڵاتە موسڵمانەکانی سەر بە سۆڤێتستان بگرە بەو دەورانەی کە ئیسلامی تێیاندا بڵاو بۆوە. سەقافەتی مانی لەو مێژووە کۆنە فڕێ بدە (کە ناشزانم چۆنە و چەندە، بەڵام دەزانم لەم ڕۆژگارانەدا نووسینەکانی مانی دۆزراونەوە) چ نامێنێتەوە پێی بگوترێ فکرە، فەلسەفە تا دەیگەیەنێتە دەورانی ئیسلام کە ئیتر چەندین پێشەوای زانست و فیقهـ و شەریعەت لەو وڵاتانەدا ناویان بە جیهاندا بڵاوبۆوە.

نابێ بیر بۆ ئەوە بڕوات دەبوو ئیسلام لە مەڵبەندی تەکنیک و داهێنان و دۆزینەوەدا بگەیشتایە قۆناغی ڕینێسانس بەڵام دەتوانم، بڵێم بە پێی ئەو مەودایەی لە دووسەد ساڵێکدا پەی کرد، دەشیا ڕینێسانسێکی لایەق بێ بە پێشکەوتنێکی ئەوتۆ دوورایی یەک پلەی خەتی پانایی، لە زەمانی مەئموونداا «درجة خط العرض» پێورا، ئەگەر نسکۆی ڕەوی مەغۆلەکان و کاولکردنی بەغدا و گەلێ ناوەندی گرنگی تری ئیسلام پێشکەوتنەکەی نەوەستاندایە، بگرە بەرەو دواوەی نەگێڕایایەوە. لەگەڵ ئەمەشدا دەبێ بزانین بەرەی ئەرستۆکراتی ئەو سەردەمەی گەشەی عەبباسی، وەک زۆربەی هەرە زۆری ئەرستۆکرات، زانستی دانابوو بە، 1- علوم رفیعة. 2- علوم وضیعة. هەرچی زانستی باڵا «رفیعة» بوو ئەو بابەتانە بوون کە بەکەڵکی زارقەڵەباڵغی و گوتەی توێکڵداری و مەدح و هەجوی پەسەندی حاڵ و بار دەهاتن، بەشی ئەو زانستانەی «بەرهەمهێن» بوون نەدەگەیشتنە بارەگای «ظل الله - سایەی خوا» کە نەدەشیا ئەدەبی باڵا نەبێ بزرنگێتەوە لە پەردەی بیسەری خەلیفە. ئەم مامڵەت جوداییە تائێستاش لە کۆمەڵگەی نیمچە زرەشارستان، بەتایبەتی لە ڕێژیمی ئایدیۆلۆژیپەرست، برەوی هەیە تا ئەوەی لە هێندێ وڵاتی چارەڕەشی ئەم جیهانەی سێیەم دوو پیتی ڕەجاڵی مەدح و فیشاڵ کە بە کەڵکی پرۆپاگاندە دێت سەد هێندەی فکری زەرڕەقڵاش بایەخدارتر و نرخدارترە. حکوومەتی ئەوتۆ هەبووە و هەیە یەکنەوا و یەکبین خەریکی «پێشەواپەرستییە» تا ئەوەی حیکایەتی قازیی بەسرە دێنێتەوە یاد کە گۆیا خەلیفەیەکی عەبباسی لە سەردانی بەسرەدا خەڵکێکی زۆر و زەبەندە بۆ پێشوازی دێن، سوارێک لە نێوان سواراندا تەراتێنێ دەکات و هەر دەڵێ و دەڵێتەوە «نعم القاضی قاضینا = قازیمان قازیی چاکە» خەلیفەش دەپرسێ، کێیە وەها خەریکی مەدحی قازییە، لە وەڵامدا گوترا: قازی خۆیەتی، قوربان!

دەبێ لەبەر تیشکی پرسیاری پێنجەمدا بۆ زێدە ڕوونکردنەوەی مەبەست، گریمانەیەکی خەیاڵکرد بدەینە بەر لێکدانەوەمان، ئایا ئەگەر بە دەستێکی سیحری بیری سەر بە ئایین و غەیبمان لە هەست و هۆش و نەفسی

ئادەمیزاد سڕییەوە و هێندەی پشیلە و چوێلەکە ڕەهامان کرد لە تۆق و زنجیری خوا و نازانم چی و چی و دەروونێکی وەک دەروونی بەیتەکەی نالیمان بۆ ساز کرد کە دەڵێ:

دەروونم خاڵییە وەک نەی دەناڵێ
هەوارێکی چ پڕ هاوارە بێ تۆ

ئایا لە تای تەرازووی زیان و قازانجدا لایەنی چاکەی مرۆ قورستر دەبێ یان هی زیان! ئێمە پێشتر خۆمان بەوە دڵنیا کرد کە پژانی هۆشی مرۆ بە جۆرێکی ناچاری کێشایەوە بۆ فکرەی «پەرستن و پیرۆزی»، بەوەشدا جارێکی دیکە لە جانەوەر بەرەوژوورتر ڕۆیی و پێوانەیەکی لە هۆش و گۆش بوەشێتەوە کەوتە لەپ و کۆشی مرۆوە، ئەویش «پیرۆزی - تقدیس» بوو کە ئەگەر لێی بسڕینەوە و کوێری بکەینەوە تا ئەوەی نە بە میرات نە بە دەرسدان و ڕاهاتن تێیدا بە خەبەر بێتەوە، تا ئەو مرۆیە سادەلەوحەی وزەی بەرەوپێشبوونەوەی پێوە نامێنێ، کورد گوتەنی، ئەشەدوبیللا نە مۆسیقا و نە ڕەسم و نە هەیکەلتراشیشی تێدا دەڕسکێ. تۆ ئەگەر توانیت لەم قۆناغەی تەکنیک و زانستی سەردەم، چەند مرۆیەکت وەها بەرەو پێش برد نە ئەیدز و نە شێرپەنجە و نە هەڵەی حیسابی و نە هیچ ناتەواوییەکی ئێستاکەی مرۆت پێوە نەهێشت، تا ئەو مرۆیانە وەک «اصحاب الکهف»ەکەی تۆفیق ئەلحەکیمیان لێ دێ، کە ناتوانن لەگەڵ خەڵکی سێسەد ساڵ دوای سەردەمی خۆیان بژین و حەز لە مردن دەکەن. تۆ ئەگەر لە ڕێی پەسەندکردنی نەهێڵانی کۆت و زنجیری ئایین و دەستووراتی کۆمەڵایەتیی دواکەوتوو ئەو خەڵکەت ڕەها کرد بۆ دابینکردنی مەیلی زایەند تا ئەوەی هەموو ئافرەتێک بۆ هەموو پیاوێک حەڵاڵ بێ، ئاخۆ چ سوودێکت بە مرۆ گەیاندووە. ئێمە دەزانین زۆرینەی مەلی کێوی، نێرینەیەک و مێینەیەک پێکەوە دەژێن، هەرچی مریشک و عەلیشیش و... و... مەلی کەوی هەیە، لە ئاکامی گۆڕانی

باری ژیانی، هەموو نێرێکی بۆ هەموو مێیەکی مێردە. ئایا ئەگەر بە قودرەتی قادر مەلی کێوی لەپڕ وەک مەلی کەویی لێ هات و نێرینەکانی ڕەها بوون لە هەڵگرتنی ئەرکی پێگەیاندنی جووجەڵەکانی، ئەوسا دەمێنێتەوە تاکە مێیینە سەرلەبەری ئەرکی جووجەڵەی هەڵگرێ. تۆ بڵێی ئەو ڕەهاییە لە سوودی تێکڕای مەل بێ؟. لەوانەیە دوای هەزار ساڵ، دەهەزار ساڵ مرۆ بگاتە جۆرێک لە پێوەندیی نێر بە مێ چ خزمایەتی نەبێ بە زەناشوویی ئەم سەردەمە. ئایا لە مەسڵەحەتدایە هەر لە ئێستاوە مرۆ، پێداویستی کۆمەڵایەتی «بەپێی سەردەم» فەرقی نابێ لەگەڵ ئەوەی بێین هەر لە ئێستاوە جەزای هەموو تاوانێک ڕەش بکەینەوە، هەر چونکە باوەڕ دەکەین پاش دەهەزار ساڵی دیکە تاوان کردن لە خۆوە ڕەش دەبێتەوە. دەزانم و دەزانیت ڕۆشنبیری بێ ئەژمار لەم سەردەمە و سەرزەمینەدا حەز دەکەن پێوەندایەتیی ئایینی بە یەک زەبری ڕۆستەمانە وردوخاش بێ، بەڵام بەداخەوە هەریەکێک لەو ڕۆشنبیرانە «پیرێکی تەریقەت»ی سیاسەتی کردووە بە پێغەمبەری خۆی تا ئەگەر ترۆتسکیی خۆشویستبێ وەیا ستالینی بە فەرخەخوا زانیبێ، ناسەلمێنێ کەس عەرشی خودایەتی و پێغەمبەرایەتیی ڕابەرەکەی بلەرزێنێ. ئیزنە هەرچی پێشڕۆی سیاسەت و دیانەت هەیە لەناو ببرێن تەنها مەعبوودەکەی خۆی بە خوا یان پێغەمبەر قبووڵ بکرێ.

جیهانی دواکەوتوو ئۆگری گرتووە بە کاوێژکردنەوەی بیروباوەڕێکی کە ڕێکەوت خزاندبێتیە دڵ و دەروونی (ناڵێم: هۆش و گۆشی) کە یەکێک لە ئاکامە هەرە دزێوەکانی ئەو براکوژی و یەکتر تاوانبار کردن و بوختان هەڵبەستن و درۆ و دەلەسەی ڕووت و ڕەجاڵە. هیچ دەستەیەکی خەباتگێڕی پێشەنگ «طليعي» نییە لەم جیهانە نەخۆشەدا فەتوای خیانەتی هەر دەستەیەکی وەک خۆی نەدات کە لەگەڵی کەوتە دڕدۆنگی. ئەوجا کە پێوانەی کاروباری سەربەدنیا وەها بیرتەسک و هەناوگوشراو بێت، ئەی لە ئاست بیروباوەڕی نادنیایی چۆن دەبێ کە بەلایەوە بریتییە لە وڕێنەی پووچەڵ، لە حاڵێکدا براکوژییەکەی خۆی دەیکات گەلێک گەلێک تاوانبارترە

لە قادری و جلوەی نەقشی، بە بەردی بناخەی خەباتی مەردانەی کوردانەی (بابڵێم: سندانەی) ئێستا و دواڕۆژی دادەنێت... واشدەزانم لەو هەڵمەتە شێرانەیدا لایەنی تێشوو پڕکردنی لەبیر ناکات...

خوێنەر لێم بە سەهوو نەچێ لەو شتانەی دەربارەی ئایین و نائایین دەریدەبڕم، چ مەیلێکی تایبەتی بمبزوێنێ بەرەو ئەمیان یان ئەویان. لە نموونەدا، کە دێم دان بە دڕندەیی گورگ و بێدەسەڵاتیی مەڕدا دەهێنم نابمە لایەنگیری گورگ. ئەگەر بۆم بلوێ لە عەینی دان پێداهێنانەکە و بە هۆی ئەوەوە دەمەوێ مەڕەکەی لە چنگاڵان قوتار بکەم، هەرچەند لە کۆتاییدا مەڕەکە هەر بە نێچیری تێ دەچێت. خۆ ئەگەر هیچ چارم کردبایە حەزم دەکرد گۆشتخواردن لەناودا نەمابایە.

ڕاستییەکەی، بابەتی پرسیاری پێنجەم هێندە ئاوخوازە دە جاران تەڕایی خامە و زمان وشک دەکات. چەندێکی وەکوو کاریز، لێی بدەیتەوە پتر ئاو بەدوا خۆیدا دەهێنێت. لە نموونەی ئەم تێبینییە چەند دێڕێکی ڕوونکەرەوەت دەخەمە پێش چاو. ئێمە زانیمان (بە باوەڕی خۆم) داماڵینی نرخی کەسایەتیی کۆمەڵایەتی لە مرۆڤ، هەر لە ئێستاوە، بە بەهانەی ئەو ڕاستییە (یان: گریمانەیە) کە پاش هەزاران ساڵ نرخەکان لەخۆوە دەسوێنەوە، کەڵک بە مرۆڤەکە ناهێڵێ، کەچی نرخێکی زێدە زێدە گرنگی ئایدیۆلۆژیی سەر بە سیاسەت کە بە لای ملیۆنەها خەباتگێڕ، داینەمۆی هێزی بزوێنی ئێستا و دواڕۆژە، وا لە پێش چاومان، بەنوێژی نیوەڕۆ لەخۆوە دادەماڵێت و باری چ بەرژەوەندێکیش دانالەنگێ و لە شوێنی وەک ڕۆمانیای چاوچیسکۆ هەرچی چاکە بوو لەو داماڵانەدا پەیدا بۆوە. هەڵبەت فەرقی نێوان نرخی زگماک، نرخی موتاڵا و خۆڕاهێنان لەو نموونەیە خۆ دەنوێنێ. حاجییەکی بەر لە هەزار ساڵ ڕێی حەجی دەگرتە بەر بێ ئەوەی کەس یەخەی گرتبێ، چونکە بەلایەوە خوایەک هەیە لە کەسان گەورەتر و خاوەن چارەنووسی ئەبەدی، پێی خۆشە حاجی بە دەوری کەعبەکەیدا بگەڕێت و بەردە ڕەشەکەی ماچ بکات و حەفت بەردان بە شەیتاندا بدا،کەچی فکرەیەکی دنیایی کە ئەگەر

ڕاست بێ یا درۆ بە دەرسدان و بە پێوانەی چاکەی دنیایی و بێنەوبەردەی ساڵ و دە ساڵ دەچێتە دڵانەوە، لە حاڵێکدا بابای ئایدیاپەرستی دنیایی، بە لایەوە، فکرەی سەر بە غەیب کەفوکوڵی شەعبەدە و نەزانی و چاوبەستەکێ و سەرشێواندنە. جا ئەگەر لێرەدا لەگەڵی ڕێک بکەوین و لێی بسەلمێنین حیسابەکەی ئەو بە تەرازووی بەرژەوەند و عەیارەی ڕاستی و دروستی پێویستە بێتە جێ. گەلێک پتر دڵشکست دەبێت و دەبین کە ئاکام بە عەکسەوە دێتە جێ و فەلسەفەکەی ئەو کۆڵ دەدات لە ئاست فاکوفیکی دەروێشایەتیی بێ بنەما... خوێنەر، هەر کەسێک بێت، ناشێ خۆ لە ڕاستییەکی زێدە ترسناکی مرۆتۆقێن نەناس بکات کە هەمیشە بە درێژایی و پانایی تەمەنی مرۆڤایەتی (واتە: لەوەتەی هۆش و هەست و لێکدانەوەی پشکووتووە) دۆش داماو بووە بەرانبەر ئەم جیهانە بێ سەر و بن توێکڵدار و نا مەفهووم و مەرگتێگەڕاوە کە بە بەرییەوە هەبووە لە هەر چرکەیەکدا بەڵایەکی ناگاهان یەخەی بگرێت و نابوودی بکات وەک ئەوەی کە بێ ئاگا لەخۆبوون مارێک و دووپشکێک پێوەی بدات یان بەردێک لە ژێر پێی، بەسەر گردێکەوە، تەلەزگە بکات وەیا بروسکە بیکوژێت وەیا دز لە برسانی بکوژێت...
زۆردارێک تەمای لێ بنێ... پۆلیسێک مرخی خۆی لێ خۆش بکات... کادری حیزبی لێی دڕدۆنگ بێ... ئەرواحی شەیتان و مەلائیکەتان بانگلۆزی پێ بدەن. ئەجەل لە نکاو داپیەلۆسێ... شێرپەنجە هەپروون هەپروونی بکات و... و... تا دەیان و سەدان مسیبەتی بێدەرمان یەخە دادڕاوەکەی بگرێت. خەباتگێڕی مولحیدی ئەم سەردەمە دەبێ خۆ ڕابهێنی بە لێکدانەوەی حاڵوباری بابایەکی بانگلادیشی بەر لە هەزار ساڵ کە بە کولەمەرگی ڕێگەی حیجازی دەگرتە بەر، یان لە شەڕی خاچپەرستان نازۆیەکی ئەورووپا خۆی بۆ قودس هەڵدەکوتا و تێدا دەچوو. نیازێکی گەلێک گرنگتر لەو نیازە دنیاییەی خەباتگێڕەکە بەرەو تۆقاندنی بێدەسەڵاتان دەبات، ئەو موسڵمانە و ئەو مەسیحییەی بەرەو هیچستانی دنیاوەی دەبرد کە تەمای قیامەت و بەهەشت لێی دەکردە ئامانجی ژمارە «1». مرۆی عادەتی بە هۆشە کولەکەیەوە کڵۆڵ و

بێدەسەڵات و حەپەساوی جیهانێک بوو هەر بایی ئەوەی تێیدا هێرۆ و گێژ بێ بە دڵ و مێشکیدا تێ دەپەڕی، مەگەر شێخولکێک و کۆلکە مەلایەک و قەشەیەکی نیوەخوێندوو وەکازێکی درۆزنی لە دەستان نابێ خۆی بە قیتی پێوە ڕاگرێ چ جایی ئەوەی حۆری و پەریی بەهەشت لێ دەکردە مژدەی ئاخیرەت. خەباتگێڕ بە مژدەی نرخێکی دنیایی نیوداشت دەبوو و «دەبێتە» دەروێشی چاوچیسکۆیەکی تاوانبار کە بەڕاستی و بێ تەئویل هێندەی بەهەشتی دوارۆژ پێوەی هەڵدەخەڵەتا و دەگەشایەوە و خۆشی دەکردە سەدەقەی موژدە مەوهوومەکە، لە حاڵێکدا بە دەوری خۆیەوە، ئەو خەباتگێڕە جیهانێکی خاڵی لە چاوچیسکۆ و کوشتن و بڕین و تەنگەتاوکردنی دەدیت کە خەریکی کەیف و ئاهەنگە ئەوجا هەر سوور دەبوو لەسەر کوتانەوەی ڕێگە کوێربووەکەی خۆی، لێی موبارەک نەبێ... ئیتر خەباتگێڕی بێ ئایین وەتەنگ بێ لە سۆفی مرادێکی کوێرەواری دنیا لەسەرداخراو کە هەرەشەکانی بەولاوە ئیکسیرێک نییە دەردی تیمار بکات مەگەر بەڵێنی جیهانی دوای مەرگ! ئەمە دەڵێم دەشزانم و دەشزانیت زۆرینەی ئەو خەباتگێڕە پشت لە خوایانە ورتەورتێکی فسکوهۆڕی جیهانی دوای مەرگ بە دڵ و دەروونیاندا تێ دەپەڕێت و کە دڵشکستەش بوون لە نەهاتنەدی بەڵێنان با دەدەنەوە لای سۆفی بارام چونکە بە ئەسڵ ئەو خەباتگێڕانە مولحیدی ساختە بوون و لەو ڕووە کە ئیلحادەکەیان «عقلاني» نەبوو، سیاسی بوو. لەلایەکی دیکەوە لاهووتییەک کە لە سلووکی خۆیدا بەو ڕاستییە گەیشتووە خۆی باوەڕی هەیە، بێ پەروا دەڵێ:

کفر هفتاد و دو ملت همەرا عذر بنه
چون ندیدند حقیقت رهی افسانه زدند

بە دڵی ئارامەوە دەسەلمێنێ هەفتاودوو مەزهەبی ئیسلام گومڕا بێ هەر چونکە ڕێی ڕاستییان نەدۆزیوەتەوە کە ئیتر گلەیی کردن دەبێتە کاری

گەمژەڵی... تاکێک لەو خەباتگێڕە مولحیدە «علماني»یانە ئەو عوزرە قبووڵ ناکەن لە هیچ کەسێکی وەک ئەوان دانەبڕێ...

بە هەمە حاڵ چەندی بە دوای حیکایەتی ئایین و نائایین بکەوم ناگەمە کۆتایی باسەکە. لێرەدا یەک تێبینیی هەمەگیر دەردەبڕم و قسەی پێ خەتم دەکەم. هەر ئایدیۆلۆژییەک، ئایینی بێ یان سیاسی یان چی دەبێ با ببێ، کە بەبەریەوە بوو شەختە بکات و قاڵبەستوو بێ، بێ گومان و بە هەموو مانایەکەوە دوژمنی ڕاستییەکانی ئەم جیهانە دەبێ کە «ڕاستییەکان» وردە وردە خۆ بەدەستەوە دەدەن ئەویش بە قارەمانیەتی و خۆنکردنی ئەو زانایانە دەبێ کە خۆیان و ژیان و بەرژەوەندییان بەخشیوە بە «ڕاستی» و «چاکەی مرۆ». کەسێکی تەڕایەتیی شەرم، بە تەوێڵیەوە بێ سەرپێچی لەم گوتەیە ناکات.

- وەک دەزانین، ئیسلام لە دەرەوەی سنووری جوگرافیی دەسەڵاتی سیاسی و تێکڕای ڕیالیستیەتی (ئەم وشەیە نووسراوە: ڕیالیتێتی، نازانم چیی تێدا مەبەستە، چونکە Reality لە کوردیدا ناچێتە ئەم شکڵەوە، کە خۆی ئەبستراکتە ناشێ بکرێتەوە ئەبستراکت بە پاشگری «ـێتی»ی کوردی) کۆمەڵگای کوردەوارییەوە هاتووە، بەسەر کوردا بەزۆر سەپیوە و هەموو ژیانی داگیر کردووە. دیارە ئەم دەسەڵاتە مادییە بێگانەیە زیانی بە کورد گەیاندووە، ئەندازە و مەترسیی توانەوەی لەسەر کورد چەند بووە؟!.

ئەگەر بە دڵێکی ئارام و چاوێکی ڕوونبینەوە سەیری حاڵ و باری کورد بکەین بە دەست بێگانە و خزمەوە، دوودڵی و پاتەوپات و پڕ بە دەم دەنگ هەڵدەبڕین، کورد بە دەست کۆرشی هاخامەنشییەوە فەلاکەتێکی دیت تا ئەم دەمە لێی هەڵنەستاوەتەوە، هاخامەنشیش لەچاو عەرەب بە ئامۆزا حیساب دەکران. بەڵێ دینەکەی نەگۆڕا بەڵام دنیاکەی لێ سەرەوژێر بۆوە یان سەرەوبن بوو... ئەم حاڵەتەی تەنگەتاویی کورد بە دەست فارسەوە، لە هەموو

دەورانێکی فارس تێیدا دەسەڵاتدار بووبێ بەردەوام بووە. کە عەبباسی و بەر لەوان ئومەوی بوونە جێگری ساسانییەکان حاڵی کورد وەکوو حاڵی ئەو گەلانە بوو کە کەوتنە ژێر حوکمی عەرەب و ئیسلام، بە تێخوێندنەوەی جوداوازییەکی گرنگ کە گوشاری عەرەب بۆ سەر فارس پتر بوو لە گوشاری بۆ سەر کورد، چونکە فارس جێی مەترسی هەلقۆستنەوەی گرتنەوەدەستی حاکمایەتیی کۆنی بوو، تەنانەت کەسانێکی ڕایان کرد بۆ هیند و چین، فارس بوون و پەنابەرانی فارس بۆ چین بە سەرۆکایەتیی شازادەکانەوە بوو، خێرا بە خێرا سپایان بۆ ڕێکخرا کە بگەڕێنەوە بۆ ئێران بەڵام سەرۆکی بەشە سپای ئێرانی لەگەڵ سەرۆکی بەشە سپای چینی بە یەکەوەیان هەڵنەکرد و کارەکە لەبەر یەک هەڵوەشایەوە. کورد بە درێژایی حوکمی هاخامەنشی ئەشکانی و ساسانی ناوێکی دەنگدەرەوەی نەبووە، هەتا دوای غەزای ئیسلام و تێکشکانی ساسانییەکان بە چەند دەمێک ناوی کورد و کەسانێکی دەبیسرێت. کەنەفتیی کورد لە حوکمی ساسانییەکاندا وەها بوو کە هێندە هێز و پێزی پێوە نەمێنێ عەرەبەکان ئومێدێکی لەنگەربەستن و هاوشانییان لێ بکات بەرانبەر فارس. بەشێکی بەرچاوی نووسەرانی عەرەبی عەبباسی هەموو دانیشتووانی سەر بە شاهەنشایەتیی ساسانی بە فارس دادەنێن تا حاڵ گەیشتە ئەوەی نەسەبێکی سەر بە جنۆکە بۆ کورد هەڵبەستن.

من لە نووسینی لێرە بە پێشەوەمدا گوتوومە، کە عەرەب وڵاتی (ئێستا بە عێراق داندراوە) ی گرت نەک هەر لەشکر و حکومەت و شاهەنشای فارس گواستیانەوە بۆ دیوی ئێران، بگرە ئەو ڕەعییەی فارسیش بوو وڵاتەکەی چۆڵ کرد تا ئەوەی کوردەکە ڕژایە بەشێکی ئەو خاکەی بە تەنیشتیەوە فارسی تێدا دەژیا. لە ماوەی نێوان داگیرکردنی مەدائین و شەڕی نەهاوەند کە عەرب پێی دەڵێ «فتح الفتوح» فارسەکە ئومێدی گەورەی هەبوو بە مانەوەی دەوڵەتەکەی، شکۆی نەهاوەندیش وەهای دەکرد فارسەکەی دیوی عێراق هەم لە لایەن عەرەبەوە گومانلێکراوە بێ و هەم بۆخۆشی لە مجێزی نەدەهات یەکەندەردوو ببێتە کۆیلەی عەرەب، بۆیە بوو کشایەوە دیوی ئێران، واتە

ترس و تەما پاڵی پێوە نا. میراتێکی ئەو جیرانەتییەی کۆنی کورد و فارس لە باشووری کوردستانی عێراقدا ماوەتەوە کە بریتییە لە تاقمە گۆرانییەکی هەرە مەشوور و پێشکەوتووی کوردی وەک ئەڵڵاوەیسی، خاوکەر، خورشیدی، ئایای، تێکهەڵکێش... لە هەمووواندا ئەو زەنگۆڵەیە هەیە کە تایبەت بە گۆرانیی فارسییە و تەنها لەو مەڵبەندەش هەیە، لە کوردستانی غەربی، کە کورد تێیدا جیرانی فارس بوو. زەنگۆڵەیەکی لە دەنگی وەک دەنگی عەلی ئەصغەر یان گۆرانیبێژێکی کوردی دیوی کوردستانی ئێران هەبێ جێی پرسین نییە چونکە لە کۆنەوە دراوسێن لەگەڵ فارس[6].

سەیرێکی بە پەلە و سەرپێیی حاڵوباری ئەو گەلانە بکەین کەوتنە ژێر حوکمی عەرەب و جغزی ئایینی ئیسلام دەبینین لە نێوان چەندین نەتەوەدا کورد و بەلووچ بێ مایەی دنیایی مانەوە، ئەوانەی تر مەیلەو خێرا بوون بە خاوەن دەوڵەت، لە نێوانیاندا تورک، بە تایبەتی، بۆ ماوەی چەندین سەدە بوو بە جێگیری عەرەب لە دین و دنیا... هیندی موسڵمان بوو بە دەوڵەت و خاوەن سەقافەتی عەرەبی و فارسی تا ئەوەی ڕەنگە ژمارەی شاعیری فارسی لە هیندستانی باکوور پتر بێ یان شان بە شانی شاعیرەکانی ئێران بێ. جگە لە شیعر، هەرچی سەقافەتی هەرەمەی ئیسلام هەیە، بگرە لە قورئان تا فەلسەفەی یۆنان و فکری سەر بە عیلمانییەت و سۆفیەتی و هونەری خانەسازی و نیگارکێشی و فەلەکناسی، ماڵاماڵی ئەو هەرێمە بوو تا ئەوەی گوترا «اصفهان نصف جهان لاهور نباشد درمیان». بلیمەتێکی وەکوو ئیمامی سەرهەندی لە ئاواییەکی زێدە بچووکی دەوری دەلهی بە ناوی «سەرهەند» هاتۆتە جیهان و هەر لەو ناوەش بە سەقافەتی مەڵبەندەکە بۆتە «علامة». پاش بڵاوبوونەوەی ئیسلام و گەشەکردنی سەقافەتی عیلمانی و لاهووتی، ناوچەی زێدە ناوداری وەک سەمەرقەند و بوخارا و تاشکەنت و «ئەبیورد: ئەپۆڤەرتیکا» و خۆکەند بوون بە هاوچەشنی لێهاتووی جیهانی ڕۆشنبیری و زانا و فەیلەسووفی هەر زلیان تێدا هەڵکەوتووە، جگە لە دامەزراندنی حکوومەت و دەسەڵاتی دنیایی...

هەرچی کوردەکە بوو، دەردی شەپڕەی مێژوویی کە من ناوم ناوە «نەزیفی ئابووری» و لە بەرگێکی کتێبی حاجی قادر، یان شوێنێکی ئەوتۆیی، بایی توانا ڕوونم کردۆتەوە کە کورد دوای تێچوونی ماد دەورە درا بە سێ ناوچە حوکمی پیت و بەرەکەت ڕاکێش. فارس لە ڕۆژهەڵات و چی یۆنان و ڕۆمان بوو لە باکوور و ڕۆژاوا و بابیل لە باشووری کوردستان بە درێژایی مێژووی پتر لە هەزار ساڵی هەر بەرهەمێکی خامی کورد هەبووە، وەک ئاوڕێژی شاخەکانی کە ڕژاوەتە ئەو سێ ناوچەیە، ئەویش لەگەڵ ئاوەکانی ڕژاوەتە هەمان سێ ناوچە و هەرگیز نەشیا «سەرمایە» لە کوردستان پەیدا بێ... کورد وەک مەلی ناو قەفەس بووە، سیخناخ کراوە، چەندێکی سپای هێرشبەری ئەم لا یان ئەو لا ڕەوی بردووە بۆ سەر لایەکەی تر کورد و خاکەکەی پاماڵ بووە... تا دەمێک کە گەیشتە دەورانی ئیسلام و لەو ماوەیەدا کە یەک دەوڵەت فەرمانڕەوای خاکی موسڵمانان بوو «بە چاوپۆشی لە ڕووداوی پەراوێزتەسک» حاڵەتێک بۆ کورد پەیدا بوو لە دوو ڕووەوە تێیدا سوودمەند بوو؛ یەکیان ئەوە بوو کە ئەویش وەک نژادی غەیری عەرەب بوو بە ڕەعییەی حکوومەت، دووەمیان ئەوە بوو کە گەشەکردنی خوێندنی مزگەوتان لە کوردستان گەیشتە پایەیەک، هەزاران مەلا و فەقێ بە درێژایی ڕۆژگار ئەمسەرەوسەری خاکی کوردستانیان دەپێوا بۆ خوێندن لای مەلای ناودار. وەک دەگوترا، مەلای دوازدە عیلم، زانستەکان دوازدە بوون، ئیتر ئەو فەقێ و موستەعیدانە بۆ خوێندنی هەر زانستێک بایە، خۆیان هەڵدەکوتا بۆ لای مەلایەکی ناوی دەرکردبێ لەو زانستە. لەمەوە فەقێ و مەلا و موستەعید بێ ئەوەی مەبەسیان بێ دەبوونە هۆی بەسترانەوەی ئەمسەرەوسەری کوردستان بە شادەمارێکی پێوەندیی نێوخۆیی کە پچڕانەوەی نەبوو، بابەتەکەشی پۆپی ڕۆشنبیریی ئەوسا بوو. ڕاستییەکەی ئەم دەورەی خوێندنی فەقێیان لە ئاشناکردنی سنە بە دیاربەکر و ناساندنی کرماشان بە شوێنانی دوورەدەستی کوردستان و بەردەوامبوونی هەستی کەسایەتی و خۆییاتیی گەلی کورد بە یەکترەوە ژوورووی هەموو جۆرە هۆیەکی پێوەندی و ئاشنایی بوو لە

نێو کوردان کە دەزانین هەرگیز لە ڕێی بازرگانی و ئاڵ و وێری کەسابەتەوە سەدیەکی ئەو بە یەکتربەستنەوەیە وجوودی نەبووە چونکە، بەداخەوە، سەرمایە نەبوو لە کوردستان پەل بکوتێ بۆ چالاکی. ئەگەر یەکێک لە کوردان پارەوپوولێکی بوویێت یان گوێستۆتیەوە بۆ شارێک لە شارەکانی غەیری کورد یان هەرنەبێ تیجارەتەکەی لەگەڵ غەیری شاری کورد کردووە کە دەزانین، بە زۆری هەرەزۆری، شارۆچکەکانی کوردستان بابەتی یەکچوونیان هەبووە کە ئیتر لزووم نامێنێ ئەرکی ڕاگوێستنی هەڵبگیرێ بۆ ئاڵوگۆڕ، پیشەسازیش نەبووە مادەی خام لەکاربهێنێ. خولاسە وەک لە دۆمینە دەگوترێ «هەر دوو سەری بەیاز و قەپات»، ئاوەدانییەکانی کوردستان لە ئاست یەکتردا تا بڵێی بێ نیاز بوون چونکە هەمووی هەمان بابەتیان هەبوو. شەپڕەی ئابووری دەردی هەرە کوشندی گەشەی کورد بووە کە یەک لە ئاکامەکانی دابڕانی هەرێمەکانی لەیەکتر دیاردەکی زەق و زۆب بووە. پێوەندییەکی تری کوردی بەیەکتر بەستبێتەوە، لە پەراوێزێکی تەسکتردا، گەشتی هاوینە و زستانەی ئێڵە ڕەوەندەکان بوو لە کوردستانێکەوە بۆ دراوسێکەی، هەواڵی حاڵوبارێکی ئەم دیو و ئەودیویان بەو خەڵکە لێکتر کەم خەبەرەیان ڕادەگەیاند و ناوناوە ژن بە ژنەیەکیان لەگەڵ ئێلێکی ئەو هەوارانە دەکرد.

ساڵی 1991 کە لە هەڵاتنەکەی سێ ملیۆن نەفەریی کورد دەگەڕامەوە بۆ ماڵە شێواوەکەی دیوی کوردستانی عێراق بەلای دێی قاسملوودا تێپەڕیم… باسیان کرد، ئەو ناوە کاتی خۆی بەزۆری، هاوینان، عەشیرەتی هەرکی لێی دادەبەزی و هاوینەی تێدا ڕادەبوارد بە مەڕداری. چاوێکی ئاو تێدا قەتیسماوم بڕییە قاسملوو، بە ملەچەرخێ تێی ڕادەمام هەتا لە پێچێکی بێ مۆڵەتی چاوبڕکێ بامان دایەوە ڕووەو خەفەتخواردن لەو بەهەشتە چۆڵ و هۆڵەی کوردستانی لە کورد حەرامکراو.

لەو داڕشتنەی پرسیاری شەشەم، لایەنی داسەپانی دین و سەقافەتی عەرەب بەسەر کوردا بە جۆرێکی وەها «سەرەتا و ئەنجام دیارخەر» پرسیار و وەڵام

تێک دەکاتەوە، ڕێگە کوێر دەکاتەوە لە پێش پرسیارێکی کە بیەوێ بزانێ حاڵی کورد بە دەست ساسانییەکانەوە چۆن بوو. وەک بڵێی لە عەرەبەوە گوشار هات بۆ کوردێکی حەسایەوەی خاوەن چارەنووس و سەقافەت و دینێکی دڵڕاگر!

هەرچەند کاری نووسین و گوتە ناگاتە کاری کوتەک و شمشێر بۆ دەستنیشانکردنی چاکە و خراپەی نەتەوەیەک، بگرە گەڕەکێکی عومدە دێیەک، دیسانەوە پێویستە بە چاوی وردبین و حەقیقەتدۆزەوە سەیری بابەت بکرێت، با ئەو بابەتە یاری چکەندەرە و تەندووری سووری بێت، هەرنەبێ لەبەر خاتری بەلاوەنانی ناکۆکیی بێلزووم کە دەزانین یاری بۆ تەڕدەماغییە نەک شەڕەچەپەڵۆکێ. من لەو بەشەی، تا ئەم دێڕە، لە وەڵامی پرسیاری شەشەم ئەوەندەم گوتووە لەبارەی حاڵی کورد بە دەست ساسانییەکانەوە کە هاتنی ئیسلام و داگیرکردنی کوردستان و ئێران لەلایەن عەرەبەوە بۆ کورد، تازیەمانە نەبوو بەڵکوو بە پێچەوانەوە هەڵکشانی کورد بوو لە پلەی ڕەعیەی هەرەژێرەوە بۆ ڕێکاری نەتەوەی فارس کە بوو بە ڕەعیەی عەرەب. لەلایەن دینەوە، ئەرکی دینی ئاڤێستای حکوومەتی چ پێوەندی نەبوو بە بەرژەوەندی گەدای کوردەوە. ڕاستییەکەی ئەگەر لە مرۆدا ئۆگرگرتن و بە شتێکەوە ڕاهاتن، شتی ناخۆش نەگێرێ بە خۆش، دینی ئەوسای زەردەشتی بارێکی زێدە قورس بوو بەسەر شانی ڕەعیەی پلەی سێیەم و چوارەمی وەک کورد. ئەوسا کە داگیرکەری عەرەب بە «جزیە» ڕازی دەبوو، کورد و نەتەوەی وەک ئەو پێی حەسانەوە، خۆ کە خەڵکەکە هاتبایە سەر دینی ئیسلام جزیەش لە بەیندا هەڵدەستا. هەڵبەت بەدەم ڕۆژگارەوە ئەم خولقخۆشییەی عەرەبی سەرەتای «جهاد» گۆڕا بۆ دنیادارییەکی خەستەخۆڵ، چ لەگەڵ فارس بێ یا کورد... ئومەوی و عەبباسی جۆرێک دینیان بەڕێوەدەبرد کە بنەبڕکردنی ماڵی پێغەمبەر هەمیشە لە نەخشەی سیاسەتیاندا بووە.

لە گۆشەیێکی ڕوونکەرەوەوە ئەم وێنەیە دەخەمە بەر نیگای خوێنەر. ئینگلیز و ئەڵمان، فەڕەنگ و گەلەکانی پێشکەوتووی ئەورووپا، ئایینی مەسیحییان

سەلماند کە بێگانەیە لە هەرچی بە ورێنە و خەیاڵیاندا دێت. زۆریشیان چێشت لە خەفەخان کردنی هەست و هۆشیان لەلایەن قەشەکانەوە کە بوون بە خاوەن دەسەڵات. ئایا ناشێ هەمان پرسیار لە حاڵوباری ئەوان بکرێت وەک کە لە کورد دەکرێت؟ شەڕی مەزهەبیی ئەوتۆش لە پێناو خیلافی عەقیدە کەوتە نێوان مەسیحیی ئەورووپایی و تا ئێستاش لە هێندێ شوێن بەردەوامە، کەمتر نەبووە «ئەگەر زۆرتر نەبووبێ» لەو هەرایانەی سەر بە مەزهەب کە لە ئیسلامدا ڕووی داوە، خۆ شەڕی «خاچ» بەرەکەتی لێ بێ ڕۆژگارەهای خایاند. بێگانەیەتیی ئەورووپایی لەگەڵ دینی مەسیح و مەسیحییەکانی ڕۆژهەڵاتی نزیک، گەلێک تیژتر بوو لە چاو حاڵوباری فارس و عەرەب و دینی زەردەشت و دینی محەمەد. فارسەکان لە دەمێکەوە تێکەڵاوییان هەبوو لەگەڵ بابل و ڕەگەزی سامی تا ئەوەی کاتبەکانیان ئارامی بوون و زمانی «هزڤارش» لە تێکەڵاوبوونی فارسی بە ئارامییەوە جێی خۆی کردەوە لە نووسینی ڕەسمی. لەلایەن دینیشەوە دێرزەمانێک بوو فارس و کورد ئاشنای جوولەکە بوون. کۆرش خۆی جوولەکە دوورخراوەکانی لە بابلەوە ناردەوە بۆ فەلەستین. کە ئیسلامیش ڕەوی هێنا بۆ فارس و کوردستان، خەلیفەی دووەم «عومەری کوڕی خەططاب» قوماندانەکانی لەشکری ڕاسپارد کە ئایینی زەردەشت بارتەقای دینە ئاسمانییەکان ڕەفتاری لەگەڵدا بکرێ. تەنها فەرقێکی هەبووبێ ئەوە بوو کە نەشێ موسڵمان ژنە زەردەشتی مارە بکات وەک کە دەتوانێ مەسیحی و جوولەکە مارە بکات. خولاسە بە هەموو گەز و گرێیەک عەرەب و نەتەوە ئێرانییەکان لە هەموو ڕوویێکەوە لێکتر نزیک بوون تا مەسیحی و ئەورووپاییەکان. زۆر بە سەیری، شاعیری عەرەب بە شیعر ڕاینواندووە کە ناوی «زمزم»ی مەککە لەوەوە هاتووە کە کۆمەڵێکی فارس لەو ناوەدا کاتی ژەم خواردن زەمزەمەی دینییان کردووە، ئیتر شاعیر دەڵێ:

زمزمت الفرس علی زمزم
وذاک في سالفها الاقدام

کەچی نە کەس دەپرسێتەوە بۆچی ئەورووپایی لە مەسیحییەت ناگەڕێنەوە، نە ئەورووپاییش بە زیندووکردنەوەی بوتپەرستیی خۆی و نەریتە کۆنەکانی پێشتر دەکەوێ. دەیان ملیۆن لە نەتەوەکانی سەر بە سۆڤێتستان مسڵمانن بە خۆیان و سەقافەت و دەوڵەتەکانیانەوە تا ئەوەی خەڵکی «چیچان» لەم ڕۆژەدا جانفیدایی بۆ سەربەخۆیی دەکات لە بەرگی ئیسلام. هەر ئەمانە بوون ستالین وەکوو کاڕووش و پەڵپینە دەریکێشان لە شەڕی دووەمدا بۆ هەندەرانی دوورخستنەوە، کەچی سوور بوون لەسەر دینەکەیان کە لە بەراورد کردندا هەرچی زەرەرێکی لە ئیسلامیان کردبێ ناگاتە بەرەکاتەکانی باوکی گەلان ستالینی فەرخەخوا.

خوێنەری ئازیز!! عەرەب قسەیەکی هەیە دەڵێی «ثبت العرش ثم انقش - عەرش بچەسپێنە لە پاشدان بینەخشێنە». ئێستا ڕۆژێک نییە وردە حیساب و دەفتەری کۆن بخوێنینەوە. ئامانجی سەرەکی پاراستنی کورد و کوردستانە. ناشێ هیچ هەرایەکی لاوەکی لە سەر دین یان چین یان گیانی ناوچەپەرستی یان دەمارکرژیی حیزبایەتی یان باییبوون بە خۆپەرستی ببێتە لەمپەڕ لەپێش بەرنامەی تەبایی و ڕەبایی کە بە داخەوە بەر لە هەموو ئامانجێک ئەمیان کە گیانی کوردە و ئێستا و دواڕۆژی کوردە، بۆتە قوربانی لە سەرووی لیستەی قوربانییان. تەنها مەترسییەک، لەلایەن دینەوە، لەوەدایە بە ناوی خوا و دروشمی قورئان، کوردایەتی بکرێتە کۆیلەی لایەنێک کە بە ناوی دین دنیا دەخوات وەک کە جارەها بە ناوی ئینتەرناشناڵ و پرۆلیتاریا کوردایەتی تاوانبار دەکرا گۆیا فکرەی سەر بە نەتەوایەتی زەنەی بۆرژوازییە و دژی ئیشتراکیی عیلمییە... کورد ئەگەر بۆی ڕێک بکەوێ مەلای ڕوونبینی زەین فرەوانی هەبێ لەم پلەدا تەیمانێکی مەحکەم لە بیروڕای دینی بە دەوری کوردایەتییەوە هەڵستێنێ و نەیەڵێ خەڵک بە قسەی عەوامخەڵەتێن تار بن لە ئامانجی سەرەکیی «کوردپارێزی»، کارێک ئەنجام دەدرێ بەشێکی زۆری چالاکیی سیاسیی کورد کە لە ڕەتکردنەوەی تۆمەتی لادینی خەرج دەکرێ، ئا ئەو بەشە چالاکییە یەکسەر دەچێتەوە بۆ دەخیلەی ئایەتیی «ئەرێتیی»

بەرژەوەندی کورد جگە لە خامۆشکردنی چەقەچەقی نێوان دیندۆست و دیننەویستی کورد.

ڕەخنەگرتن لە بابەتی پڕ هەست و خوستی وەک ئایین کارێک نییە لە شوێنی وەک کوردستان و فورسستان و ئەفغانستان بە شێوەیەکی ڕەها و ئاشکرا و پڕ بەدەم بخرێتە کۆشی ئاپۆرەی خەڵقەوە و مەسەلەکە بهێندرێتە ڕیزی نرخاندی ڕاوەماسی و تەماتەچاندن و لە سەری زمانەوە بگوترێ دین فاکوفیک و ڕەنجبەخەسارییە و خەڵکەکەش بە دڵی ئارامەوە بڵێن، مەمنوونی ئەم ڕێنموونیەین... تۆ ئەگەر لە سەردەمی لینین و ستالین بە ئاشکرا ناڕەزامەندیت لە شیوعییەتە کاڵوکرچەکە گرتبایە، ڕەنگ بوو بەشێکی زۆر لە میللەتی دڵشکستەی تێشکاو، بە ئارەزۆ گوێی لێ گرتبای، بەڵام حکوومەت خۆی نەفەستی دەبڕی، کەچی ئەگەر ڕەخنەی زەق لە دین بگریت لە نێوان کوردگەلی ئەمڕۆکە میللەتەکە لێت ڕاست دەبێتەوە. بەشێکی بە پۆزی خەباتگێڕان لێیان خۆش دێت، واتە حاڵەتەکە بە پێچەوانەوەیە، هەر دەبێ وەهاش بێ، چونکە حاجی و حاجیژنێکی بەر لە هەزارساڵی ڕێی کولەمەرگیی حیجازی دەبڕی، بەو هەموو ئەرک و خەتەرەی تێیدا بوو بە نیازێکی پاداشێکی خودایی بێ بڕانەوەی پاش مەرگ، هەر خۆیەتی ئەمڕۆکە بارتەقای ڕابوردوو چاوی لە نوشتە و کشتەکە و، پێی بکرێ، خۆی هەڵدەکوتێ بۆ حیجاز یان بۆ سەر وەکاشە و عەبابەیلێ...

یەکێک بیەوێ لە نێوان میللەتی جنۆکەپەرست دەست لە جنۆکان ببزێوێ دەبێ بەر لە هەموو شتێک قسەی بڕندە و ڕستەی ئابڕووتکێن لە فەرهەنگی وتووێژی خۆی بسڕێتەوە بە تابیەتی کە ئامانجی وەک «چارەنووس»ی نەتەوەی بە ملەوە بێ. هەرچی بۆڵشەڤیکەکانی 1917 و دواتر بوون ئەو تەقیەیان نەبوو چونکە لەناوبردنی چینی ناوەڕاست بەلایانەوە مەبەستێکی سەرەکی بوو، گاڵتە بە مزگەوت و کەنیشتە بەراتنەمای پاکی و قاڵبوونەوە بوو لە هەستی چینایەتی و بێ دینایەتی. «بێنیازبوون لە چینی ناوەڕاست ئەفسانەیەکی خۆخەڵەتاندن بوو... چاوبەستەکێ لە خۆ و لە پرۆلیتاریا بوو کە

نەدەشیا و نەدەکرا و نەدەلوا بێ زانا و ڕۆشنبیر و ئەندازیار و تەیارەچی و مامۆستای جامیعە و... و... کە هەموو هی ناوەڕاستن، یەک کاری زانستی و فەننی و پیشەسازی و پزیشکی و ڕەسمی و جەنگی و وەرزێری و... و... بە پرۆلیتاریا جێبەجێ بکرێ، مەگەر کرێکار و وەرزێر و ڕەنجبەر و ڕەنجدەر لە پێستی پرۆلیتاریا دەرچێت و ببێتە بۆرجوازییەکی مەلعوونی زانا و پسپۆر... حیکایەتەکە بەسفتوسۆیە زۆریشی بەدەمەوەیە... » کە لە ئاکامدا دەرچوو ئەم کوڕێنییەش ڕیشخەندێک بوو خوێنگەرمێکی بەپەلەی کەللە نیوەبەتاڵ بە خۆی دەکرد ئەوجا بە خەڵک...

لە نموونەدا ڕووداوێکی واقیعی کە خۆم ئاگاداری هەم بە عەرزی خوێنەری دەگەیەنم: باوکم لە سەردانێکی هەولێر، کە میوانی مەلا ئەفەندی دەبوو، بەدەم وتووێژی هەمەچەشنەوە و لە وەڵامی قسەیەکی مەلا ئەفەندی کە بە باوکمی گوت: دەڵێن «محمد عبده»ی جەنابت ڕیبای حەڵاڵ کردووە... باوکم پێی دەڵێتەوە: ئەگەر تەفسیرەکەیت لایە سەیرێکی ئایەتی «احل الله البیع وحرم الربا» بفەرموو... ئەو شەوە تێپەڕی، سبەینێ مەلا ئەفەندی بە باوکمی گوتەوە: بەڕاستی شێخ موحەممەد عەبد ە قسەی چاک و ڕاستی فەرمووە... شێخ محمد عبده ئەگەر پاتەوپات بە گژ ئایەتەکەدا هاتبایەوە لەسەری بە کوفر دەژمێردرا بەڵام بەو بەڵگە و بەرژەوەندە و لێکدانەوەی ژیرانە (وەک ئەوەی کە ڕیباخۆر یەکسەر پارە بە ڕیبای 10%، 15% نادات. ئەو پارەیەی ڕیباکەی پێ وەردەگرێت دەیکاتە نرخی ڕەهنی خانووی کابرای قەرزوەرگر، ئەمجا خانووەکە بە کرێ دەداتەوە خاوەنەکەی، کرێکەش لە جیاتی 4%، 5% ی فایزی بانک دەچێتە 15% بەڵکوو 20% گۆیا ئەم تاڵانکردنە لە جغزی شەریعەتدایە) کە چاری مەسەلەکەی پێ کردووە هەم ڕێگەیەکی بەرژەوەندی پیاوی ناچاری دۆزیوەتەوە و هەم لە توانج و تۆمەتی مێشکوشکان خۆی ڕەها کردووە. لەم دوو بەیتەدا شێخ محەمەد عبده خۆی و ناحەزەکانی ڕوون کردۆتەوە:

ولست ابالي ان يقال محمد أبل او اكتظت عليه الماتم
واكن دينا قد اردت صلاحه مخافة ان تقضى عليه العمائم

(مانای دوو بەیتەکە ئەمەیە: گوێ نادەمە ئەوەی بگوترێ محمد عبده دروستی فەرموو یاخود گوناهـ کەڵەکەی لەسەر کردووە، بەڵام ویستوومە چاکە بە دینێک بگەیەنم کە لەوانەیە عەمامە لە ناوی ببات. کورد دەڵێ «عەمامە». ڕاستیی وشەکە عیمامەیە).

پسپۆری دەردی کۆمەڵایەتی فەرقێکی نییە لەگەڵ پزیشکی لەش و نەفس، بەڵام داخم ناچێ نە دەردی کۆمەڵ نە دەرمانی دەردەکە بنگە و بنەما و بەڵگەی سەلمـینراوی نییە ببێتە دیارخەری چارەسەرکردنەکە، لە زۆرترین حاڵ و باریشدا ڕاوێژی کەسانێک زاڵ دەبێت کە تیژ دادەبڕن و قەبە دەچڕن. مادەم مەسەلەی وتووێژ سەر بە چارەسەرکرنی گیروگرفتی کۆمەڵایەتی بێ، ئەو چارەسەرکەرانە ئەگەر بە هەمان خەسڵەتەوە ببنە پزیشک، کورت و کرمانجی، هەر ئەندامێک عەیبێکی هێنا دەیبڕنەوە، لەوانەیە ژانەسەر کە بە یەک دانە حەب دەڕەوێتەوە بە قوتکردنی سەرەکە چاربکرێت، خۆ شۆڕشگێڕان لە چەندەها هەڵکەوتدا هەمان چارەی «بنەبڕکردن»یان بەکارهێناوە وەک کە مامە پۆلپۆت، ماڵی بەخانەی خوا، چەندین ملیۆنی لە چینی ناوەڕاست کوشت، تا نەتەوەکەی وەک تەیری ئاوەڕووت خاوێن کردەوە. ئەوانەی مەراقی شتێک لە دەروونیان ڕۆدەچێ بە نەیاری وەکوو ئەوەیان لێ دێ کە دەڵێن «هار» بەدیتنی ئاو دێتە مردن. لە حاڵی شەیدابوونیش بۆ مەراقێک هەمان خۆبزرکردن بەرانبەر مەعشووق شەیداکە دەتوێنێتەوە. ئەم زێدەڕۆییە لە نەیاری و لە عیشق «لە ئایدیۆلۆژی، سیاسی بێ یا دینی» شەقڵی خەباتی جیهانی صەدو... سێیەمە، هێندەی وەسوەسەی دینداری خنکاوی هەلومەرجی عیبادەتی بێخەوش لە گوێچکەی

دڵی دەجریوێنێ و ئوقرەی لێ هەڵدەگرێ. ئافرەتێکی کۆیی، بەرێوجێ، چەندین منداڵی ساوای خۆی لە سەرمای زستاندا کوشت بە نامەی پاشەڵخاوێنێ، مێردەکەی، مەلا شێخ صدیق، بە پێچەوانەی ئەو بوو. ڕۆژێکیان ئافرەتەکە دەپاڕیتەوە لە خوا و بە دوورودرێژی «خوایە تۆبە، خوایە تۆبە، خوایە...»ی لەو مەراقە بەکار دێنێ. مەلا لێی بەجواب دێت: هەی ماڵ کاول چیتە ئەوەندە تۆبە تۆبە تۆبە، کەوایەکت لەبەرە بێ کۆبە، ژوورەکمان هەیە بێ سۆبە، دەئەتووش تۆبەکە بکە بە نۆبە ماڵی تۆبەت شێوێ...

- ئایینی زەردەشتی تا چ ڕادەیەک هەلومەرجی بڵاو بوونەوە و گونجان و وەرگرتنی لەناو کوردا هەبووە: ئایا لە ستدانی ئەم ئایینە چ سەنگ و بایەخێکی دیاریکراوی لە پێکهاتەی نەتەوەی کورد و چارەنووسیدا دیوە؟

دوو وشەی «ستدان» و «پێکهاتە» لێڵییەک دەخاتە مەبەست لە پرسیارەکە چونکە من هیچ کامێکیانم بەو دەقە نەدیتوون و ناشزانم چ ڕادەگەیەنن. ئەگەر مەبەست «لەدەستدانی ئەم ئایینە» بێ ناشێ «لەدەست دان» سەنگ و بایەخی دیاریکراوی هەبێ لە «پێکهاتە» و چارەنووسی نەتەوە. سەرەتای پرسیارەکە تاکوو دەگاتە «لەناو کوردا هەبووە» مەفهوومە، لەوە بەدواوە ڕێ بەدیی کردن، بۆ من، زۆر دژوارە. جارێ لە پێشەوە دەبێ بڵێم، من تا ئەم دەمە نەگەیشتمە بیروڕایەک دەربارەی چەند و چۆنیی ئایینی زەردەشت کە دەزانین ئەسکەندەری مەکدۆنی کتێبخانەی ڕەسمیی هەخامەنشییانی سووتاند بە ئاڤێستاوە کە گۆیا لە پێستی چەندین هەزار مەڕ یان گاجووت نووسرابوو... چی لە ئەسڵە ئاڤێستا ماوەتەوە، بە پێی توێژینەوەی پسپۆڕانی ڕۆژاوا، لە بەشی هەرەکۆنی ناوی ئاسن نییە وابزانم «خوێ»ش هەروەها. لە ئەفلاتوون دەگێڕنەوە کە گوتوەتی: زەردەشت 6000 ساڵ پێش ئەفلاتوون خۆی، ژیاوە. سەرت نەیەشێنم چەندێکی لە نووسینی تەرجەمەکراوی غەرب بۆ فارسی وەیا نووسینی نووسەرانی فارس خۆیان هاتبێتە بەرچاوم لەبارەی ئەم دینە و

پێغەمبەرەکەیەوە ڕایەکی متمانەبەخشم لێ چەنگ نەکەوتووە، خۆ ئەگەر بە موعجیزەش هەموو ڕاستییەکی سەر بەم پرسیارە بۆم ڕوون بێتەوە ئەوساش وەڵامی ئەو بەشەی سەر بە تەئسیری ئایینی زەردەشت لە کورد هەر دەمێنێتەوە بە گەنجێکی ناو تاریکایی چونکە کوردەکە خۆی نوقمی تاریکایی بێمێژووی خۆیەتی، تا ئەوەی کە دەشڵێین مادەکان کوردن قسەی خێرەومەندی غەیری کورد دەکوتینەوە، سەرەڕای ئەو ڕاستییە کە کورد نیشتەجێی وڵاتێکە کە ماددەکان تێیدا ژیاون، هەرنەبێ لەو بەشەی کوردستان کە کەوتۆتە دیوی ئێران.

بە پێی ئەو هێندە خەبەراتەی لە دەوری ماد و ئاڤێستا و زەردەشت و بڵاوبوونەوەی دینی زەردەشت هەڵدێن بەشێکی فەرمانڕەوایی ماد دەکەوێتە پێش پێغەمبەرایەتیی زەردەشت، بگرە بەلای هێندێ بۆچوونی بەشێک لە تۆژەرەوەی زەردەشتایەتی، زەردەشت دوای تێچوونی حکوومەتی ماد بووە بە پێغەمبەر. بە هەمە حاڵ وا پێ ناچێ ڕۆژێک لە ڕۆژان کورد هەڵسووڕێنی کاروباری دەستووراتی ئاڤێستا بووبێ، بەڵکوو ئایینێکی سەر بە ئاڤێستای دەکار هێناوە کە بەسەر ڕەعیەی پلەی هەرەژێری ئاڤێستاناس سەپێنراوە و هەرگیز هەژاری پێ نەحەساوەتەوە.

لەمەش بترازێین، زەردەشتایەتی تەنها لە کولانەی چاکە و خراپە و ئاکار و ڕەفتار و گوفتارەوە سەیری جیهانی کردووە و یاسای بۆ داناوە، ببڕای ببڕای لەگەڵ زانست، هونەر و حیساب و هەندەسە و فەلسەفە و فەلەک... و... ئەوان لایەنانە تێکەڵاوییەکی نەبووە، ئەویش تا ڕادەیەک وەک دینی مەسیحی خەریکی پەروەردەکردنی مرۆ بووە، وەکوو دایانی دڵسوز، پاکی ڕاگرێت و چاکی ڕێنموونی بکات و بەسەر «چینۆت»دا بۆ بەهەشتی بپەڕێنێتەوە، چەندی لە ئامۆژگاری بۆ سەگ و گا و مەڕ و ماڵ و پاک ڕاگرتنی خاک و ئاو سفارشی کردووە، هەزار یەکی ئەوە، بگرە هەر هیچ، بەلای شیتەڵکردنی مەتەڵەکانی سروشتدا نەچووە. خەریک بووە ئەهریمەن ببەزێنێ و ئاهورامەزدا و یاریدەدەرەکانی ڕازی بکات، قەتیش نەمدیت لە

نووسینێکدا فکرەی ڕووناکی و تاریکی، وەک دیاردەیەکی سروشتی نەک موعجیزەی خودا، نە لە زەردەشت و قوتابییەکانییەوە، نە لەو نووسەرانەی ئەورووپا و ئێران کە خەریکی زەردەشت و ئاڤێستا بوون، سەرچاوەیەکی غەیری ئاهورامەزدا و ئەهریمەنی.. لە قەبەڵ کرابێ، بەڵکوو هەرچی بوونەوەری هەیە بە بێ ڕاڤەی عیلمی بەجێ هێڵراوە لە دینی زەردەشتدا.

پێشتر لە بارەی پەیدابوونی ئایینەوە دوام. لێرەدا، هەر لە کولانەی سەرەتای پەیدابوونی ئایینەوە سەیری زەردەشتایەتی دەکەم کە بێگومان ئاڤێستا و بەند و سفارشەکانی و دەستوورەکانی چاکە و خراپەی و موژدەی بەهەشت و هەڕەشەی جەهەندەمی ئایینێکی سەقامگیری تێکهەڵکێش و بە سزا و پاداشتی ناوەتەوە، بەڵام هەر چونکە لایەنی «علمانیەت» و ئەندێشە و لێکدانەوەی «هۆ و ئاکام»ی دیاردەکانی سروشت و گیانلەبەری نەبووە و هەمووی هەر پەند و ئامۆژگاری و ملنان و ڕچەبەستن بووە، بە ئاسانی و ئاسایی و داخوازی و «حەتمیە» دینەکە بۆتە قوڕەچەورەی دەستی خاوەن دەسەڵاتان تا کار گەیشتە پلەیەک لە بەدایەتی کە باسی «ئارداڤێراف نامە» خۆی ترنجاندە ناو عەقیدەوە کە گۆیا یەکێک لە مووبەدە زلەکان خۆی بەخت کرد بۆ گەشتێکی ئەودیوی جیهانی بەرچاو، بە نیازی «سەر لەنوێ ئاشنابوونی ڕاستییەکانی عەقیدە». وشەی ئارداڤیراف بریتییە لە «ئەرەتە» بە واتای ڕاست و دروست و لە «ڤیراف» بە واتای ئازا کە بێ تەئویل و پاتەوپات «وێراو»ەکەی کوردییە بە ڕێکەوت لەو ناوەدا ماوەتەوە. وەک بزانم «وێران» لە فارسیدا بەم دەقە وشەیەکی نییە. بە هەمە حاڵ، کەسێکی کنە بکات لە دینی زەردەشت بە نیازی دۆزینەوەی گەوهەر و ئەڵماسی ئەوتۆ، بەژن و باڵای ئەنجن ئەنجنی کوردی کۆنینەی پێ برازێنێتەوە و برینەکانی سارێژ بکات، ماڵم حەقە، کەرتە شیشۆقێکی شکاویشی چەنگ ناکەوێ، چونکە دینەکە ماڵی فارس و ئەشکانی بووە، کوردەکە لە هیچ ڕوویەکەوە نەیتوانیوە سوودێکی سەر بە نەتەوایەتیی خۆیەوە لەو دینە هەڵکرێنێ. لە نەتەوایەتی بگەڕێ و دەست لە کەسایەتیی تاکی کورد گیر بکە، ئەو خاک بەسەرە چ

حەددی هەبووە زوڵمی پاتەوپات و دوور لە هەموو ئاکارێکی مرۆیانە ڕەت بکاتەوە و سەرپێچیی لێ بکات. گۆیا ئەگەر لەم ڕۆژگارەدا کورد با بداتەوە سەر دینی ئاڤێستای ساسانییەکان چ سوودێک بە خۆی و چارەنووسی دەگەیەنێ کە دەزانین ئەگەر بەڕاستی ببینە ئاڤێستای ئەو هێندە سەقافەتەی لە یۆنانییەکانەوە پێمان گەییوە، ئەویش، دەبێ بسڕێتەوە. ئێمە و گەلانی ڕۆژهەڵاتی لە ئێمە پێشکەوتووتریش بە دەست هێندێ کۆسپی کە ئایین لەم سەردەمەدا دەیخاتە بەر هەنگاوی ڕەوتی بەرەوپێشەوە، دۆش دادەمێنین و بە فاکوفیک و تەئویل و مەرایی حورمەت بۆ کۆسپەکان دەهێڵینەوە و بەسەریاندا تێدەپەڕین، ئەمجا ئەگەر بگەڕێینەوە بۆ 1500 ساڵی لێرە بە پێشەوەی سەردەمی ساسانی دەبێ حاڵمان چی بێ بەدەست تەئویل و هەڵبەستنەوە و کەلێن گرتن و لەمپەر لادان؟ دەزانم دەقی پرسیارەکە ڕووبەڕووی ئەم حاڵەتەمان ناکات بەڵام سەیرکردنی ئیسلام وەکوو لەمپەرێکی زل لەبەر هەنگاوی کورد و توێژینەوە لە دەوری پەسەندی ئاڤێستا لە «پێکهاتە» ی نەتەوەی کورد ئەم کێشەیەمان بە ملدا دەدات.

هەرچەند من لە بارێکدا نیم کون و کاژێرکی مێژووی هەزار و دوو هەزار ساڵی تێپەڕیومان بە سەح بکەمەوە (بە سەح کردنەوە لە «سهیتن»ی پەهلەوی نزیکە، بگرە هەر خۆیەتی. دەگوترێ: مەڕەکە بەسەح بکەوە) بۆ قاڵکردنەوەی چەندی چاکە و چەندی خراپە لەوەی کراوە بەسەر خەڵقدا هاتووە چ لە سۆنگەی ئایینەوە بێت و چ لە هی سیاسەت، دیسانەوە ئەو واقیعە ڕەجاڵەی کوردی لەباوەش گرتووە لە هەموو ئەو ڕۆژگارانەی دەنگ و باس و زەمزەمەیەکی بە ئێمە گەیشتووە، هێمایەکی ڕاگەیەن دەکات بۆ ڕۆژگارێکی بەر لە ئیسلام کە کورد تێیدا کۆیلەی ساسانییان بووە، بێ دەسەڵات و بێ ڕەوت، گەلێک کەنەفتتر بووە لەو سەردەمانەی کە تێیدا بوو بە ڕەعیەیەکی هاوشانی ڕەعیەی فارس لەژێر ڕکێفی عەرەب. ئێستا ئەگەر دەوڵەتێک سواری تورکیا ببێت کام خەسارەت لە کورد دەکەوێت؟ لە دەمی عەبباسییەکانیشدا حاڵی کورد ئەوە بووە کە خۆ و تاڵع ئاغایەکی نوێ بوو بە

قەمچیوەشێن بەسەر فارسەوە، کوردیشی لەگەڵدا بێ کە هەردەم قامچیی لە ناو شانان ڕاکێشراوە.

خولاسە من چ ڕووناکییەک نادۆزمەوە لە ئاڤێستایەکی ساسانی کوردی پێ بەستبێتەوە، سەرفی نەزەریش دەکەم لەوەی ئاڤێستا ڕابەری جیهانناسی و سەرچاوەی زانست و فەلسەفە و هونەر نەبوو. دەسبەتاڵیی کورد لە پیت و بەرەکەتی ئاڤێستا لەم دەمەدا، کە ڕۆژی 26\7\1997ـە، بەوەدا دیارە کەمتاکورتێکی زێدە زێدە ناچیز نەبێ لە وشە و زاراوەکانی لە کوردیدا بە دەر نادا‌تەوە کەچی زمانی فارسی چونکە پێی زاڵ و سوودمەند بوو، یەک فەرهەنگۆکی دڵدەرەوەی لەو سامانە فەرهەنگییەی کۆنینەی زەردەشت بۆ ماوەتەوە. ئێمە لە چاکەی زەردەشت هەر ئەوەمان بۆ دەمێنێتەوە کە کورد بووبێت بە پێی زاهیری حاڵیش کە لە کتێبدا نووسراوە، زەردەشت بە خۆی و خێزانی گەشتی «پەرەتو زەمو»ی لە زستاندا کردووە، لە ناوچەی ڕەیەوە بەرەو ڕۆژهەڵات. «ڕەی» کە ڕەگەی پێ گوتراوە بەشێکی وڵاتی مادە. «پەرەتو زەمو»ش بە واتای تێپەڕینی زستانە دێت. گۆیا لەسەر سفارشاتی فەقیردۆستانەی لەلایەن دەسەڵاتدارانەوە بڕیاری ئافەرۆزکردن و وڵات بە دەریان بەسەردا هێناوە...

- موتوربەکردنی هەندێ لە نووسینەکانتان بە هێنانەوەی ئایەتی قورئان و ئاماژەیان بۆ کولتووری ئیسلامی شەقڵ و سیمایەکی ئیسلامییانەی داوەتە پاڵیان. بەڕێزتان چۆن پاڵپشتی لەم بۆچوونە دەکەن، یاخود.!؟

خۆزی، بەنموونە، چەند شوێنێکی ئایەتیان تێدا هاتووە لە نووسینی مندا دەتخستە بەرچاوی خوێنەر تا بزانین چەندی زەرەرە بۆ «پەز»ەکەی کابرای جاف. ساڵی 1954 کە یەکەم کۆبوونەوەی ئاشتیخوازان لە بەغدادا پێکهات دروشمی هەرە زل و ئاشکرا و شکۆداری ئەو ئاهەنگە ئایەتی «ادخلوا في السلم كافة» بوو، کە دەزانیت ئاشتیخوازی هی بەرەیەک بوو خۆی لەسەر

بنەمای «الحاد» ڕاگرتبووە. وەک لە بیرمە ساڵێکیان خرۆشچێڤ سەردانی میسری کرد بەپێی داخوازی ڕێکەوت و حاڵ قسەی ئیماندارانەی دەبزرِکاند. لە نووسینی مولحیدێکی ڕووسیم خوێندەوە دەڵێ. من هەرچەند مولحیدم بەڵام دەبێ بە پێی پەروەردەبوونم جوزئێکی خوا لە مندا هەبێ دەنا بە ئینسان دانانرێم. بە دوا ئەمەدا دەڵێ فلان و فلان و فلان چونکە خوا لە تەرکیبیاندا نەبوو بۆیە وەها درِندە بوون...

ساڵێک لە ساڵانی 1970 کە ئەندامی کۆڕی زانیاریی کورد بووم لێم داوا کرا شتێک بنووسم لەسەر «ئافرەت لە مەڵبەندی ئۆتۆنۆمی/ حکم ذاتی... » یەکێک لە ئامۆژگارییە هەرە خەستوخۆڵەکانم ئەوە بوو کە ئەولاد دەبێ لە ئاست باوک و دایکی ئەم ئایەتە گەش و شەرافەتمەندە دروشمی بێت «واخفض لهما جناح الذل من الرحمة وقل ربي ارحمهما كما ربياني صغيرا» و لەبیر نەکات کە ڕۆژێک خۆی دەبێتە باوک یان دایک و چاو لە بەزەیی منداڵەکەی خۆی چرِ دەکاتەوە.

ئەم جیهانە خۆی لە خۆیدا (مەبەست جیهانی مرۆیە) و بە پێی پێداویستی بەرژەوەند کەرت کەرت و بربرِ نەبووە، خۆ ئەگەر بەرژەوەند هۆ بێت، لێکترازانی خەڵک بان چاوم و سەد ماشەڵای لێ بێت، بەڵام بە داخەوە مرۆ وەک کۆمپیوتەر نییە بە پێی ئەکتەرەکانی ئەریێتی و نەریێتی برِەقسێ و کۆڵ بدات. وا دەبێ لەسەر شەش و بێشی تاوڵی خەنجەر هەڵدەکێشرێت، لەوانەیشە لایەکی وڵات وێران ببێت و پەندی ئاگرە سوورە لە خۆم دوورە ورتە لە خەڵک ببرِێت. تا ئەوەی لەسەر «موتوربە کردنی ئایەتی قورئان» لە وڵاتی مسڵمانان لێ پێچانەوە و گوێ قوتبوون پەیدا دەبێ پێویستە زەمانە هەڵگێرِیتەوە بۆ ئەو ڕۆژەی حیزبی بۆڵشەڤیک لە ڕووسیا ئیلحادی کرد بە ئایینی خۆی. وا لەم ڕۆژەدا گیانی پشت بە غەیب بەستن و جلکی کامڵانە لە زۆر شوێنی ئەم زەوییەی (هێندەی کدوولەیەکە لە چاو ئەستێرە زلەکان) برەو دەسێنێ. با شتێکت بۆ بگێرِمەوە لە تەجرەبەی خۆم: ساڵی 1966 لە «قبول»ی دیوەخانەیەک و بە پێی بابەتی قسە گوتم: ئەورووپای سەردەمی

ڕینێسانس بە ئومێدی ڕزگاربوون لە کۆتی خەفەخانی کەنیسە و ڕەجعییەت دڵ و گیانی کردبۆوە بۆ فکری تازە: بەڵام کە گەشبینییەکە بە هۆی شەڕ لە دوا شەڕ و تێکهاویشتنی کۆمەڵە لێکتر جوداکانی سیاسەت و بەردەوامی زوڵم و ناڕاحەتیی خەڵکەکە دڵشکستە بوو، بە تایبەتی پاش دوو شەڕی هەرە دڕندەی جیهانی، لە ئاست ئەو نەهاتنەدیی ئومێد و ئاواتی تێشکاو تا بڵێی سارد بۆوە، لە گوڕی سەرەتای ڕینێسانس، تا دەبینین لە ئەڵمانیای دوای ناوەڕاستی سەدەی بیستەم حیزبی هەیە بە مەسیحییەتەوە ناوی دێت... بەڵام قسەکانم لای خەڵقەکە کاریگەر نەبوو، تومەز هەر کەسە گوێز لە هەنبانەی خۆی دەژمێرێت. ڕەنگە من یەکێک بم لەو کەم تا کورتەی گوێز لە هەنبانی واقع دەژمێرێت... ئێستا دەبینی حیزبی شیوعیی ئیتالیا ناوناوە لە ڤاتیکان نزیک دەبێتەوە و سڵ ناکاتەوە لە مەسیحییەت... لە حاڵێکدا دەوڵەتی شیوعی لەگەڵ دەوڵەتی شیوعی لێکتر دڕدۆنگ بوون و دەبن... خولاسە ئەو زرە تیشکانەی حیسابی خۆشکەڵەی گەشبینانە دەیدات، لەوەدا نییە کە دیتت ڕۆژنامەیەکی شیوعی بە دوا ناوی پێغەمبەردا «ص» دەنووسێت واقت وڕ بمێنێ... منداڵبازاڕیی سەرەتاکانی چەپرۆیی و پەڕگیری کز بۆتەوە (دەبوو دەمێک بێ دەورانی بەسەر چووبێت) هەرچەند لەو وڵاتە ئاخرشەڕانەی جیهانی سەد و سێیەم، نەزانی و گەمژەڵیی خەستوخۆڵ جووڵەی تازە بە تازە هەڵدێنێ بۆ تەڕدەماغیی کەللەپووچەڵان.

ئەگەر ڕێک کەوتبایە، برای ئازیز، دوو بە دوویی و لە وتووێژی مەحرەمانە یەکدیگیر بووباینایە دەشیا گەلێک لایەنی شرایەوەی باوەڕی ئایینی، کە مەلاکانیش بۆی نەچوون، بۆتم ڕوون کردبایەوە. سەیر لەوەدایە کە بە ڕێکەوت من لەم ڕۆژنەدا چوار ئینجیلەکەی مەسیحی لەگەڵ قسە و نامەی قوتابییانی مەسیح خۆی، دەخوێنمەوە لە کتێبێک کە سەرناوەکەی «کتاب الحیاة»ی لێ نووسراوە. وا لەم چەند دێڕەی داهاتوودا نموونەیەکی سەرباسی «الرؤیا»ت بۆ دەنووسمەوە کە «یوحەننا» لە زاری مەسیحەوە دەیگێڕێتەوە لە سەرەتاکانی لاپەڕە 753 دەست پێ دەکات بەم شێوەیە:

«وعندما نفخ الملاك السادس في بوقه، سمعت صوتا اتيا من القرون الاربعة لمذبح الذهب الموجود امام الله، يقول للملاك السادس الذي يحمل البوق «اطلق الملائكة الاربعة المقيدين عند نهر الفرات الكبير». وكان هؤلاء الملائكة الاربعة مجهزين استعداد لهذه الساعة واليوم والشهر والسنة، فأطلقوا ليقتلوا ثلث البشر».

گۆیا دینی مەسیحی دینی بەزەیی و میهرەبانییە... ئەم چەند دێڕەی نموونە لە چاو ئەو ئایەتانەی وەسفی خوا دەکات هەر نموودیان نییە...

- وشە و تێگەی «ژن» تا ئێستا چەندین پێناسە و وەسفی جۆراوجۆری وەک باش و خراپ، تاڵ و شیرین، خۆش و ناخۆش... تاد، چۆتە پاڵ، ئایا بۆ بەڕێزتان دروشم و ڕستەی «ژن نیوەی کۆمەڵە» لەتەک ئەو وەسفانەی دیکەدا پانتایی چەمکی ژن دێنێ؟

لەپێشەوە دەڵێم وشەی «تێگە» یەکەم جارە دەیبینم، پێشتریش نەمبیستووە ئیتر پەنا بەخوا! لە ئاست ئەوەدا کە «ژن نیوەی کۆمەڵە» گرفتێک نابینم، چونکە پیاویش نیوەی کۆمەڵە، بەهەردوو لایان تراجیدیای لایەنی ناپەسەندی کۆمەڵایەتی و زەماوەندی لایەنە چاکەکەی پێک دەهێنن و بەمەشدا بایی سەری دەرزی لە ناسینەوەی کۆمەڵ و پیاو و ژن نەهاتۆتە بەر بینین و زانین و هەستمان چونکە شتێکمان گوتووە بەلای کەمزانیمانەوە دەبات وەک ئەوەی بابایەک سوێند بخوات لەسەر هێندێ کە مەیموون چەڵتوک نییە.

بەر لە سێ ساڵ یەکێک لە سیاسەتمەدارانی هەرەهەرە زلی کورد لە دانیشتنێکی دوو قۆڵی لێمی پرسی: ئافرەت لەم سەردەمەدا، بەتایبەتی لە وڵاتە پێشکەوتووەکان، بارتەقای پیاو، هەموو مەیدانێک بەڕوویدا کراوەتەوە و کەم و کەسری نییە لەوەی پێی دەڵێن ئازادیی کردار و گفتار و ڕەفتار، کەچی لە توانستی ئەدەبی و زانستی و هونەریدا (واتا لایەنی هۆشەکی، عەقڵی)

هێندەی پیاو بڕشتی نییە؟ لە وەڵامدا پێم گوتەوە: سروشت ئافرەتی ئامادە کردووە کە ساڵی جارێک منداڵی ببێت، نۆ مانگ هی حەمل و سێ مانگیش تا دەگاتەوە حەملی دووەم. بەدوا حەملیشدا دەوری ساڵ و نیوێک خەریکی شیر دان و شەونخونیی خاوێن کردنەوەی دەبێت...

ئەم ئەرکە لە سنوور بەدەرە هەروا «بێ نرخ» بەسەر ئافرەتدا تێناپەڕێت. تۆ بێنە پیاو ناچار بکە بە درێژایی عومری، بێ حەمل، ئەو ئەرکە پشتشکێنەی ئافرەت هەڵیدەگرێ ئەو هەڵیبگرێ، ئایا چەندی بۆ دەمێنێتەوە لەمەودای ئیبداع و زێدە بڕشت و بەرهەم، هەرچەند کە ئەرکەکە وەک هی ئافرەتیش نییە کە سروشتکرد و ئەسەردار بێ لە تەکوینی بایۆلۆجیی پیاوەکە. بێگومان سروشت «حاتەمی تەی» نییە وەها بکات ئافرەت هەم لەپەروەدەی منداڵ سەرامەد بێت و هەم لە مەیدانەکانی کە پیاو تێیاندا باڵادەستە، خۆ ئەگەر هێندە پاڵەوان بوایە پیاوی دەکرد بە کۆیلەی خۆی.

لەگەڵ ئەم ڕاستییەشدا ئافرەت هەر دەمێنێتەوە بە خالقی ژیان و پارێزگاری نەوع و نەتەوە، چونکە چەندێکی پیاو پاڵەوانی ماسولکە و مێشک بێت هەر ناگەیێنێتە ئەو کانیاوەی خوێن کە ژن لە هەناویدا منداڵی پێ دەژیێنێ. پیاو لەوانەیە وەکوو کەڵەشێر بە ڕێگەوە منداڵێک بخاتە ڕەحمی مێینەیەک و قەتیش نەزانێ ئەو وەچەیەی خستۆتە سەر دنیا، کەچی ئافرەتەکە بەپێی بڕیاری سروشت دەبێتە یەخسیری ئەو وەلەدەزایینە مەگەر ناچاری و بێدەرەتانی کۆرپەکەی پێ خەفە بکات.

لە بڕە شیعرێکی باوکمدا ئەمە دەخوێنیتەوە:

تەربییە لە لای داکە
داک چاک بێ ئەولاد چاکە
باب لە ئەصڵا بێباکە
فەرقیک ناکا چەندان

داک مامۆستای فطرییە
تەشەککولت لەوییە

ماددی یا مەعنەوییە
ڕوشدە یا لەڕێ لادان

کە داکی چاکی نەبی
سێ سەد حەدیثی نەبی

چلۆن تەئسیری دەبی
وەک پڤ لە پەتک و سندان

من تێ ناگەم بۆ دەبێ پیاو خۆی بکاتە پزیشک و مامۆستا و ڕابەر و نرخسازی ئافرەت، هەر یەکە بە جۆرێک لە هەوایەک بۆی دەچڕێ و دادەبڕێ، گۆیا پیاو خۆی هێندە پاشەڵخاوێنە نەشێ وەک ئافرەت بخرێتە بەر زەڕەبینی چاکە و خراپە تێیدا؟ ئەو شەڕ و کوشتار و کاولکردن و سووتاندن و ڕووتاندنەوە پیاو دەیکات یان ئافرەت؟ من ڕێ بە خۆم نادەم ئافرەت بە خەیاڵ بخەمە جێی پیاو و ئەو تاوانەی وەپاڵ بدەم کە پیاو خستۆتیە ئەستۆی خۆیەوە. واقیعی زەق و زۆپ دەکەمە شایەد و کردەوەی هەردووکیان دەدەمە بەر پێوانەی چاکە و خراپە، بەولای ئاشکراوە ئاشکرایە کە قەمچی و دەمانچە و بۆمبای ئەتۆم لەدەست پیاودایە... بەرتیلخۆر و بەرتیلدەر پیاون... قاچاغچی و دزی شەوانە... بەزۆری شایەدی درۆزن... خەبەردەر لە بێتاوانان هەمووی هەر پیاوە، بەمەشدا، لە نوختەنەزەری هەڵسەنگاندنی ئافرەتەوە، ئۆباڵی هەرە گەورە دەچێتە گەردەنی پیاو.

کە بمانەوێ چاری بەدایەتی بکەین دەبێ خەریکی نەخۆشخانەیەکی نیوە شێت و نیوە تاوانبار بین کە پیاو تیایدا کاربەدەستە. بەڵام دەبێ ئاگاداری هەق و حسێبەک بین دیمانەکەمان لێ نەکاتە مەتەڵ و سیحر.

پیاو کە بەپێی واقیعی حاڵی دەسەڵاتدارە لەچاو ئافرەت، پشکی گەورەتری کاری پەسەندی بەئەرک و زەحمەت و کۆمەڵ حەوێنەوە، بەناچاری و حوکمی زەرورەت، دەچێتەوە حیسابی پیاو، بەمەشدا بەشێکی بەپۆزی کاری ناپەسەندی دەسرێتەوە. لەمەش زیاتر، بەدایەتییەکی کە لە ئاکامی نالەباریی کۆمەڵگەی ئادەمی، بەتێکڕایی، دەزێتەوە لە حیسابی هەمووان بە ژن و پیاوەوە دەسرێتەوە، دەمێنێتەوە ئەو کارە بەدەی تاک دەیکات لەسەر تاکەکە حیساب دەکرێت...

ئاڵۆز بڵۆزیی چەندوچۆنیی تێک هەڵکێشان و تێک ئاڵقانی سەروبەری تێکڕای کۆمەڵگەیەک وەها فرزە دەبڕێ لە خوایشتی تاک و کۆمەڵ بە کەس ناکرێ پشکی هەر یەکێک لەو ئاڵۆز بڵۆزییە دیاری بکات... حەربە و دەقەومێ، کەس ناتوانی بەبێ عیلمێکی پێی دەڵێن عیلمی خودایی یان عیلمی موطڵەق، بەرپرسایەتیی میللەت و حکومەتی لایەنە شەڕکەرەکان لە هەڵگیرساندنی شەڕ دەستنیشان بکات. خولاسە کنە کردن لە کاری بە گرێوگاڵ و چەندین لایەن و فرەگۆشەی وەک پشکی پیاو و ژن لە بەرەوپێش چوون و هاتنە دواوەی کۆمەڵ نە لە ئیمکاندایە نە سوودیشی هەیە، ئەوجا کەسیش ناسەلمێنی کە سەلمێندراش خەڵکەکە هەر ئەوە دەکات کە کردووەتی هەتا باری ژیان و بەڕێوەچوون دەگۆڕێت.

لەم هەڵوەستەی بەرانبەر پرسیارەکە ئەوەندە بەلزوم دەزانم کە پێویستە بەیەک چاو سەیری ژن و پیاو بکرێت هیچ لایەکیان نەشێ لە لایەنەکەی دیکە دابشکێنێ، ئەمەش شتێک نییە بە زیاد بگیرێ لە مافی تەبیعی مرۆڤایەتی کە لە حیسابێکی زێدە سادەوە دەبینین تاکی پیاو دەورەدراوە، لە نزیکەوە بە دایک و باوک و برا و خوشک و خێزان (ژن). تاکی ژنیش کە دەورە دراوە بە دایک و باوک و برا و خوشک و خێزان و مێرد، دواتریش کە شویان بەیەکتر کرد ئەندامی «وەچە» بۆیان زیاد دەبێت. کە حاڵ ئەمە بێت لە چ ئاسمانێکی ڕوونەوە ئیلهام بۆ پیاو بێت پایەی ئافرەت دالەنگێنێ. ڕاستییەکەی شەڕی نێوان نێر و مێ لە جغری کۆمەڵ و خێزاندا بابەتێکە لە

گەپی منداڵان دەکات. تۆ کە لەگەڵ ژن و دایک و کیژ و خوشکت ملانێی پاتاڵ و کەلوپەل بکەیت چۆناوچۆنی دڵت دەچێتە سەر خۆبەختکردن لە پێناو گەشە و شادیی ئەو نێر و مێیانەی میللەتت کە بەشی هەرەزۆری هەر نابینێت و ناناسێت، نازانێت دانیشتوی کام کاولگەن؟ ئایا تۆ نیشتمانپەروەریت بەو مانایەی کە بریتی بێ لە «تجرید» و ڕەنگەکانی پەلکەزێڕینەی لە خەیاڵەوە بۆ دەخوازیتەوە، نەتەوەش جۆرە تەجریدێک بێ، پێوەندی نەبێ بە مام بارامی یەخەچڵکن و کاک بارامی داوای مانگانەی خانووت لێ دەکات. پەحا میللەتی «مجرد» چەند ئاسمانییە هەتا دەبێتە تاک تاکی هەناسەهەڵێنی مەیلەو چڵکن و خاوەن ئارەزۆ و نارەزامەند و زمانهەراش! خەباتگێڕی تریفەپەرستی دوور لە واقیعی ڕەق و تەق پڕ بەدڵ خزمەتکاری ئەو گەلەیە وەک مەڕ، لەجیاتی بارەبارِ، سروودی «ئەی ڕەقیب» بچڕێ...

قسە زۆرن لە ڕوون کردنەوەی بەرپرسایەتیی لایەنەکانی شەڕهەڵگیرسێن. هەڵوەستی بەرەی سەر بە سێر چەرچڵ و بەرەی حوکمەتی بەریتانیا سەیر بکەین، چەرچڵ لە زووێکەوە داواکار بوو دەرفەت بە هێتلەر نەدرێ دەست درێژی بکات... حوکمەتی بەریتانیا هەم لەبەر نائامادەیی خۆی و، بەتایبەتی فرەنسا کە لەناوەوە گەندەڵ بووبوو تا ئەوەی نەیانتوانی بەرهەڵستی بکەن لە فرانکۆ، هەم لە خۆشئومێدییەک بەوەستاندنی هیتلەر بەر لە چونە ناو جغری شەڕ، شلەپەیتەیان دەدا بەسیاسەتی نەرمی و توندی... ڕووسیاش مەتەڵێک بوو سەردەری لێ نەدەکرا، هەتا خۆی ساغ کردەوە بە ڕێکەوتن لەگەڵ هیتلەر لەسەر دابەشکردنی پۆڵۆنیا و بەخشینی دەوڵەتە بچووکەکانی باڵتێک بە ڕووسیا. وەک دەبینی حاڵەتی وەها دەڵەمەیی بەزەحمەت ڕێ دەدا، یان هەر ڕێ نادا، لایەنی خەتابار لە بێخەتا جودا بکەیتەوە لە بەریتانیا و فرەنسای سییەکان...

مەبەس لە هەڵەی ستالین ڕێککەوتنەکەیەتی لەگەڵ هیتلەر لەسەر دابەش کردنی پۆڵۆنیا لە نێوان ڕوسیا و ئەڵمانیادا و ڕوودانی شەڕی دووەمی جیهانی

له ئاکامی هێرشەکەی ئەڵمانیا بۆ سەر پۆڵۆنیا. ستالین لەو ڕێکەوتنە و نیازێکی هێنایە سەر دۆستایەتیی ئەڵمانیا دوو هەڵەی لە لێکدانەوەی کرد، یەکیان گەیاندییە ڕۆخی مەرگ. دووەمیان لە مەرگی ڕزگار کرد.

هەڵەی یەکەم ئەوەبوو، وای دەزانی کە ئەڵمانیا پاش ئەمین بوون لە ڕووسیا و دووچاربوونی بە تێکئالآن لەگەڵ فرەنسا و بەریتانیا، هەم خۆی کەنفت دەکا و هەم فرەنسا و بەریتانیاش... ئیتر دەمێنێتەوە ڕووسیا بەتاکە هێزی سەر شانۆی ئەوروپا... کەچی حیسابەکەی بەتەواوی هەڵە بوو. وابوو فرەنسا ڕما، ئینگلیزیش بەحاڵ سەربازەکانی، بێ چەک و بە زەرەریکی دەریایی زۆرەوە، گواستەوە بۆ وڵاتی خۆی. ساڵێکی بەسەردا تێنەپەڕی لێشاوەکەی سوپای ئەڵمانیای پڕ چەک و عەزمی تێکشکاندنی کۆمیۆنیزم بای دایەوە سەر ڕووسیا... ئەمە لایەنی کوشندەیی هەڵەکەی بوو.

لایەنی دووەمی هەڵەکەی کە بەڕاستی لەتێکچونی پاراست ئەوەبوو، بەپێچەوانەی لێکدانەوەکەی، بریتانیا لە حاڵی هەرە تەنگەتاوی و بێهێزیدا سوور بوو لەسەر بەربەرەکانی دژی هیتلەر. خۆ ئەگەر ستالین نیشانی پێکابایە لەو حیساباتەی کردبووی، دەبوو بریتانیا لەگەڵ ئەڵمانیادا ڕێک بکەوێت، هەر نەبێ بۆ پاراستنی ماڵی خۆی کە ئومێدی لەدەستدا نەبوو تەمای بەزاندنی ئەڵمانیا و هەموو ئەوروپای هەبێت، جگە لە لایەنی تۆڵەسەندنەوەی «هەلپەرستی»ی ستالین کە دەستی ئەڵمانیای کردەوە بۆ بەرەنگاربوونی غەرب... بەشی دووەمی هەڵە کوشندەکەی ستالین ئەمەبوو کە سەهووی کردبوو لە نیازی غەرب بۆ ڕێککەوتن لەگەڵ ئەڵمانیادا دژی ئینتەرناشناڵ.

زۆر بەسەیری، دوای ئاشکرابوونی هەموو پەناو پەسێوی حاڵوباری شەڕی دووەم و سەروبەرێکی هەڵوەستی دەوڵەتەکان و ڕێکەوتنی ڕووسیا لەگەڵ ئەڵمانیا و دابەشکردنی پۆڵۆنیا[9] و ڕێکنەکەوتنی غەرب لەگەڵیدا ئەمجا شیوعیەت هەر سوور بوو لەسەر هێندێ کە ئیستیعمارییەکان بەتەما بوون لەگەڵ ئەڵمانیادا ڕێک بکەون بۆ تێبردنی ڕووسیا، لە حاڵێکدا ڕێک کەوتن

لەگەڵ ڕووسیا بۆ فۆتانی نازیزم و فۆتاندیشیان، لەئاکامی شەڕیشدا بریتانیا و فرەنسا بەشی هەرەهەرە زۆری دنیایەکی لەبەردەستیاندا بوو لە کیسیان چوو، ڕووسیاش نیوەی ئەورووپای خستە سەر موستەعمەرەکانی زەمانی قەیسەر... گۆیا بەنیازی خزمەتی ئەو نیوەی ئەورووپایە... کتێبم خوێندۆتەوە، ئەگەر سەهووم نەکردبی، لەوەدا گوتار بووبێ لەژێر سەر ناوی «المؤامرة الکبری علی روسیا». لەڕاستیدا ستالین بێ ئەوەی بەخۆی بزانێت گەورەترین پلانی گێڕا دژی خۆی و وڵاتەکەی بەڵام خۆ و تالع نیشانەی نەپێکابوو...

- زۆرینەی گەڕیدە و ئەو ڕۆژهەڵاتناسانەی ڕێیان کەوتۆتە وڵاتی ئێمە، یان شارەزای باری کۆمەڵایەتی ئێمەن، پایەی ژن لەناو کورددا بەرزتر لەهی دراوسێکانمان دەنرخێنین، تا کوێندەرێ ژنی کورد ئەم سیفەتەی بەڕاست لێ دەگەڕێ، ئایا ئامانج و ناونیشانی ناوبراو بە «ماف و ئازادیی ژن»ی بەدەست هێناوە؟

خۆزی ئەو مێرخاسانەی بێگانە چێشتێکی ئەو تۆیان بۆ پیاوی کوردیش درکاندبایە چونکە بڵێین و نەڵێین پیاو، ئەوسا و ئێستاش، لەناو کورد، و غەیری کوردیش، باڵادەستەکەی کارگوزاری بووە و هەیە، وا لەم دەمەدا پیاوی کورد بەڵایەک بەسەر خۆی و کورد و کوردستان دەهێنی چ لزوومی نەهێشتۆتەوە دوژمن پێوەی ماندوو بێ. زۆربەی هەرە زۆری ئەو ئافرەتانەی سەر بەو مێردانەن کە «بەلای کەمەوە» خەریکی خەساندن و نەزۆکاندنی «کوردایەتی»ن بەشداری ئەو گاڵتەبازاڕییەی ئابڕووتکێنن، تا ئەم دەمە «ئافرەت» لە کوردستاندا کەسایەتیی خۆی بە کاریگەرێکی سەربەخۆی بەرژەوەندی نەتەوەیی سەقامگیر نەکردووە، هەر درێژەی سێبەری کەڵەمرۆکە بووە کە بارتاقەی کێلەقەبر سێبەردارە.

ڕاستییەکەی مەسەلەی پێداهەڵگوتنی ئافرەتی کورد لەلایەن بێگانە و هەندێ کوردی تامەزرۆی هەڵدانەوەی بێ مزە و بێ ئاکامی نەتەوایەتین، بێ کەم و

زیاد و بە جۆرێکی گشتی، ڕەنگدانەوەی بێدەسەڵاتییە، لەو ڕووە کە قەلەندەر پێی نەکرا بەد بێ هەر دەمێنێتەوە «نابەد» بێ و نابەدبوونیش لە چۆڵگەی کوردستان بە ناچاری، وەیا لەگەڵ نەختێک سەرکێڵی، بەپەسەند حیساب دەکرێ.

تۆ لە ئافرەتی کورد وازبێنە کە بێدەسەڵاتە لەچاو مێردەکەی و گوێ بگرە لەناو عەرەب، بەزۆری هەرە زۆر لە موقارەنەدا چاکەی خزمەتگوزاریی کورد دەڵێنەوە، ئەم مێرخاسییەی کوردی نێوان بێگانە هی پەروەردەی سۆربۆن و ئۆکسفۆرد نییە، بەڵکوو هی میراتە هەرە مەلعونەکەی بێدەسەڵاتییە کە ترسی ناوزڕان و سزادان دەیکاتە شەهادەی«حسن سلوک». دەزانم و دیتومە، لەهەندێ ساڵی ئاشتیی نێوان کورد و حوکمەتی بەغدا هەزاران عەرەبی بەغدا و بەسرە دەڕژانە شار و ئاوەدانییەکانی کورد و بێ مزە و بێ مەمنوونیەت لەلایەن خەڵکەوە، نەک لەلایەن خاوەن ئوتێل، دادەکران. ماڵم حەقە عەرەبەکەش لێی بەزیاد بێ دوای کەیف و سەفای خۆی باسێکی ئەو میواننەوازییەی بە چاکە دەگێڕایەوە، بەڵام قەت و قەت دانیشتویەکی بەغدا و بەسرەی عەرەب کوردێکی ئاوارەیان دانەکردووە «چاکەی هەندێ ئێلی دەوروبەری ڕومادی و ئەو هەرێمە دەگێڕنەوە لە ئاست کوردی دوورخرایەوەی کەرکووک و بەرەژێرتر کە عەرەبی لە جێگەدا دەکرا بە خاوەنی تازەی خاکەکەی کورد». لە نوختەی «خۆ بە باڵادەست زانینەوە» عەرەبی تێر و تەسەلی بەغدا و بەسرە بەخەیاڵیدا نایەت لە موقابیلدا کەرتە نانێکی ڕزیو بەو کوردە بدات کە لە ماڵەکەی تێر بووە و حەساوەتەوە. تۆ سەیری شارنشینێکی کورد بکە کە تەشریف دەبات بۆ گوندێکی وێرانگەی کوردەواری چەند بەڕاشکاوی و بە مجێزەوە لوتف دەفەرموێ بەربەسێڵی وەرزێرێکی کورد نۆشی گیانی بکات و دیشلەمەی شەکری قەندی لێ بفەرمووێ، تا ئەگەر وەرزێرەکەی دیتەوە لە شارەناموبارەکەکەی خۆی «ماندوو نەبیت»ێکی لێ دەکا بە نەجمەی سەرشانی «مولازم ئەووەل». ئا ئەم وێنەیەش هەر هی ژێر دەستییە لەدەست باڵادەستی. کورد لە ئاست

عەرەب و فارس و تورکدا، ئافرەتی کورد لە ئاست پیاوی کورددا، هەمووی بێ لێکدانەوە و بە حوکمی بەدیهیەت خوارو ژوور دەوەستن، وەک کە عەرەبێکی بەر لە تەموزیی 1958ی عێراق بە خەیاڵیدا نەدەهات هاوشانی سەفیری ئینگلیز وەیا کارگێری شەریکەی نەوتی کەرکووک بێت. پەندی کوردییە دەڵێ «تفی سەرەوژوور بەر ڕیشی خاوەنەکەی دەکەوێ». لە چەند مانگێکی ساڵی 1959 کە چەپڕۆیی خۆی دیتەوە لە عێراقی کەریم قاسمدا «ئەوە ئەزم لە بانان دەبەزم» پەندەکەی کوردی بەرەواژ بۆوە «تفی بەرەوژێری ماقووڵێک بە ڕیشی خۆی دەکەوتەوە». کار گەیشتە بارێک «دینی محمد بطالوخ» بوو بە slogan ی دیانی بێدەسەڵاتی دەوروپشتی مووسڵ، بە زۆریش لەسەریان کەوت.

دەبێ بزانین ئاکار و ڕەفتار و گوفتار و کرداری هەر نەتەوەیەک بێت (تا ئەم دەمە کە لە ڕێی ئاگاداریی شەخسیەوە بێ یا لە ڕێنموونیی مامۆستایانی مێژوو و سیاسەت و نەفس و کۆمەڵایەتیی بەرفرەوانەوە بێ) بەندە بەو کاریگەرانەی سەر بە سروشت و کۆمەڵایەتی (و تێکەڵیی خوێنی ڕەگەزی لێکتر جودا) ن کە هەم هەلومەرجی گوزەرانی ماددی و مەعنەوی پێک دەهێنن و هەم بە شێوەیەکی مەیلەو تێکڕایی پەراوێزێک ڕەنگڕێژ دەکەن بە دەوری مەفهومی «عەیبە» و «شەرم و شکۆ»وە. لە کتێبی Daughtters of Allah ی خاتونەکەی، وابزانم دانیمارکی، کە ناوەکەشیم لە بیر نەماوە، بە شێوەیەکی دڵسۆزانە بۆ ئافرەتی کورد دەدوێت. بێگومان ئەو نموونانەی باسیان دەکات ئەو فرشتەئاکارەن کە لە کتێبەکەدا هاتووە. هێندەش ورد پێو بووە، بۆ دیار خستنی ئەرکێکی بەسەر ئافرەتی کوردەوەیە هاتووە بە هەنگاو مەودای نێوان خانووی ئافرەتێکی، وەک لە بیرمە، میرزا ڕۆستەمی و زێی تەق تەق، بە پێی ناوی زێیەکە، بەسەر کردۆتەوە، بە چوون و هاتنەوە 600 هەنگاو بووە. هەر جارە پێویستیی داوای یەک گۆزە ئاوی کردبێ ئافرەتەکە ناچار بووە بارەها 600 هەنگاوەکە هەڵێنێ، لەوەشدا خەفەت دەخوات بۆ ڕەنجدانی ئافرەتی کورد کە، خۆی گوتەنی، پشووی حەسانەوەی دەست ناکەوێت. ئەگەر بە

وردی سەیری حاڵی ئافرەتی کورد بکەین (لێکدانەوەکە بدەین بەو حاڵوبارەی مێژوویی کە ئافرەتی کورد تێیدا ژیانێکی ئاسایی ڕابواردووە نەک لە باری ئێستاکەدا کە کوردستانی گەورە، تا ڕادەیەک، سەرلەبەری وەک مەنجەڵی سەر ئاگر دەکوڵێ) دەبێ بەر لە هەموو شتێک لایەنی مافی دەربڕینی بیروباوەڕی سیاسی و کۆمەڵایەتیی ئافرەتی کورد لە دەفتەرمان بسڕینەوە چونکە، وەک نەتەوە، کوردەکە سەرلەبەری چ جۆرە مافێکی ئەو تۆیی لێ نەسەلمێنراوە، بۆ خۆشی لە ڕێی کردەوە و ڕاگەیاندنەوە لە هەوەسبازییەکی شێتانەی خۆکوژانەی کوێرانەدایە فڕی بەسەر ماف و نامافەوە نییە (کە ئەمیش دەچێتەوە بۆ حوکمی مێژووی 2500 ساڵیی بەرەڵڵایی و بێحیسابی و بێسنووری و بێکیانی کە هەرگیز کوردی تێدا ڕانەهات بە هەستی «خاوەنایەتی»ی زێد و ئەو سامانەی تێیدایە). درێژەی ناوێ، تەنها لە ڕووی ڕەفتارەوە چاوێک بە ئافرەتی کورددا دەخشێنین، بە کورتی، ئافرەتی ناو شاخ و لێڕ و کانی و دارودرەخت، بێ مامۆستا و بێ وزەی قارەمانەتی، هەر بە پێی داخوازی جوگرافیا بەرەڵڵاتر بووە لە ئافرەتی شار و لە هی دەشتودەری سەر بە فەلاحەت... بەبیراندا دێت کیژگەل یان ژنگەلی عەشرەتی ئەوتۆیی گەپە بێپەردەکەی مەشووری «دەست ناکەیتەوە»یان لەگەڵ تاکە پیاو «بە زۆریش هی نەناس» دەکرد کە مەیلەو ڕووتیان دەکردەوە و فرزەیان دەبڕی و کیژێکی جوانیشیان لە کەمەر بەرەژێرەوە ڕووت دەکردەوە و لێیان نێزیک دەکردنەوە و بە دڕکە کەنگر لە جێی مەعیەنی پیاوەکەیەن ڕادەکێشاو «سوورە خەتایان نەکەی»یان لێی دەکردە هەڕەشە... خواش دەزانێ بەر لە هەزار ساڵ ئەم عادەتە چ جۆرە شکڵێکی هەبووە وەک ئەوەی کە نەتەوەی «ئینکا»ی ئەمەریکای باشوور لە کژێکی ساڵدا عادەتیان هەبوو، کۆمەڵەی کچان بە ماوەیەک دوور لە کوڕان ڕایان کردووە و کورانیش ڕاویان ناون و هەر کچێکی کەوتبێتە دەست کوڕێک یەکسەر لێی حەڵاڵ بووە... لەنێوان عەشایەری کورد، تا ئێستاش عەشیرەت هەیە بە ڕەهایی لایەنی زایەندیان مەشوورترن لە عەشیرەتی هاوسێیان... لە کۆمەڵگەی شارستانی کورد هەر

بەپێی فەرمانی دەوروبەر و دارایی و هەژاری (جگە لە کاریگەری ئایین و داب و دەستوور) خێزانێکی نیمچە پارەدار پتر توانای خۆداپۆشین و ئابڕوو پارێزیی هەیە لە هی ڕەنجدەر کە بەزۆری ژنەکەشی ناچاری نان پەیداکردنە... ڕەنگە منداڵەکانیان خوێندنیان بەزەحمەت بێ، خۆ ئەوەی ڕاست بی، کە من چومە قوتابخانەی سەرەتایی، ساڵی 1926، تێکڕای قوتابیان نەدەگەیشیە 200، بەشێکیشیان بە دڵدانەوە و سفارکشی باوکم مەکتەبیان تەواو کرد، لینین لە نووسینێکی ئاگرینی پڕ لە دڵگەرمی وا ڕادەگەیەنێ، بورجوازی بێ پەردەن هەموویان خۆیان بە ژنی یەکتر دەحەسێننەوە. هەرچی پۆلیتاریایە نامووسپارێزە بە خێزانی خۆی دابین دەبێ... هەڵبەت ئەمە قسەیەکی تاوگیرانەیە. بەڵێ، بێگومان دەوڵەمەندێکی پەتروگرات و موسکۆ قیاسی لەگەڵ هەولێر و کرماشانی 1916 ناکرێ لە ڕووی نامووسپارێزییەوە، بەڵام پارەداریش ئەو بێناموسە نییە پەنجا پشتی خانەدانەکەی زۆڵ بێ و هەموو کرێکاریکیش نموونەی پاکدامەنی بێت... بە چاو دەدیترا زۆربەی ئافرەتانی عموومخانەی بەغدا لە ئافرەتی بێنان و بێپەنا و گومناو بوون... سەماکەرانی تیاترۆخانەش هەروەها... خانووی گوماناویش ئافرەتی گومناوی دەچونێ... ژنە دەوڵەمەند ناچار نییە خۆی ناوزڕ بکات... هەر نەیسە!

لەم درێژە پێدانە دەمەوێ، مەدحێکی کە بێگانە ئافرەتی کوردی پێ هەڵداوەتەوە و جێی خۆیەتی، نەبێتە کاری جنۆکە و مەتەڵی ساحیر و بەرگێک بێ بە بەژن و باڵای کورد هەڵبڕابێتەوە، خۆزیا ئەوەندەمان بە بەرەوە دەبوو لە دەسەڵات و چاو قایمی بارتەقای نەتەوەیی تر مەیلەو بێحەیا باین یاخود بوێرین بێحەیا بین. شاعیری فارس دەڵێ:

تواضع زگردن فرازان نکوست
گدا گر تواضع کند خوی اوست

نووسینی لێرە بە پێشەوەم هەیە دەڵێ، کورد لە واقیعی بێدەسەڵاتیدا هەر دیوبەتی پیادە و سواری داگیرکەر و هێرش بەری بێگانە خۆی و وڵاتەکەی شێواندووە. چەند خۆش بوو لە جیاتی دیتنی سۆجەر و لیڤیی ئینگلیز لەسەر خاکی کورد نازوفیزی سوارچاکی لێدەن، دیبامان سوارەی کورد بە دیار زێی Thamesی لەندەنەوە نازوفیزی بایببوونیان لێدابایە. چ قەیدی دەکا نەختێک بێعاری لەوانەوە بۆ ئێمە و نەختێک شەرمەزاری لە ئێمەوە بۆ ئەوان ئاڵوگۆڕی پێ بکردایە، خۆ هەمووماں بە پێی ئایینە ئاسمانییەکان وەچەی باوک و دایکێکین!

- خەریکبوونتان بە فەلسەفەوە تا کوێ بووە؟ کام فەیلەسووف کاری تێکردوون و لاتان پەسەندە، فەلسەفەی هاوچەرخ لە کوێیە دەبینین؟

وەی براکەم کە لێم بەسەهو چوویت!

لە پرسیارەکەڕا وا پێ دەچێ، بە لاتەوە من هەمیشە چاوێکم بڕیوەتە کتێبێکی نوێ بابەت تا دەرسێکی نویی تێدا موتاڵا بکەم!! هەتا کتێبێکی عادەتیم پێ دەگات... هەتا نوسخەی جەریدەیەکم پێ دەگات کە نووسینی خۆمی تێدایە ڕۆژەها، هەندێ جار، ڕۆژگارەها بەسەر دەچێت... من نوسخەی 90%ی گوتارەکانی خۆمم لانین، ڕەنگە 95%یش دەرچێت... من بەشی زۆری ئەوەی پێی دەڵێن کتێب لە کتێبەکانم، بەهەر سێ جوزئی حاجی قادرەوە، لە ماڵەکەمدا نییە... من لە تروسکەی چاوێکدا، ڕاڕەو، خوێندمەوە، مامۆستا ئەمیر حەسەنپوور دەڵێ، وا پێ دەچێ فڵان باوەڕی بە خەباتی چینایەتی نییە، دەسا بە کوردستان سوێند دەخۆم لەو و لە مامۆستا ئەنجلیزیش باشتر دەزانم خەباتی چینایەتی و نەتەوایەتی و دنیایەتی و دەروێشایەتی و بێخوایەتی چین. بەڵام چ بکەم لەگەڵ بێدەرفەتی و بێدەستی و بێیاریدەدەر... تا پەڕە کاغەزێکم دەگاتە ئەورووپا سەد فاتیحە و ئایەتەلکورسی بە دەوریدا دەخوێندرێ، ئەوجا گەلێک جار بە ڕێگەوە نابود دەبێ... ئەم حیکایەتانە

پێوەندی زیندەڵ «عضوي»یان بە پرسیارەکەتەوە نییە، بەڵام ڕوونکردنەوەی دەوروبەری خۆمن تا بە نەفام و نەزان و قسە مفت دەرنەچم... من لە وەڵامدا دەبێ پێت بڵێم، زۆربەی ئەو فەلسەفانەم سەیر کردووە کە پێیان دەڵێن «مثالي»، بەڵام لەگەڵ هیچ تاکێکی نەگونجاوم. مەتڵەبیشم نەبوو بگونجێم یا نەگونجێم، واقیع ئەوە بوو، وەکوو داستانێکی ئەفسانەیی، کە بە مێژووی دانانێم ئەو فەلسەفانەشم بە دوور زانی لە پێکانی مەبەست بە تایبەتی لە ڕوانگەی ئازادی و بەختیاریی ئادەمیزادەوە... ئێستا ئەگەر لێم بپرسیت، سپینۆزا و کانت چ دەڵێن؟ دەبێ دەرفەتم بدەیت کتێبیان، لە نوێ، بخوێنمەوە و جوابت بدەمەوە وەک کە لێم دەپرسیت، بەهاریەکەی حاجی قادر و سکاڵاکەی نالی لەگەڵ بادی خۆشمرووددا چەند و چۆنن؟

ئەشەدو بیللا دەیەکەکی هیچ کامیان بەبیرمدا نایەت!! من لە شیعری کوردی و عەرەبی و فارسی تاکە یەک قەسیدەی سەرلەبەرم دەرخ نەکردووە، تاقەتیشم نییە دەرخیان بکەم! من چەند جارێ پێویستم بە مەوریدی ئایەتێکی قورئان دەبێ، بە تەلەفۆن لە کاک محەمەدی مەلاکەریم دەپرسم مەوریدەکەم لە دەلیلی قورئانی لای خۆی بۆ بدۆزێتەوە! من ناتوانم هەڵە لە نووسین بکەم چونکە پێم ناکرێ دووبارەنووسی بکەمەوە، کە هەڵەیەکی ڕێنووسیم کرد بەدەمی مووس دەیکرێنم... وا بووە خێرەومەندێک فۆتۆکۆپیی نووسینمی کردووە تا ئەگەر ئەوەی بەرێ کراوە فۆتا، ئاسەواری نەبرێتەوە... تەنانەت ئەم کاغەزەی وا لێی دەنووسم ئیشکالێکی ئێسکقورسم بۆ دروست دەکات لە دوو سەرەوە، یەکیان ئەوەیە کە لێیان نووسرا و ڕۆنران لە خۆوە لوول دەخۆن ئیتر دەبێ خەریک بم سەنگێک بخەمە سەر لای دامەنی کاغەزەکە کە هەتا تەخت بێ بۆ نووسین، لای چەپیشی بە دەستی چەپەم تەخت دەکەم. دووەمیان ئەوەیە تەنیشتی چەپی کاغەزەکە، زۆر شوێنی قەڵەمی وشکنووس بۆی دەست نادات ئیتر یا دەبێ دەجار و پازدەجار بەو وشانەدا بێمەوە کە چەسپ نەبوون و هەر جارەی باری قەڵەم بگۆڕم بەڵکوو ئەو چەوراییە دەسمێ کە مانیعی گەیشتنی مەرەکەبەکەیە بە کاغەزەکە، یان

بە قەڵەمی خۆنووس ئەو شوێنانە چار بکەم. کاغەز هەیە تەنکە و بۆ نووسین لەبارە بەڵام کە هەڵە دەکرێتم کاغەزەکە کون دەبێت… ڕاستیەکەی ئەو جۆرە کاغەزەشم لە نووسینی پێشترم کۆتایی هات… سەرت نەیەشێنم، کە یەشاندوشمە، من ئەو حەسایەوە نیم پاڵی لێ دابێتەوە، کە لێیان پرسی: شافعی چ دەڵێ لە سەلەم و ڕبێدە، دەرحاڵ سکرتێرەکانی سەرچاوەی پێویستی بگەیەننە بەردەستان و بەنازەوە چاوێکیان پێدا بگێڕێ و شەکرێکی گوفتار و بیروڕای تێدا بشکێنێ. براله، شەڕی من لەگەڵ بەرەیێکی ئەم جیهانە دواکەوتووەی خۆمانە، بەتایبەتی بەشی کوردەکەی، کەوا دەزانێ سۆشیالیزم و کۆمیۆنیزم وەک مەزهەبی شیعە و سووننە و قادری و نەقشی وەیا ناوی دەفتەری نفوسە بە ئارەزۆ بیکاتە بنێشتۆکەی زاران و بڵێ، من شیوعیم نەخێر ئیشتراکیم، وا باشە ئەنارکیست بم، لە حاڵێکدا ئەو بەختڕەشە جارێ بە پێوانەی سەردەم ئابووری و مواصلات و ژێرخان و ژوورخان و کۆڵیتێکی ڕێکوپێکی مریشکانی نییە… خۆی لەدەست خۆیدا نییە… بە گوشاری ڕووداوان نەک بە دڵخوازی خۆی دەگەڕێ یان دەخەوێ… هەر هیچ نییە، تا ئێستا سیاسەتێکی جیهانی لەو هەرێمەی کوردستانی عێراقدا مەودایەکی ڕەخساندووە بۆ کوردەکە بتوانێ یەکتر بکوژێت و سامانە ڕەجاڵەکەی کە پاش ماوەی میراتی بەعسە لە بنەڕەگەوە هەڵکەنێت و بە قاچاغ تەڕدەماغییەکی بەنگێشکانەی پێ بکات. تا ڕادەیەکی، بە نیسبەت لەچاو شوێنانی تری کورد، بزووتنەوەی کوردی کوردستانی سەروو دڵخۆشکەرەوەیە، دڵخۆشکەرەیە (لەگەڵ هەندێ تێبینیی نەرێتی… ) خۆ و بەخت (کە جارەجارە بە هەڵە چاو هەڵدێنێ) لای ڕۆژهەڵاتی ئەو کوردستانە، سنوورە لەگەڵ دەوڵەتێکی دۆست و جغری قەفەسەکەی دەوری کورد لەو ڕووکارەوە گوشادە (مەبەست ئەرمینیایە).

وەک دەبینیت پرسیارەکەت لەبارەی فەلسەفە و کام فەیلەسوف کاری تێکردووم و فەلسەفەی هاوچەرخ لە کوێدا دەبینم، هەتا بڵێی ئەریستۆکراتانەیە و ئەگەر دەرفەتم هەبایە و لەدەستم دابایە ساڵێک، بە

خورجی پڕەوە، بەرەنگاری ببم لەوانەبووم ڕەزامەندیت بەدەست بهێنم، لەگەڵ ئەم دەست بەتاڵییەشم، بابی ئەوەی تووتنەوانێک لەژێر کەپری ڕایەڵی شاش و بێش و بە حەوجۆشی ڕەش و قۆریەی تەنەکە، چایە و نانە ڕەقێک و ماستێکی ترشت بۆ بکا بە پڵاولۆغانی نەداری و هەژاری، منیش قۆڵ و باسکی شەکەتی لێ هەڵدەماڵم و بەش بەحاڵی هەڵکەوتی ڕەجاڵ و شەرمەزار خەریکی چەند گوڵە گەنمێکی دروێنەی خوداپێداوانت بۆ دەکەم بە پڵاوی قەرەخەرمانی بێ ڕۆن و گۆشت:

شاهی کە نەبێ ڕادەبوێرین بە گەدایی
بۆ ئەهلی قەناعەت لە پڵاو خۆشترە داندۆک

براکەم، کام فەیلەسوف کاری تێکردووم؟ بێ خۆهەڵکێشان لەلایەن بیروباوەڕێکی بەرانبەر تێکڕای بوونەوەر، جیهان، بە زەمان و مەکان و حەیوانییەوە، بۆ من... با بڵێین... گەڵاڵە بووبێ و لە فراژیتربوونیشدایە، نوسخەی بیروباوەڕی هیچ تاکە ئینسانێک لە مندا موتوربە نەبووە، بە چاوی هیچ کەسێک سەیری جیهانم نەکردووە. بێگومان، من وەکوو منداڵێکی عادەتیی کورد لەلایەن هۆشکرانەوەوە نەبووم کە لە بەتاڵایی فکریدا دەژیا چونکە من لە سێبەری باوکێکدا ژیاوم و فراژی بووم، تا تەمەنی 24 ساڵەیی، کەوا بێگومان بەمەیدان لە دەوروبەری خۆی پێشکەوتبۆوە. لەلایەن باوەڕهێنان بە حەق و بە زانستەوە، ڕەنگە چ مەلایەکی نەگەیشتبێتێ. کە دەڵێم «حەق» مەبەستم ئەوەیە شتێکی خۆی بە حەقی زانیبێ، ڕەنگە مەلایەکی دیکە جۆرێکی تری سەیری حەق کردبێ، بەڵام، بێگومان لەلایەن جورئەتی دەربڕینی حەقەوە کەس لەوی تێنەپەڕاندووە، ئەگەر نەڵێم نەیگەیشتۆتێ. ئەگەر سەهووم نەکردبێ «ابن الجوزي» سەرامەدێکی ئیسلام بووە لەم مەیدانەدا، ئەویش بە پێی سەردەمی خۆی.

لەوانەی من ڕام لە بیروڕایان بووە، یەکیان بیرناردشۆ، ئەوی دیکەیان جان پۆڵ سارتەر بووە، بەڵام ئەم ڕالێبونە نابێتە «پەسەندکردنی فەلسەفە»، سارتەریش بە داخەوە لە شۆڕشی سەقافیی چین، وەک خوێندمەوە، ڕۆژنامەی پارتی کۆمیونیستی چینی دەفرۆشت، کە دەبێ بزانین ئەو شۆڕشە حەیاچوونی سەرلەبەری مێژووی ئەو پارتییە بوو. ئەو «ماو» و پارتی کۆمیونیستی چینی ناو کتێبەکەی - وەک لە بیرمە- ئەدگار سنۆوی ساڵی 1936 بە سەرناوی «ئەستێرەی سوور بەسەر چینەوە» لە کوێ و کۆسەبەبیەکەی ماوی شۆڕشی سەقافی لە کوێ.. لیۆشاویش کرا بە جاسووس... تەنها شو ئین لای مایەوە وەک مەردی دلێر و بێخەوش...

لە سەرەتای تەمەنێکمدا بۆ ماوەیەکی کورت مارکسیزم خەیاڵی بزواندم بەڵام زوو بە زوویی لێی ڕەها بووم تا ئەوەی لە پۆلی دووەمی حقووق، لە ئەزموونی دەرسی ئابووری پرسیارێک هات لە بارەی هۆی «ازمات اقتصادیة»وە، بە جۆرێک وەڵامم دایەوە پێوەندی نەبوو بە هیچ سەروبەرێکی «ازمات»ی ناو کتێبی مامۆستای ئابووری و گوتم هەرچی خەبیر و مامۆستایانی ئابووری دەیڵێن بایی فلسێکە لە تەک خورگەی تاڤگەی چالاکیی مرۆ و خواز و نەخوازیدا و پێشبینی کردن لە ئاکامی تێکهاویشتنی سەدەها ئیرادە و ئایین و لێکدانەوە و پەسەند کردن و دزاندنی شتان لەلایەن ملیۆنەها خەڵقی تەبیات جودا ورێنە دەردەچێت. هەر لە وێدا «حتمیة»ی مارکسیزمم ڕەت کردبۆوە... سەیر ئەوە بوو مامۆستاکەم لێی زەحمەت نەهات و نومرەی زێدە هەڵکشاوی دابوومێ.. تومەز کابرا خوا لێی خۆش بێ، میسری بوو. مامۆستا عێراقییەکان بەزۆری داخراو بوون.

لە نووسەرانی وڵاتی عەرەب کە بەلای فکردا چووبێتنەوە عباس العقاد لە پێشەوە دێت، لایەنی هێز و هونەری نووسینیشی پاڵپشتی فکرەکەی دەکرد تا ئەوەی لە کتێبی «ابلیس» کە بە تایبەت پێشەکییەکەی لە بورکان دەکات دەڵێ: ئەو ڕۆژەی مرۆ بۆ لەعنەت کردن لە بەدایەتی، ئەگەر لە هیچە ئیبلیسی خوڵقاندبێ، کارێکی پیرۆزی کردووە... ئەم گوتەیەی بۆ ماوەی 10-

15 ساڵ بە گەشی لەگەڵمدا ژیا تا ڕۆژێک لە ڕۆژان بێ لێکدانەوە، هەر وا لە خۆوە، زەینم بۆ ئەوە چوو کە ئیبلیس درۆ بێ، هەرچی ئایینی ئاسمانی هەیە دەڕمێت. ئەو هەموو نوێژ و ڕۆژوو و حەج و زەکات و وەسوەسەی بێنوێژی و خۆشی لە خۆ حەرام کردن هەمووی دەچێتە خەسارەتمەندی و ماڵکاولی... نە بەهەشت نە جەهەننەم، نە حۆری و نە فرشتە و نە هیچ غەیبێکی ڕێزدار لە بەیندا نامێنێ. ئیفلاسی لەمە گەورەتر هەر پەیدا نابێ و ئیفلاسەکەش دەگەڕێتەوە بۆ سێ هەزار ساڵێک کە تەوراتی مووسا بووە بنەمای ئایینی ئاسمانی...

پاش عقاد، د. محەمەد مەندوور بۆ ماوەیەکی کورت دوای وەرگرتنی شەهادە بەرزکەی لە ئەورووپا، وەک ئەستێرە گەشایەوە و مەرگ پێچایەوە...

ئەوەی گوتم (هەروا لە خۆوە..) زەینم بۆ ئەوە چوو..! دیاردەیەکە گەلێک جار بە خۆمەوەم دیتووە کە دەبینم لە هێکڕا گرێیەکی فکریم بۆ دەکرێتەوە بێ ئەوەی پێوەی خەریک بووبێتم، ئەم مەتەڵەم بۆ کرایەوە لە نووسنێکی فرۆید کە دەڵێ، هۆشی ون خەریک دەبێ ئەو گرێیانە بکاتەوە کە هۆشی ئاگا پێی ناکرێتەوە تا لە دەرفەتدا وەڵامی پرسیارە گرێ پچکەکە دێتە بەر هەستی ئاگا!

بە ڕێکەوت لە دەمی ئەم نووسینەدا کتێبی «هل للانسان مستقبل»ی برترەند ڕەسڵ، تەرجەمەی عەرەبییەکەی لەلایەن مەرحووم «عەلی حەیدەر سولێمان»ـەوە کە لە 29/10/1985 پێشکەشمی کردووە، لە نزیکمەوە بوو. ڕەسڵ یەکێکە لە زلەکانی ئەم سەردەمە. ساڵی 1970 مەرگ پێچاوەتیەوە. بە نموونە ئەم چەند دێڕە لە لاپەڕە 24ی کتێبەکەڕا دەگوێزمەوە بۆ بەرچاوی خۆت و خوێنەر:

> على ان شيئا واحدا يقف في القمة كل مكتسباته... هو اللغة. وعلى المرء ان يفترض ان لغة الكلام نشأت ببطء عن محض صرخات للحيوان...

بەلای منەوە. لێرە بە پێشەوەش نووسیومە و بڵاوم کردۆتەوە، کە ئاخاوتن تەرجەمانی هۆشە، نەک وەک ڕەسڵ دەڵێ، پاڵاوتەی چریکەی جانەوەرانە: گاڵ و بوغ و حیلە و نەڕە و پرمە و هەر دەنگێکی بێواتا هەیە هەمووی ڕاگەیێنی غەریزەن. ئاخاوتن بەرهەمی یەکسەر و سەراسەری هۆشە کە دەیەوێ تەعبیر لەو مەعنایانە بداتەوە وا بەو هۆشەدا تێدەپەڕێ، هەر چونکە زادەی هۆشیشە، ئاخاوتن، خاوەنی دەستوورە. بەڵێ، ڕەسڵ پێشتر دەڵێ: «على ان ميزته الوحيدة الاولى على الاخرين كانت في دماغه»، بەڵام ئەو ڕایەی من پێی ڕازی نیم لە نموونەکەدا ئەوەیە کە ڕەسڵ ئاخاوتن یەکسەر بە قیژەی جانەوەر دەداتەوە، کە گۆیا بە تەنبەڵی بۆتە قسە و ڕاوێژ. کە مرۆ تێگەیشت دوێنێ پێش ئەمرۆیە و ئەمڕۆش پێش سبینەیە بە جۆرێکی حەتمی «وشە» ی ڕاگەیەنی کات دەبێتە چەند وشە... دوێنێ و پێرێ... ئیمڕۆ و سبەینێ و دووەمینێ.. هەر بەو پێیە وشەی ڕاگەیەنی کردەوەی دوێنێ دەبێ لە هی ئەمڕۆ و سبەینێ جودا بێ.. کە یەک بوو بە کۆمەڵ، لە ئاخاوتندا، پێویستە بە جۆرێک لە جۆرەکانی لێکتر هەڵاوێردرین، ئیتر هەرچەشنێک دەبێ با ببێ. گۆیا لە سۆمەری وشەیان دووبارە کردۆتەوە لە بری ڕێژەی کۆ. شاخی «کوڕکوڕ»ی پشت مەرگ بریتییە لە کۆی کوڕ کە بە واتای شاخ، کێو بووە.. لە پەنجاکان، یان کۆتایی چلەکاندا، بێ ئەوەی لە کەسم بیستبێت و خوێندبێتمەوە، نووسیومە - بە عەرەبی: «وليس قصارى العقل ان يمتنع عن تفسير الاشياء التى لا يفهمها ولكن يفسرها تفسيرات خاطئة». هەر ئەم خەسڵەتەیشە لە هۆشی ئادەمی بوو بە سەرچاوەی ئەفسانە نەک ئارەزۆی حیکایەتخوانی... زێدەڕەوی لە هەڵنانی زڕەدرۆی سەر بە پاڵەوانی و سیحر و جوانی و کەرامەت لە سەرچاوەی شەیدایی بۆ «لە عادەت بەدەر» هەڵدەقوڵێ، تا ئەوەی ئەو مەیلە هەر خۆیەتی وەردەگەڕێ بە شەیدایی بۆ زێدە گەدایی و لە پێناو خەڵک مردن و... بۆ زێدەپاکی خۆخەساندن وەیا، لە ئافرەتەوە، خۆدزیۆ کردن. بەڵێ، دەزانین و چاوەڕوانیش دەکەین. بە دوا کاتەوە، کە جیهان گەشایەوە بە زانست و هونەر و فەلسەفە

و پەیدابوونی ڕاڕەوی لێکتر جودا بۆ خۆڕوونکردنەوە یان مەتەڵ ڕەواندنەوە، ئەفسانە بکرێتە بنەمای چیرۆک و پەیکەر و نیگارکێشی و مۆسیقاسازی و شانۆگەری و دانس و ئۆپێرا، بگرە دەشێ گیانی کوڕێتی وەیا مۆدەی بێپەروایی وەیا ڕکەبەریی مرۆی صەدەی بیستویەکەم بەو پەڕی دڵگەرمییەوە ئەفسانەی ئاتۆناپشتم بکاتە بەرهەمی فەلسەفەیەکی قووڵ تا ئەوەی ئەدیبێکی مەزنی عەرەب، مەرحووم عبدالحق فاضل، لە کتێبێکی خۆی بە ناوی «هو الذي رأى»ی لەسەر «ملحمة قلقميش-گلگامش» نووسیویەتی «... انها احدى قمم الادب البشري وام الملاحم العالمية المشهورة». لە ڕووی وەفاوە دەبێ بڵێم، ساڵی 1985 سەردانی بەغدای کردەوە. نەساغ کەوتبوو لە «مستشفى الطوارىء» و چوومە ئەحواڵپرسیی. نوسخەیەکی ئەو کتێبەی بەم «اهداء»ە زێدە تەوازعکارانەوە نەوازش کرد، دەڵێ: مهدى الى العلامة الكبير الاستاذ مسعود محمد مع كبير التقدير وصادق المودة. منیش هەر لە بەرچاوی خۆی، لە سەرووی نووسینەکەی ئەوەوە، کە لە بەرەو خوار مەودای نووسین نەبوو، ئەم یەک دوو دێڕەی سپاسگوزاریم ڕەشنووس کرد:

«مكرمة وشح بها تواضعي الاستاذ عبدالحق فاضل وانالني شرف كتابة الاهداء، لقدر مقدور اعاق العطاء المتدفق من انامل يمناه».

کۆتایی نووسینەکەم ئیشارەتە بۆ نەساغییەکەی لە خەستەخانە، ڕۆژەکەش 1985/12/12 بوو... بگەڕێمەوە بۆ بابەت.

من لە تەبیاتمدا دەستووراتی قەرارداده هەر بۆ ئەو بابەتانە دەست دەدەن کە بێگیانن، کە زیندوویەتی تێکەڵ بە ماددەی مردوو بوو، جیهانێکی سەرتاپا جودا لە سروشتی مردوو کرایەوە... سەرۆکێکی ئەکادێمیی ئینگلیز بەر لە شەست ساڵێک نووسیویەتی: دەشێ زانایانی فەلەک پێشبینیی ڕاست و دروست بکەن لەو ڕۆژگیران و مانگگیرانەی ئێستا تا ملیۆنێک ساڵ، بەڵام هەرچی زانای جیهان هەیە ناتوانن پێشبینی بکەن لە ڕەفتاری مێشێک لە

ژوورێکی داخراودا.. تومەز ئیرادەی ژیان هەزاران ڕووی هەیە.. ئەمجا کە هەڵکشایت تا دەگەیتە مرۆ، ئەوسا مەخلووقێک دەبینیت وەک ماری بێ ئیجازە، سەرەدەری لە کردە و بردە و گوتە و خولیا و وڕینە و هیچ شتێکی ناکرێت.. لەگەڵ ئەو مامۆستایانەی پسپۆڕی مێژوون زۆر جار دەکەوینە وتوویژ لەو ڕووەوە کە من مێژوو و حازر بەیەک شت دەزانم. لەو ڕۆژەی بە چاوی خۆت دنیا دەبینیت، ڕووداوەکانی سەر بە تاک و سەر بە کۆمەڵ چەندی «عقلانیة» تێدایە هی بەر لە سی ساڵ، چل ساڵ، سەد ساڵیش هەروەهایە. دەسا ئەو مێژووناسانە ڕۆژگاری شوێنی وەک ڕۆژهەڵاتی نزیک بە شێتخانە دادەنێن کەچی هەمان شێتخانەی بەر لە سەد ساڵ دەبێ بەپێی بەرژەوەند و پێوانەی تەئریخی کردبێتی و فەرمووبێتی.. ئێستا لەم ڕۆژەی بەرەو کۆتایی مانگی تەمووز ئابووریناسێکی عەرەبی عێراق بۆتە مارکسی وڵاتە خەلیجییەکانی عەرەب، کەچی ساڵی 1964، بە ڕاوێژی ئەو، حکوومەتی بەغدا دەستی بەسەر پارەی ئەو خەڵکەدا گرت هەر یەکە چەند هەزار دینارێکی لە بانک دانابوو. بەمەشدا ئابووریی عێراق لەرزی.. سەیریش لەوەدا بوو کە تەئمیمەکە بۆ ڕەزامەندیی میسری عبدالناصر بوو، بە نیازی یەککردنی سیاسەتی عێراق و میسر کە پێشتر میسر تەئمیمی ئەوتۆی کردبوو، کەچی دوای حەفتەیەک، لە ماڵی عبدالناصر خۆی، باسی تەئمیم کرا، بە ئێمەی عێراقیی گوت: ئەم تەئمیمە نابەجێیە چی بوو؟ عێراقییەکی چەند هەزار دیناری داناوە بە یەدەگ لە بانک بۆ ماڵ و منداڵی، چۆناوچۆنی حکوومەت دەستدرێژیی لێ دەکات، کە عێراق دەوڵەتی نەوتە؟. من- عبدالناصر- هەزار ملیۆن «جونەیە» م لە پارەداری بێگانە گل دایەوە... ڕاستییەکەی هەزار ملیۆنەکەی ئەویش جێی لێپرسینەوەیە. ئایا چ دەنگێکی داوەتەوە لە جیهانی پارەداران کە میسر و سەدان وەڵاتی وەک ئەو چاویان بڕیوەتە ڕەزامەندیی ئەوان بەڵکوو قەرزێک، پرۆژەیەک لەوانەوە ڕووی خێریان تێ بکات.

کە دەڵێم «عقلانیة»ی مێژوو، هەڵبەت دەزانم نەتەوەی پێشکەوتوو پتر بەلای بەرژەوەند و هێمنی و دیمۆکراسیدا دەچێتەوە، بەو پێیە مێژووی ئەو لە

چاو هی بەلووچ و کورد و عەرەب «عقلانية»ی پتر تێدایە، بەڵام دیسانەوە کە هەڵەی بەر لە 100 ساڵ بەسەر دەگرنەوە بێئاگان لەوەی کە هەڵەی حازربەدەستی ئەوتۆ دەکەن زەقتر بێ لە هی کۆن. بە عادەت مرۆ لە نرخاندنی ڕەفتاری غەیر پیتۆڵتر و نیشانەپێکاوترە، ڕابوردووشی عاقڵانەتر دەداتە بەر نیگای ڕەخنە، هەرچی کاتی سەردەمە بە خۆی و ڕووداوەکانی زبرتر وەیا نەرمتر لە هی کۆن دێنە بەر هەستیەوە، لە کردن و نەکردنیشدا کاریگەری یار و نەیار بە زەقی خۆی دەنوێنێ بەشی هەرە زۆری ئەو شتانەی بایەخی تایبەتییان هەیە بەلایەوە بەشێکن لە پێکهێنەری مجێز و خۆشویستن و نەویستی و ترس و تەماکانی کە دەبنەوە بە دروستکەری بڕیارەکانی. ئەوجا دەشێ کە بە خوێنی ساردەوە بڕیارێکی بەر لە سی ساڵی خۆی نابەجێ دابنێت. بڕیارێکی بەردەستانی وەک ئەویان بەجێ و پەسەند حیساب بکات... زۆربەی خەڵک لە کردەی پێشووی پەشیمان دەبێتەوە، لەوانەیە بڵێ، نەدەبوو لەسەر قسەیەکی دەمهەراشانەی فڵان بیکەمە هەرا. هەر لەو دەمەشدا کە قسەیەکی وەک ئەوی پێ گوترا ڕەنگە بیکاتە هەرایەکی زلتر، تومەز بەدەم تەمەنەوە تەحەممول کەم دەبێتەوە.

بە نیسبەت «فەلسەفەی هاوچەرخ لە کوێدا دەبینن؟» کورکبوون بەسەر وەڵامێکی یەک ڕێ و یەک لایەن نەک هەر زەحمەتە، بگرە «فەلسەفەی هاوچەرخ» خۆی بە تەواوی لە تاریکاییدایە، یاخود با بڵێم بەلای منەوە ئەوتۆیە. فەلسەفە خۆی لە دەمێکەوە تێکهەڵکێشە لەگەڵ زانست، بەتایبەتی فەلسەفەیەکی لەگەڵ بوونەوەردا بەتێکڕایی لە وتووێژدا بێت. لەم سەردەمەشدا زانست وەها پان و قووڵ بووە باوەش پێدا گرتنی لە وزەدا نەماوە. دەشێ فەیلەسووفێک چەند زانستی بنەڕەتی هەزم بکات وەک ڕیاضیات و فیزیا و فەلەک و بایۆلۆجی و سایکۆلۆجی.. لەمانەوە فکرەیەکی هەمەلایەنی سەر بە تێکڕای بوونەوەر هەڵبنێ، بەڵام ئەمانە لە نزیکەوە چاری گرفتی ئایین و سیاسەت و ئابووری و ماف بە گشتی ناکەن. ئەو فەیلەسووفانە ناتوانن یەکسەر لەگەڵ ئاپۆرەی خەڵقدا بدوێن، زمانێکی

موشتەرەکیشیان نییە لەگەڵیاندا تێک بگەن. فەیلەسووفی مەزن لە ڕێکاری سیاسەتی جیهانی و پێوەندی نێو دەوڵەتە زلەکان مەیدانی کاریگەری خۆی دەدۆزێتەوە، ئەویش نەک یەکسەر سەرۆکی ڕووس و ئەمەریکا دەستە و نەزەر بۆی ڕادەوەستن بەڵکوو بیروڕایەکی پشتئەستوور بە زانست و ڕۆشنبیری و پوختەیی لەوەوە، بە بەریەوە هەیە ئاپۆرەی خوێندەوار و سیاسی و ئەهلی زانکۆکان و ڕۆژنامە و... و... بۆ خۆی ڕابکێشێ و گوشار لەوانەوە بگاتە بازاڕی سیاسەتمەدارانی خاوەن دەسەڵات. بەم حاڵەتەش دەشێ لە گەلێک لایەنەوە بەرتەکی نەیار و نەزۆککەر بە پشتیوانی خاوەن بەرژەوەندی زل، چ لە پارەدار چ لە مەزنە سیاسییەوە، لەمپەڕی پەکخەر بخەنە بەر بیروڕای فەیلەسووفی باسکراو. لەمەش پتر، بەرەی لێکترجودای بەرژەوەند و ئایدیۆلۆژیای هەروا بێ پەروا و بە بادی هەوا تیز بەو «خەیاڵبازی»یەی خولیاکردی فەیلەسووف دەکات، خۆ تا ئێستاش بەرەی سەر بە کۆنە کۆمیونیزمی لینین و سەر بە چینی سەردەم بنێشتۆکەی «بیری بۆرژوازی» دەجاوێتەوە و گەرمە تەریقانە -لەگەڵ نەختێک تەعدیل- لە شۆڕشی پرۆلیتاری دەبزرکێنێ. ئەوجا دەوڵەتە، بە ڕواڵەت یەک مەزهەبەکان، لە نێو خۆیاندا تەبا و ڕەبا نین و پێشیانەوە دیار نییە گوێ هەڵخەن بۆ پەندی زێڕینی فەیلەسووف. تا ئەم دەمە هەوڵی ئادەمیزاد (مەبەس لەو ئادەمیزادە ئەو خەمخۆرەن کە ترسێکی چارەنووسڕەشی مرۆ بە هەڕەشەی چەکی ئەتۆمی و Nuclear خوتخوتەی خستۆتە دڵیانەوە) بۆ دۆزینەوە و سەپاندنی ڕەوتی بەرەو بە هێمنی و سەلامەتی و دیمۆکراسی و لاشەڕی و زاڵبوون بەسەر نەخۆشی و لە برسان مردن... و... و تابڵێی دوورە لە ڕادەی پێویست... (لە تەجرەبەی یارمەتییەکانی بۆ کوردی هەرێم دەهات، ئەو بەرپرسانەی سەرپەرشتییان لە کارەکە دەکرد تێکڕایان دز و ساختەچی و بەرتیلخۆر بوون، ئەوجا کوردە بەرپرسەکەش جەردە بوو، ئیتر دز و ماڵخۆ یەک بن، با بڵێم، کولانکە بە گاجووتدا دەبەنە دەر). ملیارەها بەشەری عادەتی سەردەم ئەوەندەی بە فووتبۆڵ و گۆرانی و هەڵپەڕکێوە خەریکە هەزاریەکی ئەوەش بە

خەرج نادات، نە بۆ هەژاری میللەتەکەی و نە بۆ چارەنووسی مرۆڤایەتی... تا ڕادەیەک وڵاتی پێشکەوتوو لە ئاکامی ئۆگرگرتنی بە مامڵەت کردن لەگەڵ دروستکراوی بەرهەمی زانست و تەکنیک ڕێکوپێکیی هەیە هەم لە بەجێهێنانی کارێکی بە ملیەوەیەتی و پاراستنی ئامێرێکی پێی سپێردراوە و هەم لە داواکردنی مافێکی یاسا پێی بەخشیوە لە سنووری یاساکە خۆیدا. هەڵبەت ئەم جۆرە ڕەفتارەی هاوئاهەنگ لەگەڵ داخوازیی شارستانەتی لە خۆوە ماوە بە گەل دەبڕێ بەرەو ئاسانتر کردنی چارەسەری گیروگرفت، لزوومیش نایەڵێ بە دەرسدانی ڕۆژانەی ئەو قەوغایە لە لایەن مامۆستا و پسپۆڕ و فەیلەسووفەوە کە چ بکات و چۆن بکات، دیمۆکراسیش گەل و حکوومەتی ئەو تەرزە وڵاتانەی ڕاهێناوە بە ڕێزگرتن لە فەرمانی یاسا و پێڕەوی کردن لە هەلومەرجەکانی. کە بلوێ بۆمان، بێ لایەنگیری و نەیاری و بە مێشکێکی کرایەوە، ورد بینەوە لەو شانۆگەرییەی «ئادەمیزاد» لەسەر شانۆی چەندین بابەتی ئاینیی و سیاسی و ئابووری و هونەری و کۆمەڵایەتی و بێنەزمی و سۆفیەتی و ئاسمانگەری و مەیموونپەرستی و هەزار دەر و دەربوونەیی لێکتر نەچووی دەیکات و تا ئێستاش بەشی هەرە هەرە زۆری ملیارەهای مرۆ لە توخمی دواکەتووی بێ سەروبەرە، نە دەپەرژێت و نە دەفکرێت و نە هیچ عەیارەیەکی چاکە و خراپە و ڕێ بە دێ و گەییشتنە ئامانجێکی لە خەیاڵدایە بیباتەوە بەلای حیسابی ورد و قوڵ و بیندرێژی چەندین سەرەی فەیلەسووفانەوە، کە مرۆی ڕۆشنبیری عادەتیش تێیان ناگات و ناشیانخوێنێتەوە و پارەی مفتیشی نییە کتێب و نامیلکە گرانبەهاکانیان بکرێت، تا هەر نەبێ بە ڕواڵەتی ئەو کتێبانە نازوفیزێکی فەلسەفەزانی بکات... ملیارەها خەڵکی شار و دەشتودەر، بیگرە لە پۆپی شارستانییەوە تا مۆڵگەی گا و حوشتری زەلکاوان، هەر شوێنە بە پێی دەستوور و نەریتی بەر کەهرەبا و کۆندیشن وەیا شاپلێتەی نەوتی ڕەش وەیا تاریکایی بێ شاپلێتەیی، خەریکی گردوکۆیی و گوزەران و بەسەربردنە (بەشێکیشی هەر پێوە مردنە) و بە داخوازیی ئاڵوویری بازاڕی و فەرمانی یاسا و ئایین و عورف و عادەت و

پێکەوە هەڵکردنی ناچاری، خەڵکەکە - هەر تاقمە چین و تیرێژی کۆمەڵ- بەسەر ڕێبازێکی لە خۆی بوەشێتەوە گوزەر دەکات و خەمی سێ جەمەی ڕۆژانە و بەرگی عەیبپۆش و تەڕدەماغییەکی لە ئیمکاندا بێ لە بیر فەیلەسووف دەباتەوە. ڕەنگە بەشێکی خەڵقەکە لە قوڕ بنیشێت و فەیلەسووف هەر پێی نەزانێ... خولاسە حاڵوبارێکی بە حوکمی واقیع ئاپۆرەی خەڵقی تێدا دەژیت ڕێی نییە و دەرفەتیش نابینێت شکاتی خۆی بۆ لای فەیلەسووف بباتەوە، کە ئەگەر بەخەیاڵیش دەنگی خۆی گەیاندێ، فەیلەسووفەکە ناتوانێ نانێکی ڕزیو بخاتە تێشوویەوە... زۆر بە سەیری، فەیلەسووفێکی ڕووسیای، وا بزانم، سەردەمی بریژنێف کە ناوی زەخارۆف بوو (ئەگەر سەهووم نەکردبێ) خۆی بە دەست حکوومەتەکەوە لە زاکەزاکدا بوو. بیرترەند ڕەسڵ خۆی لەسەر گوتارێکی دژی حەرب لە ساڵی 1918 شەش مانگ خرایە بەندیخانە، پێشتریش هەر لەسەر بەرهەڵستی کردن لە «تجنید الزامی» حوکم درا بە 100 لیرە جەزا و کتێبخانەکەی بۆ فرۆشت... مەشوورە کە سوقرات زەهری نۆشی و لە قسەی نەگەڕایەوە بۆ ڕزگار بوون لە مردن.

سەرت نەیەشێنم، براکەم، وەک لە پرسیارەکەت دەگەم، فەلسەفەی سەردەم، ئادگار (ملامح)ێکی پێوە نەڕسکاوە هەتا بزانم لە کوێیدا ببینم! شتێکی ئەوتۆ بگونجێ لەگەڵ ئەو مەفهوومە (ئەویش بە تەئویلێکی دوورەدەست) دەنگوباسی مافی مرۆ و تا ڕادەیەکیش، دادگەی دادی نێونەتەوان لە گۆشەیەکی ڕۆژئاوای ئەورووپادا. بە داخەوە مافی مرۆ سیاسەتێکی خۆڕەپێشکەر بەو ناوەوە، بۆ نیازی خۆی، کردی بە مەشقەڵ. نەماندیت ئەو مافە بۆ کوردی بێکەس بە دەنگ بێت... با مەسەلەکە نەخەمە خانەی عاتیفە، مافی مرۆ دروشمێکی پەسەندە بەڵام بەپێی داخوازیی حاڵی ئەوتۆ پشتیوانی بەهێزی هەبێت بۆی بە دەنگ دێت... لێرەشدا بەش بە حاڵی واقیعبینیی خۆم ڕازیم و سپاسگوزاریشم بۆ ئەو مافە مادەم نەیگەیەنێتە پشتگیرکردن لە ستەمکار.

کەواتە لە دیدی مندا شتێک نییە پێی بگوترێ فەلسەفەی سەردەم، قەوارەی هەبێت و بخوێندرێتەوە. بەڵام دەشی تۆ یان من یان هەر کەسێکی لە خۆی ڕاببینێ و تەراتێنێکی لە بیردۆزی کردبێت و ناوێکی هۆشپەسەندی لە دیاردەیەکی سروشت بێ یان کۆمەڵایەتی یان زانستی و ئەدەبی... و هونەری، هەر لە سیحر و تەڵسمی زانستە سەرسوڕینەکانی ئەم ڕۆژگارە تا دەگاتە دەموچاو خەناویکردن بە تەپاڵە، بە هەزاران ناوەڕۆکی باوەڕ و نەریت و دروشمی کز و گەشیەوە کە لە نێوان ئەو جغزەدا لێک دەژەنن، بداتە بەر نیگای هۆشی مووقڵاشەوە و بە لێکدانەوەی پسپۆڕانە و خوێنساردانە کاریگەریی پەسەند و بەدی کۆمەڵایەتی و سروشت بنرخێنێ لە سەقامگیرکردنی لایەنەکانی ماددی و مەعنەوی و هیچایەتی کە دەبن بە هۆی بزوێن و وەستێن لە چاکەوە یا لە خراپەدا، ئا ئەو تەرزە مرۆیە ڕێی دەبێ، هەر نەبێ بۆ دڵدانەوەی خۆی وەیا وەفاداری بۆ چاکە و ڕاستی، ناوێک بدۆزێتەوە وەیا لە نوێوە دارێژێ و بە پێناسەی فەلسەفەی سەردەمی حیساب بکات. بەلای بۆچوونی خۆمەوە هیچ کامێک لەو کۆمەڵە خەڵقەی گوێ ناداتە چارەنووسی مرۆ و گیروگرفتی ملیارەها خەڵقی بێچارە و خەریکی سوودی خۆی و کەیفی خۆیەتی، هەروەها ئەو ملیارەهای ڕووت و برسی و دواکەوتوو و چەوسێنراوە و حیساببەدەرن ناشێ ببن بە پێکهێنەری موعادەلەی فەلسەفەی سەردەم بە شێوەیەکی یەکسەر و ڕاستەوخۆ، چونکە بە ڕەفتار و بە کرداری خۆیان دەکەونە دەرەوەی جغزی موعادەلەکە هەرچەند خاوەن موعادەلە حیسابی کاریگەر نەبوونی ئەوانی کردووە و لە خانەی «بێسەنگی» و لایەنی نەرێتییان دادەنێ، کە دەبێتە بار و بەرهەڵست بەسەر هەوڵی ئەو هەوڵدەرانەی لە چاکەی مرۆ دەنۆڕن و بۆی دەخەبتن. ئەوانە وەک نەفەری کرێگرتەی ناو ئۆتۆمۆبێلن کە لە قوڕ چەقیوە و لێی دانابەزن پاڵی پێوە نێن، بەمەشدا دەبنە بارگرانی بەسەر شانی ئەوانەی تەکان دەدەن بۆ دەرخستنی ئۆتۆمۆبێلەکە. نەفەری وەهاش هەن لە ئۆتۆمۆبێل دادەبەزن بەڵام پاڵی پێوە نانێن، هێشتان ئەمانە کەمتر نامەردن لە تاقمی پێشوو. دەمێنێتەوە ئەوانەی

تەکاندەرن، ئەگەر لەبەر کەمهێزی، ناقولایی ئەو جۆرە گەلۆرییە تەحەممول دەکەن گلەییان نایاتە سەر. بەلام چاونووقاندن و دەسەلاتداری لەو تەرزە هەلوەستەدا دەبێتەوە ترسنۆکییەکی هەلاتووانە، بەلکوو ئیمزاکردنی سەنەدی خزمەتکاریی بێ مزە. هەرچەند لە مەسەلەی چارەنووسی مرۆ، جارێ، حیسابێکی لەم بابەتە بە دەفتەر نەگیراوە، بەلام لە زۆر جغزی بەرژەوەندی بەرتەسکتردا ئەو مەیلەی مازۆکیزم بە زۆرینەی بزووتنەوەی سیاسیی ولاتی دواکەووتودا ئاشکرایە کە دەبینن بزۆزێکی حەرامزادە خۆ دەکاتە شوانی مەڕگەلی خەباتگێڕان و تا ڕادەی خۆکوژی و خیانەتیان دەبات و چرچە ناکەن...

لەبەر تیشکی تێکڕای ئەو تێبینیانەدا و بایی ئەوەی هۆشم بڕ بکات و بەوپەڕی دەمارخاوییەوە کە تەوژمی خۆ بە ڕابەر و مامۆستا دانانی تێدا نەبێ، فەلسەفەی سەردەم لەم حاڵەتەی لەنگەر بەزیوی زێدە هێزی سیاسەت «بە ئابوورییەوە» و لایەنی کەمتر هێزی ڕووناکبیری و شارستانەتی و زانست و تەکنیک، ئاوێتەیەکە لە پەلەپەلی خۆژیان کردن و تەیار کردن، تێکەڵ بە پەندی ژێرخانێکی کە بریتییە لە کاکڵی هۆشیاری و ئارامی و مامەڵەکردوو لەگەڵ چی پێی دەگوترێ ڕاستییەکانی سروشت و بەرژەوەندی مرۆڤ. سیاسەتمەداران و ئابووری لێخوڕەکان تا ئەم ڕۆژە و بە فەرمانی داخوازییەکانی گوزەران کە تا ڕادەیەک مەیلی خۆویستی خەلەل بە دەستوورە بنەڕەتییەکانی هەردوو لایەنی تێکبەستراوی سیاسەت و ئابووری دەگەیەنێ و لایەنی «سوودی ئادەمیزاد» کەم دەکاتەوە، بە زۆری و بە تێکڕایی لە کێشەیەکی کە لەگەڵ ژێرخانە پڕشنگدارەکە تووشیان دێت سەرکەوتوو دەبن چونکە «کادر»ی زانست و تەکنیک، کە بریتییە لە زاناکان و یاریدەدەرەکانیان کەمتاکورتێکی ئادەمیزادن نە لە هەڵبژاردنی نوێنەرانی کۆمەڵ چ دەنگێکیان دەبێت و نە لە ئاست ئاپۆرەی خەڵکی کوچە و بازاڕ و دنیای کەسابەت، بە تێکڕایی، کە یەکسەر خەریکی خۆژیاندنە بەو دەرفەتانەی ئابووری و سیاسەت دەیڕەخسێنن چ بایەخێکیان دەبێت هەر

دەڵێی ئەو کەماوە ڕوونەن کە دەڕژێتە ناو ڕووباری لیخن، بۆ ماوەیەکی کورت بە ڕوونی دەڕوات و تێکەڵ بە قوڕاوەکە دەبێت. لەگەڵ ئەمەشدا ئەم کەمایەتیە ڕوونەی زانست و تەکنیک و هونەر و نرخە بەرزەکان هێزێکی مەعنەویی گەلێک زلتری هەیە لەو هێزە مادییەی «ژمارە»ی کەم کە لە تای تەرازوودا سووک هەڵدەستێتەوە، چونکە لایەنی خاوەن تەرازوو کە سیاسەت و ئابوورییە وەک ئاپۆرەی خەڵکی کوچە و بازاڕ و فووتبۆڵ و کشتوکێڵ بێ هەست و هۆش نییە، نرخە مەعنەوییەکەی زانا و تەکنیشیەن و هونەرکار نەزانێ، بگرە ئاگادارە لەوەی بەشێکی بەسەنگی ڕوومەت و حورمەتی خۆی لای جیهان هی ئەو تاقمە موممتازەیە کە لە تەرازووی ناوخۆیی سەنگی کەمە، وڵاتێکی زانست و تەکنیکی نەبێ حکوومەتەکە و ئابوورییەکەشی بێحورمەت دەبێ، مەگەر داراییەکی وەکوو نەوتی هەبێ کە حورمەتەکە هی نەوتەکەیە وەک کە مەلای مەزبوورە جلکی قەشەنگی خواستەوە و پێی چووە سەر داوەت کە پێشتر بە جلکی پڕزۆڵی خۆیەوە چوو، نەیانهێشت ئاودیوی دەرگەی دەرەوەی ماڵەکە بیت...

تا ئێرە پێناسە دەرکردن بۆ فەلسەفەی سەردەم، کەم و زۆر، سیمایەکی زڕ بە دەستەوە دەدات بە مەرجێک لە بیروڕاکانمدا نیشانەم پێکابێ، نەخۆ چی گوتومە لەو بابەتەیە پێی دەڵێن قسەی مفت، کە ئەگەر غەدری لێ نەکرێ بە بەریەوە هەیە تەفسیری نەتەوە یەکگرتوەکان و مەجلیسی ئەمنیش بکات کە پتر بەهۆی هێزی ئابووری و سیاسەت سەقامگیر بووە، نەک مافی ئازادیی و یەکسانیی مرۆ چونکە یەکسانیی نێو دەوڵەتانیشی تێدا زێدە بێهێزە، هەر نەبێ لە مەجلیسی ئەمن کە داینەمۆی کارەکەیە. دەبێ ئەو ڕاستییەش (بە پێی باوەڕی خۆم) دەربڕم کە مافی ڤیتۆ چەندێکیش بەرهەمی سەرکەوتنی بەرەی سوێندخواران بوو لە شەڕی دووەمی جیهانیدا، دیسانەوە ڕواڵەتێکی بەرچاوی واقیعبینی تێدایە کە لغاو دەخاتە بەڕەڵڵایی ئەوەی پێی دەڵێن «زۆربە»ی دەنگەکان لە مەجلیسی ئەمن، دەشێ ئەگەر ڤیتۆ نەبێ، چەند دەوڵەتێکی خۆمانئاسایی کە پەکی بە خۆی و بە دنیاش نەکەوتووە و

هەمووشیان بخرێنەوە سەر یەک هێندەی تۆکیۆ یاخود نیویۆرک دانیشتوویان نییە، دەنگ بدەن بۆ بڕیاری ئەوتۆ جیهان بشێوێنێ. ڤیتۆش لە دەست دوو لایەنی لێک تاسپدایە، لەنگەرەکە ڕادەگرێ. ئەم خاڵانە هەمووی بەر حیسابی پێناسەکە دەکەوێ... بەڵام... دیسانەوە بەڵام و دەجار بەڵام، هەرچی پەڕگیری و خودبەسەری و بێباکی و تۆقاندن و گێرەشێوێنی هەیە لە دنیادا، کە تا ئێستا چارەیەکی بۆ نەدۆزراوەتەوە، زۆر بە ئاشکرایی، یاریدەی لایەنی لەنگەربەزیویی هۆشداری و خۆگیری و دوورەندێشی و ئەو جۆرە ئەندێشانە دەدات، واتە لەنگەربەزینەکە بەو بێ نەزمییەی پەڕگیری و... و... هتد شلتر دەبێتەوە و بڕشتی کەمتر دەبێت و ئاسانتر چاو دەنووقێنی لە هەڕەشەی بازاڕی چەکی خاپوورکەر و ڕێ هەموارتر دەکات بۆ بڵاوبوونەوەی ئەو چەکانە تا دەکەونە دەست سەرۆک دەوڵەتێکی شێتووێت، وەیا جەردەی هەلپەرست. بیرتراند ڕەسڵ لەو کتێبەی «ئایا مرۆ دوارۆژی هەیە» مەیلی هەیە بۆ حکوومەتی عالەمی. بەپێی بۆچوونی خۆم تا ئەم دەمەش کە نیو سەدە بەسەر مەجلیسی ئەمندا تێپەڕیوە بنەمایەک نییە لە مەڵبەندی ئادەمیزادا جێگرێکی باشتر لە مەجلیسی ئەمن و نەتەوە یەکگرتوەکان ڕەچاو بکات، دەتوانم بڵێم بڕیاری واقیعی «پێکەوە ژیان»ێکی ئێستا لە کاردایە چ جۆرە گۆڕانێک هەڵناگرێت بناخەی بڕیارەکانی پاش حەربی دوەم دەسکاری بکات، چ جایی ئەوەی خولیای حکوومەتی جیهانی بە بیری سیاسەتمەداران و سەروەتمەنداندا تێپەڕێت. ئەوەی ڕاستی بێ، خەریکبوون بەو خەیاڵە لە بنەڕەتدا بۆ ئەم قۆناغە بەولای یۆتۆپیاوەیە. بەرژەوەندێکی جیهانی مرۆ لەباری ئێستاکەی نێو دەوڵەتان بەوەدا دەردەکەوێت کە ببێت بە «league-دەستەی گەلان»ی دوای شەڕی یەکەمی بگریت، بۆت دەردەکەوێ مەجلیسی ئەمن و نەتەوەیەکگرتوەکان چەند کاریگەرترن لە ڕواندنەوەی کێشە و سەرئێشەی دەوری 150 دەوڵەت. ڕەنگە ئەگەر چین لە زەقیی و ڕەقیی ئایدیۆلۆجی خۆی وازبهێنێ و ڕەنگەکەی سۆفیگەری لە بیروباوەڕەکەی سەر بەم دنیایە بسرێتەوە. بەشێکی کرژی حاڵوباری دنیای کۆمیونیزم خاو دەبێتەوە و

سیاسەتیان لە مەفهوومی ئێستاکەی نوێژ و ڕۆژووی ڕێی قیامەت ڕزگار دەبێت و بەر لە عالەم خۆیان دەحەسێنەوە... بە داخەوە کەسانێکی ماویان دەپەرست، دواتر کە سۆڤیەت هەرەسی هێنا و تا ڕادەیەک لێیان ڕوون بوو خەیاڵی ماوپەرستی جۆرێکە لە سۆفیگەری، نایەن بە نووسین و لە ڕێی تەلەڤیزیۆنەوە خەڵکەکە حاڵی بکەن لەو هەڵەیەی دووچاری هاتبوون. بۆ دەبێ ڕۆشنبیری خەباتگێڕ بە ئاشکرایی ماو و ستالین بپەرستێت کەچی نەوێرێ بە ئاشکرایی پووچەڵی و نارەوایی ئەو بوتپەرستییە بدرکێنێت. ئەو خەباتگێڕە بێ پەروا، لە دەمی پەرستنی ستالیندا، سەرلەبەری جیهانی ناکۆمیۆنیستی تاوانبار دەکرد و نازیشی پێوە لێ دەدا و ترسیشی پێوە دیار نەبوو (لە زۆر حاڵدا، خەباتگێڕی کورد هەڵوەستی سۆڤیەتی دژ بە کوردی دادەنا بەوپەڕی سیاسەتی ڕاست و دروست) کەچی زات ناکات بیروباوەڕە تازەکەی بە ڕەهایی دەرببڕێت، وەک کۆنە بنجوو کە ترسی ئاگری ڕۆژی شەمۆی هەر دەمێنێ... پێی ناوێ دەفتەری موفرەداتی لایەنە لەنگەر بەزیوەکەی سیاسەت وەیا فەلسەفەی سەردەم دەور بکەمەوە تاکوو بە پێی باوەڕی خۆم قسەیەک بکەم لە چۆنیەتیی ڕەنگ و ناوەڕۆکی کۆمەڵایەتی پاش 50 ساڵ، 100 ساڵ... و لەوێوە ڕەملێک بهاوێژم بۆ دیارخستنی فەلسەفەیەکی لەو ڕۆژگارە بوەشێتەوە، بەڵام مەیلێکی بەهێز گوشارم بۆ دەهێنێ بڵێم ملانێی نێوان هەڵپەی سیاسەت «بە ئابوورییەوە» و ئارامیی «عقلانیة» بە سستی مەودا دەبڕێت بەرەو ڕۆژگارێک کە هەڵپە تێیدا کۆڵ دەدات و جڵەوی چارەنووس دەخاتە نێو لەپی لایەنی ڕووناکی مرۆڤایەتی. جا ئەگەر ڕێم هەبێ لەو باری وەها دەڵەمەیی کە بۆتی شەرح دەدەم مافی دەروونکردنەوە بەکاربهێنم، بە زمانێکی پەتەوە دەڵێم، شەبەنگی زرە بەیانییەکی تاریکولێڵ، وەک زەردەخەنەی سەر لێوی نەخۆش، بزەبزیەتی و دەشێ هەر لە ڕێی کەڵەکەکردنی گیروگرفتی پەلەی سیاسەت و ئابوورییەوە (بێ تێخوێندنەوەی دەوری زانست و تەکنیک) ئەو بزەیە بەهۆی دڵشکەستەیی ملیارەها خەڵقوڵلای 1- بێدەرەتان، 2- هەڕەشەلێکراوی لەناوچوون بە بۆمبای شەیتانی

وێڕای تەکانی لایەنی چاکەخواز و ڕووەو ئاشتی و دژەشەڕ، خێراتر لە تەمای ئێستاکەمان بگەشێتەوە، بەوەشدا فەلسەفەی دواڕۆژێکی ئەو دیوی ئاسۆی لێمانەوە دیارە، کە بە دەنگ بێت موژدەبەخشە و کە دەرکەوێت ڕابەری ئاسوودەییە، چەندێکیش ترسی دوابڕانەوەی تۆوی ئادەمیزاد بە عیفریتی ناو گومگومی سەرمۆری ئاتۆم و ڕەجاڵتربوونی حاڵی هەژار و برسی و بەهەدەرچوونی مافخواز و بەندیکراوی بێگوناهـ دەمەچەقۆی ئاگادار کردنەوە بگەیەنێتە تەرۆکی سیاسەت و ئابووریی لووتبەرز، ئومێد زیاتر دەبێ بە چارەسەرکردنی دەردی دەرمان بزرکردووی ئەم ڕۆژگارە.

ئەگەر ئەم دیمەنەی خەیاڵی تەمابەخش مەلۆتکەی ڕاستینەی پزدانی دەورانی سەردەم بێت و خەمخۆرانی چارەنووسی مرۆ ڕێکتر و چالاکتر و بیناتر و هاوکارتر مل بنێنە گێڕانی چەرخی عەرەبانەی قووڕگرتوو، ڕێی تێدەچێت... جێی خۆیەتی... لەگوینە... دێتە عەقڵەوە، مرۆ بێ ئەوەی دووچاری شەڕێکی جیهانیی سێیەم ببێت دەرگای چەشمەندازێک بە ڕووی خۆیدا بکاتەوە کە دەستوورە بنەڕەتییەکانی لەسەر تیمارکردن بێت نەک بریندار کردن. جا ئەگەر ئەم بەڵێنە شیرنە بەردار بوو، دەشێ ڕۆژێک لە ڕۆژانی سەرەتای ئەو دەورانە بکرێت بە جەژنی توخمی ئادەمیزاد.

- قسەی نەستەق و پەندی پێشینان و بەشێک لە شیعرەکانی شاعیرێکی وەک حەزرەتی مەحوی، گەر نەچنە خانەی فەلسەفەوە وا لێکدانەوەی فەلسەفی هەڵدەگرن. ڕوونتر بڵێم، ئایا کورد خاوەنی فەلسەفەیە؟ گەر بەڵێ، ئایا بە چ پلەیەک ڕەسیوە؟ گەر نەء، بۆچی؟

قسەی نەستەق پێوەندیی نە بە فەلسەفە، نە بە زانست و نە بە هونەرەوە هەیە. دەشێ هیندییە سوورەکانی ئەمەریکا و ئەسکیمۆ پەندیان هەبێت، تەنانەت، وەک لە فیلمی سینەما دەبینین، هەندێ ناوی هیندییەکان - ی ئەمەریکا- ڕادەگەیەنن لە لێکدانەوەیێکی سەر بە هێماکانی سروشتەوە

هاتوون. بەڵام دیاردەی ئەوتۆ و لەویش دوورەدەستتر ناچێتە دەربوونەی فەلسەفە، نەک هەر نابێتە فەلسەفە. تەماشاییێکی فەرهەنگی «المورد»ی عەرەبی بکەین، لە ماددەی «Philosophy» چەند تەعریفێکی هێناوە، یەکەمیان پتر بەلای مەبەسی پرسیاری تۆدا دێتەوە کە دەڵێ:

«العلم الذي ينتظم علوم المنطق والاخلاق والجمال و ما وراء الطبيعة ونظرية المعرفة»...

چوارەمین تەعریف ئەمەیە:

«معتقدات ومفاهيم ومواقف الشخص او الجماعة».

لە کتێبی The Cambridge Dictionary of Philosophy چەندین جۆری فەلسەفەی شیتەڵ کردوە وەک فەلسەفەی:-

1. Anthropology
2. Biology
3. Economics
4. Education
5. History
6. anguage
7. Law
8. Logic
9. Mathematics
10. Mind
11. Psychology
12. Religion
13. Science
14. Social Sciences

بەشی هەرە زۆری ئەو فەلسەفانە و ناوەڕۆکەکەیان بەلای شاعیر و مەلایەکی وەک مەحوی نەبیستراو بووە چجایی نەزانراو... بەشێکی جارێ پەیدا نەبووبوو، لەوە هەر بگەڕێ کە هەرچی بیر و بۆچوونێکی لەگەڵ کتێبە

ئاینییەکان، باخصوص قورئان، ڕێک نەکەوتبێ و نەکەوێت بە ئەفسانە و وڕینە و کوفر حساب کراوە و دەکرێت. دەشێ بە تەئویل موناقەشەی هەندێ پرسیارەکانی فەلسەفی وەیا گرتنەبەری خەتێکی فکر و لێکدانەوەی تایبەت بە کەسێکی دەستنیشانکراو بۆ ئەو کەسە بە فەلسەفە بڕوات بەڵام ئەمیشیان مەرجی قورسی هەیە هەم لەلایەن تەیاربوون بە شارەزایی لە ئەندێشەی خاوەن بیروڕای بنجداکوتاوی ناودەرکردوو، هەم لە لایەن پتەویی ئەو زەمینە فکرییەی بابای ئەوتۆیی بەسەریەوە هەڵچەقیوە، ناشێ یەکێک بە ناوی داهێنانی فکری نوێ بە عالەم ڕابگەیەنێ، بنیادەم بەر لە هێندە ملیۆن ساڵە لە گەیشتنی نێرینەی ڕێوی و مێینەی وشتر بە یەکتر، پەیدا بووە یاخود بڵێ زۆری ماوە یان نەماوە باری فەلەک بگۆڕێت و زەوی بە دەورەی مانگدا بخولێتەوە... کتێبێکی سەر بە ئایینی مەسیحیم لایە بە هەموو قەناعەتەوە دەڵێ لە ساڵی 2000 ی زایینی قیامەت ڕادێت... یەکێکی لەو عاشقە حیسابانە، کاتی خۆی بە حیسابی «جمل» و ئایەت و ئەحادیس ئیسپاتی کردبوو کە سەڵتەنەتی عوسمانلی تا ڕۆژی قیامەت بەردەوام دەبێ...

برای خوێنەر، کوردی گوتەنی، زۆران بۆ کەمان نەڵێین، فەلسەفە بە پێی گەز و گرێی پێناسەی فەلسەفە هیچ کاتێک لەو چواردە جۆرەی فەلسەفە لە نێو کوردان، بایی ئەوەی زانیبێتم، دەرنەکەوتووە. بەڵام دەشێ بە پێی پێناسەی چوارەمی فەرهەنگی «المورد» کە دەڵێ «معتقدات ومفاهیم ومواقف الشخص او الجماعة» فەلسەفە، لە نێو هەر میللەتێک بێت، بەو مانایە پەیدا بێت، ئەوساش نابێ بوتپەرستی وەیا مەدحی دەهۆڵ و زوڕنا و چشتی ئەوتۆیی بخرێتە جغزی فەلسەفەوە. چونکە ناچێتە قسەی عاقڵانەوە... لە سووچێکی تریشەوە ڕێ هەیە کوردێک بە فەیلەسووف دابندرێت کە لەبەر تیشکی بیروڕای فەیلەسووفانی کۆنی ئیسلام ڕاڕەوێکی تایبەت بە خۆی و ئەو بەڵگانەی دۆزیونەتیەوە بۆی حیساب بکرێ بە فەلسەفە، پیاوێکی وەکوو ئیمامی غەزالی کە بە فەیلەسووفی ئیسلام دانراوە لە ڕێی بەگژداچوونەوەی فەلسەفەی یۆنان کە بیروباوەڕی زانا مەزنەکانی ئیسلامی تەنیبۆوە، بە

فەیلەسووف حیساب کرا تا ئەوەی کتێبێکی عومدەی غەزالی «تهاتف الفلاسفة»یە هەمووی بریتییە لە پووچاندنەوەی بەڵگەی فەیلەسووفەکان، باخصوص ئەوانەی بەلای فەیلەسووفەکانی ئیسلامەوە جێی متمانەن. لە بەرتەک دانەوەی «تهاتف الفلاسفة» فەیلەسووفێکی مسڵمانی ئیسپانیا «تهاتف التهاتف»ی نووسیوە. جێی گومان نییە کە فەیلەسووفەکانی ئیسلام لە ڕێی خەریکبوون بە پێڕەوی کردن لە فەلسەفەی یۆنان و ڕاگرتنی بەرانبەر عەقیدەی ئیسلامەوە ناویان بە جیهاندا بڵاو بۆوە. هێندێکیشیان لە پووچاندنەوە و تاوتووکردنی بیروڕای ئەو فەیلەسووفانە بە فەیلەسووف ناسران. ئەوەی مەشوورە لە ئیسلامدا، چی پێ دەڵێن «علم الکلام» فەلسەفەیەکە لەسەر بنەمای بیروباوەڕی ئیسلام هەڵستاوە بۆ بەربەرەکانیی ئەو فەلسەفانەی لەگەڵ قورئان ڕێک ناکەون، بەڵام «کلام» خۆی لە ئاشنابوون بە فەلسەفەوە بەڵگەی عەقلّی و زانستیی کردە پاڵپشتی داواکانی، ئەگەرنا، هەر دەمایەوە بەڵگەی ناو دینەکە بکاتەوە بە عەیارەی ڕاستبوونی دینەکە، ئەوساش مەسەلەکە دەچووە پاڵ ئەو گوتە مەشوورەی عەرەب، کمن فسر الماء بالماء… واتە ئاوی تەفسیر کرد بە ئاو.

گومان نییە لەوەدا، مەلا زلەکانی کوردەواری کە ناوبانگیان بە ئێمە گەیشتووە هی وەهایان تێدا بوو پێی بگوترێ «مجتهد في المسألة» واتە لە تاکە پرسیاردا باوەڕێ خۆی بکاتە پێوانە، نەک بە ناچاریی تەقلیدی موجتەهیدێکی کۆن بکات، مەلایەکی وەکوو «ابن ادم» کە پتر لە 200 تەئلیفی هەبووە، کوردی گوتەنی، هەر بەسەر پێیانەوە موجتەهید بووە بەڵام نەیویستوە داوای «اجتهاد» بکات. لزووم نابینم نموونە بهێنمەوە لەو مەلایانە، نەکا بە ناوهێنانی هێندێکیان و خامۆشبوون لە هەندێکان گلەمەندی پەیدا بێت.

لە ئاست «مەحوی»یەوە بەش بە حاڵی خۆم شتێکم نەکەوتۆتە بەر دەست لە نووسینی، جگە لە بەشێکی شیعرەکانی، تا بزانم بە قیاس لە مەلای تر کە شارەزاییەکم پێیان هەیە، پایەی دیاری بکەم لە مەیدانی فەلسەفەدا. ئەم قسەیەم لە بەرزی مەحوی دانالەنگێنێ، خۆی تۆقەڵانێکە[7]، جگە لەوەی کە

ڕۆژگاری ئێستاکەی کوردایەتی پتر خەمخۆری بابەتی نایابی کاڵای کوردیی پەتییە نەک بابەتێکی وەکوو مێوان ڕووی لە خانووە شڕەکەی کردبێت. لە قیاسدا دەڵێم، چەندێکی بلیمەتی خەرج کرابێت لە ئیسپاتی پێغەمبەرایەتیی لینین و ستالین لە لایەن کوردی شەیدای مارکسیزمەوە هەمووی دەچێتەوە سەر خەرمانی ئینتەرناشناڵ، بە خۆی و چەندوچۆنی دروستی و نادروستیی خۆیەوە، کە دەزانین مەسەلەکە وەها دەرنەچوو کە بەر لە 20، 30، 40 ساڵ بە حەقیقەتێکی بەدیهی و فەرمانی مێژوو دادەنرا...

- ئایا کورد خاوەنی فەلسەفەیە؟

بێگومان کورد لەم پلەیەی ئێستاکەیدا خاوەنایەتیی تەواوی لە هیچ کەلایەکدا نییە مادەم وەها پرزۆڵ و بێ نەزم و هیچ نەدار و دەست بەتاڵ لە ژێرخانی عەسری و موفلیس لە خاوەنایەتیی نیشتمانەکەی و بێ ئابووری و بێ ڕێ و بان بە مەفهوومی نوێ و بێ ئیرادەیەکی سیاسی سەقامگرتوو... و... و بێت وەک هەیە!! خۆخافڵاندن لە ئاست واقیع یا بەرهەمی نەزانینە یان هی مەبەستی زۆڵە بەرژەوەندە... دەشێ کوردێکی لە دەرەوەی کوردستان بە زیرەکی و ڕژدی خۆی لەسەر خۆپێگەیاندن بگاتە پلەی ئانشتاین و لێشی تێپەڕێنێت، بەڵام لەسەر کورد حیساب ناکرێت! چ دەفەرمووی ئەگەر ئەو فەرخە خوایە دڵی هێنای بڵێ من خەڵکی ئەو شوێنەم تێیدا دەژیم و تێیدا پەروەردە بووم؟ قسەکەشی ڕاستە چونکە لە عەبابەیلێ و کۆیە و قرناقە نابێ بە ئاینشتاین.

تا ئێستا ئەوپەڕی پایەی فەلسەفی کە بۆ کوردێکی دانیشتووی کوردستان بڕەخسێ «ئەگەر بڕەخسێ» هەر ئەوەیە فەلسەفەی حازربەدەستی جیهانی ڕۆشن بجاوێتەوە، ئەمیشیان بە ئاسانی نارەخسێت. لە نموونەدا دەڵێم، من لە لای خۆمەوە بۆم ناسازێ موعادەلەیەک ڕێک بیەخم «ئەزەل» بە نرخێکی «موطلەق» دابنێت و لە هەمان کاتدا بشی ڕۆژ لە دوا ڕۆژی مانگ و ساڵی

بچێتە سەر و خەلەل بە لایەنی «موطلەق» نەدات کە دەزانین «موطلەق» زۆر و کەمی هەڵناگرێ و ناگۆڕێت. من نازانم لەم بارەیەوە فیزیای سەردەم چ دەڵێ. بەڵام بەر لە ماوەیەکی پتر لە پانزدە ساڵ خوێندمەوە، بیروڕایەک دەڵێ جیهان، بوونەوەر بە مەودا و کاتیەوە موتڵەقە، وەک یەک «نبض»ی هەمیشەیی کە تێپەڕیو و ئێستا و داهاتووی یەک ڕاستی سەرلەبەر پێک دەهێنێت، هەرچی وردە ناوەڕۆکی هەیەتی لە نێوان خۆیاندا گۆڕان و دوێنێ و ئیمڕۆ و سبەینێی بەسەردا دێت، جیهانەکە خۆی لە ئەزەلەوە بۆ ئەبەد بوونێکی هەیە لەو حیسابانە بەدەرە... لە لایەکی ترەوە بیردۆزیی «دووبارەبوونەوەی هەمیشەیی»ی جیهان کە گۆیا جارێ ئێستاکەی 15-20 ملیار ساڵێکی بەسەردا تێپەڕیوە... هتد... هتد...

خولاسە ئەم نەزەرییانە و چیی دیکەش هەبێ وەیا پەیدا ببێ بۆ کورد نابێتە ماڵ، چەنداکوو کۆمەڵە کوردێکیش بیخوێنن و تێیبگەن، تۆ دەبێ بزانیت کورد تەیارەچیی نییە با کوردیش هەبێ تەیارە لێبخوڕێت، چونکە نە فابریقەی تەیارە و نە تەیارەخانە و نە فێرگەی فڕین و نە بەنزینی تەیارە و نە ڕادار و نە... نە... نە... هەر هیچی سەر بە تەیارە دروستکردن و هەڵفڕاندن و دەوامەپێدانی هەیە، ئیتر بەو پێیە ڕێوبان و خەتی شەمەندەفەر و فابریقەی هیچ شتێکی نییە... ڕێگەیەکی حکوومەتی، بڵێین تورک، دەیکاتەوە بۆ ئاسانکردنی کوژانەوەی ئاژاوەی کوردان نەک هی کورد نییە بگرە، لەو نیازەدا، دوژمنی کوردە... بێگانەیی کورد لەو دروستکراو و بیناکراوانەی هەرێمی کوردستانی عێراق بەوەدا دیارە کە لە ماوەیەکی قیاسیدا خەڵکەکە، چ بەرپرسی حکوومەتی هەرێم چ ڕەعیەتەکە، هەمووی هەڵتەکاند و بە خووردەیی فرۆشتنی، کەست دیتووە خانووی خۆی هەڵتەکێنێ و داروپەردووی بە دەیەکە نرخ بفرۆشێت؟

ئێمە براله، ئێستا لە باشترین بەخۆدا هەڵگوتن، لە خەتی نێوان بوون و نەبووندا دەژیین، هەرچی زەبری وێرانکەری 2500 ساڵیی مێژوومان هەیە،

وەک دەردی ئێسقا، پێمانەوە دیارە... ئێمە لە دەرەوەی مێژوو... لە دەرەوەی فەلسەفە... لە دەرەوەی هەست بەخۆکردن دەژین...

- وەکوو مامۆستایەکی زانا لە بواری زمانەوانیشدا بە چەند بەرهەمێکی نایاب کتێبخانەی کوردیتان ڕازاندۆتەوە، کامانەن ئەو هەنگاوانەی کە لە سەرەڕێی پێکهێنانی زمانێکی یەکگرتووی کوردیدا پێویستە بنرێن؟

دەشێ یەکێکی بیەوێ بێ سەرێشە وەڵام بداتەوە، بە چەند قسەیەکی چەور و لووسی بێسوود و بێئەنجام و بەشێکی خوێنەری تینووش بۆ وشەی زرینگەدار لێی ڕازی بن لەو پرسیارە دەرباز بێ، بەڵام ڕاستییە بێفێڵەکە ئەوەیە کە تا ئەم دەمە هیچ چارەیەکی ئەم گرفتە زلە بە دەست چ کەس و چ لایەنێکەوە نییە: بەڵێ، گەلێک لە نووسەرانی سەر بە زمانەوانی دەتوانن بە ئارەزۆی خۆیان پێشنیازی چارەسەری کێشەکە بکەن، بەڵام سەرەڕای ئەستەمیی کارەکە خۆی، کەسی ئەوتۆ بە دوا بیروڕایاندا نایەت. هەروەک مومکین نییە بە ئامۆژگاری وڕێنموونیی پیتۆلانە فابریقەی شەکر وەیا تۆپ و تەیارە بە مامڵەتچیی کووچە و بازاڕ قوت بێتەوە، هەروەهاش سەپاندنی ڕێنووس و لەهجەیەکی دەستنیشانکراو بەسەر نووسەرانی کوردا نە بە تاکە نووسەر نە بە 100 و 200 یش ئەنجام دەدرێت. کاری ئەوتۆیی بە یاسای دەوڵەت نەبێ سەرناگرێت. دەوڵەتیش بە مەفهوومی جیهانی ڕوونبین، نەک بە دیدی تێکەڵ پێکەڵی تێک نەگەیشتووی لێک دڕدۆنگی ئێستاکەی کوردەواری.

لەگەڵ ئەمەشدا بەردەوامبوونی نووسەران بۆ ماوەی دەیان ساڵی ڕابردوو لەسەر جۆرە نووسینێکی نزیک لە زاری سلێمانی و سازاندنێکی بە لازم زانرابێت، لە لەهجەی جنووبی خۆی سەپاندووە، بەڵام زۆری ماوە هەموو بەشە سەرەکییانی ئاخاوتنی کوردی بێنە ئەم جغزەوە لەبەر سێ هۆی بنەڕەتی:

1- بابایەکی ئەرزەڕۆمی لە کوێوە دەرفەتی دەبێ ئەوەندە نووسینەوەی زاری سلێمانی بخوێنێتەوە و پێی ئاشنا بێت کە ڕەنگە نەزانێ ئەلفبای عەرەبی چییە! تۆ خۆت ئەگەر خەڵقی سلێمانی بیت و لێت داوا کرا خۆ ڕابهێنی بە نووسین و ئاخاوتنی ئەرزەڕۆمی، تا چەند گوێ دەدەیتە ئەو هەوڵەی یەکگرتنی زمانی ئەدەبیمان؟ لە حەفتاکان داوەتێکم بۆ هات لە بنگەیەکی سەقافیی سلێمانییەوە بۆ بەشداریکردن لە کۆبوونەوەیەکی ئەدیب و خاوەنڕای کورد بە نیازی خزمەتی سەقافەتی کوردی. لە خوارووی داوەتەکە نووسرابوو: هەر نووسینێکی بە زاری سلێمانی نەبێ فت دەکرێت. ئا ئەم هەڕەشەیە سەرلەبەری ڕۆشنبیرانی کوردی باکووری پاشگەز دەکاتەوە لە کۆبوونەوەکە. بەڵام دیتوومە نووسەری سلێمانی لە جیاتی «یازدە» نووسیوەتی «یانگزە» هەر چونکە پوورە حەلاو وەها دەچڕێ، خۆ پوورە موسرییەکیش هەیە لە ڕانیە جۆرێکی تری دەچڕێ.

لە نموونەی ئەستەمی ئیقناعکردنی ئاپۆرەی خوینەران ئەوە بوو کە لە حەفتاکاندا کۆڕی زانیاری کورد بۆ واوی تیژی درێژ پێشنیازی واوێکی سەر بە کەشیدەی کرد لە بری دوو واو. کەچی ئەو خوێنەرانە، پشت لە هەموو مەنتقێک، نینۆکی لە دوو واو گیر کرد و لەسەری سوور بوو... ! بە نەختێک دڵی ئارامەوە و مێشکی کرایەوەوە سەیری مەسەلەکە بکەیت وەک بەدیهییە ئاشکرایە نووسینی دوو پیت لە بری یەک دەنگ زرە هەڵەیەکە کە لە نیوەخوێندوو ناوەشێتەوە، تەنها لە حاڵەتی گوشینی دەنگ دەشێ بە دوو پیت بنووسرێت وەک کە بڵێی «مەککە»، لەوە بەولاوە عەیبە دڵ بۆ ئەوە بڕوات لە جیاتی «دور» بنووسرێت «دوور». هەڵبەت، پێداگرتنی ئەو نووسەرانە لە نوختەنیگای دوژمنایەتیی کۆڕ بوو نەک لە دڵسۆزی بۆ ڕێنووسی کوردی، گۆیا مادەم کورتەبزوێنی «ضمة» بە یەک «و» دەنووسرێت پێویستە واوی درێژ بە دوو «و» بنووسرێت، جا کە ئەمە قبووڵ بکرێت دەبێ دەنگی ئەلف بە دوو ئیشارەتی «فەتحە» بنووسرێت چونکە وا ڕۆیشتووە ئەلف فەتحەی درێژە (ڕاستییەکەی فەتحە درێژ بێتەوە نابێتە ئەلف چونکە هەڵستانەوەی

فەتحە شاقووڵی نییە بەڵکوو وەتەرییە). کە ئەم وردپێوییە هەڵەیە لەگەڵ «و»ی کۆڕ کرا دەبوو خەیاڵیش بۆ ئەوە بچێت کە واوی کورتەبزوێن «و»ی بۆ دانرا ناشێ هەمان پیت بۆ واوی کۆنسنانت بێت. دەنگی واوی کورت لە بەرایی وشەوە نایەت چونکە بزوێن بە دوا کۆنسنانتدا دێت... خولاسە، باسەکە وەک هەر باسێکی ئەوتۆیی لە کوردیدا، کە بەر لە پەرۆش بۆ بابەت، لایەنی ناوچەیی و دوژمنایەتیی ئایدیۆلۆجی خۆی ڕەپێش دەکات، بەسفتوسۆیە و لێدوانی بێئەنجامە... چیتر بە دوای باسەکە ناکەوم.

- فیکر و سیاسەت زۆر تێکئاڵاو و پێکەڵپێکن، بەرودواخستنی یەکێکیان لەوی دیکەیان یاخود خستنەکاری یەکێکیان بۆ خزمەتی ئەوی دیکەیان لێرە و لەوێ بۆچوونی جیاوازی لەسەر هەیە، لە ڕوانگەی بیروباوەڕی بەڕێزتانەوە بایەخیی کامیان پێشترە؟

وەک من بۆی دەچم، سیاسەت و فکر بە مەفهوومی وشەی «پێکەڵپێک» دەبنە هاوتای دوو سەنگی لەنگەربەستووی تەرازوویەک، لەمەشدا چەند تێبینیەک بە خەبەر دێت، یەکیان ئەوەیە، فکر جیهانێکی بەربڵاو دەداتە بەر ئەندێشە و لێکدانەوە، کە بابای سیاسی، بە زۆری، لەکەڵکەڵەی هەڵسووڕاندنی باری ئارامی و گوزەران و چەنگە چڕەی بەرهەڵستان و دابینکردنی خوازی خەڵک دەبێت، مادەم خۆی لە حوکمدا بێ و بە حاڵ دەرفەتی دەبێ چاو بە دەمەتەقەی نێوان فەیلەسووف و ئەدیب و هونەرەکاندا بگێڕێت و تەنانەت ئەگەر کابرا پێشتر «فکریار» بووبێت کە بوو بە سیاسی بەلای کەمەوە نیوەی مەراقی فکری لە بیر دەچێتەوە. من نموونەیەکی مرۆی ئەوتۆی لە مەرحووم عەلی حەیدەر سلێمانی ڕەواندزیدا دەبینم، کە لە سەرەتای پێگەیشتنی و هەر لە ساڵی 1930 کە لە زانکۆی ئەمەریکایی، بێرووت، دەرچوو کتێبێکی دانا، بە عەرەبی، «تأريخ الحضارة الاوروپية الحديثة» تا بڵێی بۆ ئەو سەردەمە، کە من 1935 هاتە بەرچاوم، نایاب بوو، بەڵام دواتر کەوتە

جغزی سیاسەت و بوو بە نوێنەر و وەزیر و چی و چی... وازی لە فکر و تەئلیف هێنا هەتا دوای نیشتەجێبوونی، کە کتێبەکەی بیرتراند ڕەسڵی وەرگێڕا سەر عەرەبی و دوای شەش ساڵی پاش 1978، ئەوجا توانیی لە 1985 بیخاتە بەر چاپ (ڕاستتر ئەوەیە بڵێم لە 1985 چاپەکەی بە کۆتایی گەیشت). تێبینیی دووەم ئەوەیە، هەرچەند سیاسەت لەلایەن بینینەوە بەرتەسکترە لە فکر، دیسانەوە بەپێی 1- دەسەڵات و 2- بەپێی داخوازیی حاڵ مرۆی سیاسی باوەش بە فکری فەیلەسووفدا دادەگرێ و دەیکاتە پلەی پلیکانەیەک کە ئامانجە سیاسییەکەی پێ سەردەیەخێت و خۆیشی لەگەڵدا... واش دەبێ سیاسییەکە لەو مەیدانەدا جارێ بەرێوەیە گرفتێکی دێتە بەر لە حوکم لا دەچێت و لەچاو فکریار دەبێتە بۆرەپیاو. تێبینیی سێیەم ئەوەیە لە وڵاتی خۆمانئاساییدا، سیاسیی حوکم بەدەست، بیریار و ئەدیبیار و هونەریار و دینیار و یار و نەیار وەکوو گەنمی هەڕەمە بە گەرۆمەی ئاشی پڕوپاگەندەدا دەکات و خەپڵەی ڕەق و تەق و پاقلاوەشی لێ ساز دەدات. تێبینیی چوارەم، فکریش لە هەڵکەوتدا (کە وڵاتەکەی پێشکەوتوو و دیمۆکرات بێ) سیاسەت دەکات بە فەقەرەیەکی کەلێنگری بیروڕای خۆی لەو باسانەدا کە دەخلیان بەسەر سیاسەت و ئابووری و ئازادی و دیلییەوە هەبێ. فکر بێ ئەوەی مەبەسی بێ بە بەریەوە هەیە ئەندێشەی سیاسی و ناسیاسی ڕابکێشێت و گەورەترین نموونە لەم مەیدانەدا بیروڕای «فکریار»ەکانی پاش ڕینێسانس بوو، تین و تاوی دا بە شۆڕشی 1789ی فەرەنسە و زەمینە ڕەوایی بۆ گۆڕینی حوکم هەڵنا. لە قیاسدا شۆڕشی ئۆکتۆبەر بە پاڵپشتی مارکسیزم، بە بیردا دێت بەڵام جوداوازیی نێوان هەردوو حاڵەت لێ ناگەڕێ فەلسەفەی جان جاک ڕۆسۆ و هاوبیرەکانی تری بەر لە خۆی بە مارکسیزمێک بگیرێ کە خۆبەختکەرانی بۆلشەفیزم بە زەبری کوتەک کۆمیونیزمیان بەسەر شۆڕشی شوباتدا سەپاند... تێبینیی پێنجەم سفتوسۆی لەگەڵدایە کە بیریار فڕکەی دەمارانی دەکات بە بیروڕای ڕوونکەرەوەی ڕێگەی بەرەو ئازادیی و ڕوومەتی ئادەمزاد، کەچی سیاسییەکی قەمچیوەشێن پشتەدەستێک لە شەویلەی

ڕادەکێشێت و چەناگەی خوار دەکاتەوە (ئەم درِندە ڕەفتارە لە حوکمی دیکتاتۆرایەتیی ولاّتی دواکەوتوو و هەندێ ولاّتی وەکوو ئەلّمانیای هیتلەردا دەدیتریّت).

لەم بوارانەدا حالّەتێک بە بیردا دێت، کە هەم لە کرداری سیاسیی حاکم و هەم لە گەلێک بۆچوونی بیریاراندا بەدەر دەداتەوە، ئەویش ڕەپێش خستنی سوودی کۆمەڵ بەسەر سوودی تاکدایە. سیاسی، باخصووص لە ولاّتی جیهانی صەد و سێیەمدا، بەهانەیەکی بە دەستەوەیە لە خۆگێلکردن بەرانبەر مافی تاک بە نامەی زێدەگرنگیی مافی کۆمەڵ. ئەم بایەخدانە بە مافی گەل ئەگەر هەمیشەکات خەڵکەکە پاسەوانی مافی تاک نەبێت لە ئاکامدا حاکمی تەماعکار و بێویژدان هەر بە ناوی پاراستنی مافی گەل هەموو تاکێک دەدۆشێت و ڕووتیان دەکاتەوە. بە چاوی عادەتی سەیری جیهانی مرۆ بکەین دەبینین و دەزانین هەر تاکە مرۆیەک بوونی سەربەخۆی هەیە و لوقمەی سەربەخۆ دەخوات و جلی سەربەخۆ لەبەر دەکات و سەربەخۆ زەرەر دەبینێت و سەربەخۆ فیداکاری خاک و میللەت دەبێ. ئەو تاکە نە وەکیل دەگرێ بۆ وەتەنییەت و نە وەکیلیش دادەنێ لەبری ئەو لوقمە بخوات و جلک لەبەر بکات... حاکمی ولاّتی دواکەوتوو خۆ دەکاتە وەکیلی هەموو تاکەکان لە ڕێی خۆ بە وەکیل دانانی هەموو میللەت... دەبێ بزانین و پێ لەسەر ئەوە داگرین کە مافی تێکڕای تاکەکان دەبێتە مافی گەل. چەندێکی لە خۆشی و کامەرانیی تاک دابشکێت لە خەرمانی میللەت، گەل، نەتەوە کەم دەکاتەوە... بیریاری خاوەن دڵ و دەروون و مێشکی ڕوون هەمیشە مافی تاک بە بەردی بناخەی کۆمەڵایەتیی مرۆدۆست دادەنێت. هەڵبەت ئەم تاکنەوازییە دینێک نییە لە خۆوە هەمەگیر بێ و خەیاڵ بۆ ئەوە بڕوات لە ئاکامدا گەشەی تاک لەسەر حیسابی کۆمەڵ پێک بێت. چونکە ئەو کۆمەڵە هەر خۆی ملیۆنەها تاکە نەک بوونەوەرێکی ئەفسانەیی جودا بێ لە تاکەکان. بەڵێ، دز و تەماعکار و قۆڵبڕ و قاچاغچی و بێویژدان و... و... هەن لە خۆیان بەولاوە نە کۆمەڵ نە تاک بە فلسێک ناکڕن، بەڵام ئەمانە لە هەموو

پێوانەیەکی سەر بە واتای کۆمەڵایەتی بەدەرن و مامڵەی تاوانباریان لەگەڵدا دەکرێت... ئێمە ئەگەر بسەلمێنین تاک پاشکۆی گەلە، بێگومان، شتێک نامێنێتەوە لە شیرازەی ساختی کۆمەڵایەتی بتوانێ مافی کۆمەڵ بپارێزێت، جونکە تێکڕای کۆمەڵ دەبێتە پاشکۆ، ئەوسا هەر دەمێنێتەوە کەسانی حیلەباز و درۆساز و زارقەڵەباڵغ و لە خشتەبەر و کاوێژکەری «بەهەشتی خوا لەسەر ئەرز» ببنە وەکیلی گەل و دوولینگانە بە شان و ملی تاکاندا بهێننە خوار، هەر ئەم سیاسەتەیشە لەبەشی زۆری جیهانی سێیەم و بیستەم و سییەمدا لە کاردایە. دەشێ بزانین ئەوانەی بە شۆڕش دەبنە حکوومەت و قەمچیوەشێن پتر لە بابایەکی وەیا دەستەیەکی بێ شۆڕش و بە فەرمانی واقیع دەگەنە حوکم (چونکە دەبێ حکوومەت هەبێ) ئا ئەو شۆڕشگێرانە سەدان جار نازۆتر و دەنگدلێرتر و بێپەروا تاک دەپلیشێننەوە، با ئەو تاکە زاخارۆف بێت. ئینجیلی «گەل خاوەنی بەرژەوەندە» فرزەی هەموو ناڕەزامەندییەک دەبڕێت... تێبینی و وردە حیسابانی بێ ئەژمار هەیە بێتە ناو جغزی پرسیارەکەوە، من بەو چەند دێڕەی خوارەوە واز دەهێنم لە درێژەی کێشەکە:

فکر و فەلسەفە و بیردۆزی، هەر چونکە مەیدانی چالاکییان بێسنوورە و کەرەستەی خۆهەڵنانیان بریتییە لە «وشە» و پەکی لەسەر ئاسن و نەوت و فابریقە و چی و چی نەکەوتووە، دوو ئاکامی سەرەکییان لێ وەدی دێت. یەکیان ئەوەیە کە دەشێ جیهانی فکر هەزاران جۆری لێکدانەوەی سەربەخۆی تێدا هەڵتۆقێ و لە هەمان کاتدا خەڵکیش بە دوویان بکەون، (بەمەرجی خوێندەواری) بە خصوص کە فکرەکە سەر بە عاتیفە بوو، ئیتر قیامەتی یا دنیایی! لە ئاشکراش ئاشکراترە تەمای قیامەت کە کەوتە دڵان پتر لە فەلسەفەی خوێنسارد خەڵک ڕادەکێشێت. ئومێدی ژیانەوەی پاش مردن تەکاندەرێکی بە تەوژمە بەرەو ئەو لایەنەی ئومێدبەخشە... شێخ ڕەزا گوتەنی: ئەگەر قیامەتەکە هەبوو قازانجێکمان کردووە لەو نوێژ و ڕۆژییە، ئەگەر نەبوو چ زەرەرێکی ئەوتۆمان لێ نەکەوتووە. ڕاستییەکەی

کۆمیۆنیزمیش بەڵێنی بەهەشتی سەر دنیا دەکاتە چەشەی ڕەش و ڕووت ڕاکێش...

ئاکامی دوەم ئەوەیە کە دەشێ جوداوازیی فکر لە یەکێکەوە بۆ یەکێکی دیکە بە 180 پلە پشت لەیەکتر بن و لە هیچ شتێکا بە یەکتر نەگەن. بێگومان فرەیی نەفسییەتی فکریار ڕووداوی کاریگەر، ڕەخسانی مامۆستای دەرسدەر، فرەیی بابەتی لێکدانەوە، مەتەڵی هەبوون خۆی، دیاردەکانی سەر بە نەفس و دەروون، نامۆیی سروشت، بە تایبەتی موعجیزەکانی گیان، زیندوەتیی... پێشبینی، دوورە سۆسە، خەونی ڕاست... و... هتد! ئەوجا مێشکی مرۆ بە بەریەوە هەیە لە تێکەڵکردنی جۆرەها بیر ژمارەیەکی بێسنوور لە باوەڕی ئاوێتە بسازێنێت هەر وەک لە سێ دەنگی ئاخاوتن صەدان هەزار وشە دەسازێنێت. بێگومان لە نێوان چەندین فکری سەر بە یەک بابەت ناشێ پتر یەکێکیان ڕاست بێت، ڕەنگە هەر هیچی ڕاست نەبێت. ئەمەیش دەردەسەرێکە لێ ڕزگاربوونی نییە و تا ڕۆژگارێکی دووری داهاتووش بەردەوام دەبێ...

سیاسەت، چەندێکی لایەنی فکر بلاوێنێتەوە، چونکە بەندە بە کردەوە ناتوانێ مرخی خۆی خۆش بکات لە هەڵبژاردنی ڕێگەی تێراڕۆیشتن بۆ چارەسەرکردنی گیروگرفت، زۆر جارانیش تاکە یەک ڕێگەی کرایەوە نامێنێ تێیرا بڕوات، ئیتر تەنگانە -أزمة- یەخەی دەگرێت و لە وڵاتی پێشکەوتوو لایەنی بەرپرسی حوکم دەست لە کار دەکێشێتەوە. لە وڵاتی خۆمانئاسایی حوکمدار نازانێ ئەزمە و مەزمە چییە، بایی دامرکاندنی حەزی خۆی واقیع هەڵدەگوشێ و تا دوا دڵۆپی خوێن لە بنیادەم، و شیر لە مەڕ و بزن، دەدۆشێت، خواش کەریمە بۆ مانگ و دوومانگی لێرەبە دواوە.

جۆری ڕارەوی سیاسی (و ئابووری لەگەڵدا) لەچاو جۆری لێکدانەوەی فکر هەتا بڵێی کەمئەژمارە. جارێ لە پێشەوە دەبێ بڵێین، وڵاتی دواکەوتوو سیاسەت و ئابوورییەکەی وەک خودایی نابێت، بێ پێناسە و بێ بەرنامە و بێ

بنکەی فراژیبوون و خۆڕاگرتن گەشتی بێ ئامانج لە واقیعی ئیفلیج دەکات بە پێی ئارەزۆی دەبەنگ و هەنگاوبڵاویی دەسەڵاتدارەکەی. هەر ناوێکی لێی بنێت، وەک گوێزی سەر هێلکە، پێوەی بەند نابێت...

لە باسێکی خەندەبزێوی کۆندا هاتووە، کابرایەک گەیشتە شارێک دەمی عەسر بوو، بیستی بابای بانگدەر «مؤذن» دەڵێ: أشهد ان اهل البلد يقولون محمد رسول الله... ڕۆیی بۆ لای قازی... لە وەڵامدا قازی گوتی، مسڵمانی دەنگخۆشمان چنگ نەکەوت، ئەم جوولەکەیەمان بە کرێ گرت، دەنگی خۆش بوو، هەڵبەت دەبێ وەها بڵێ...

مشير عبدالحكيم عامر، وەزیری جەنگی میسر، میزانییەی هەموو هێزی چەکداری میسری قفڵ دابوو، کلیلی قفڵەکەشی لای خۆی... دواتر حکوومەت پەیدا بوون لە بنەڕەتەوە میزانییەی قەراردادەیان نییە، کەیفی سەرۆکی دەوڵەت و منداڵانی میزانییەیە.

کە ڕاگوێزین بۆ دەوڵەتی بنیادەمان لەوێشدا دەبینین ژمارەی جۆری ڕێژیم لەچاو جۆری لێکدانەوە و فکر و فەلسەفە هیچ دەرناچێت، هەر چونکی بەڕێوەبردنی گوزەران و ئاساییش و خۆڕاگری کاری کەیفە و ئارەزۆ نییە بە پێی مجێز کورت و درێژ و سەوز و سوور بێت، داخوازیی حاڵ و دەسەڵاتی خاوەنماڵ ڕێژیمەکە ناو دەنێ و دیاریشە ئەو خەڵقەی لەو وڵاتانە ژیانێکی لێک نزیک بەسەر دەبەن کە لە پلەی شارستانەتییان دەوەشێتەوە، هەمان حاڵ، لە سێبەری ڕێژیمی لێک نزیک دەژین.

لە لایەن بایەخی ئەم و ئەویان، سیاسەت و فکر، کە بە گەز و گرێ بیانپێوین و بە عەیارە و تەرازوویەک هەڵیانکێشین، تا بڵێی ئەستەمە یەکیان بەسەر ئەوی دیکەدا هەڵاوێرین. دەزانم فکر پێناسەی بنەڕەتی مرۆیە چونکە بێ فکر و هۆش مرۆ پەیدا نابێ، کەچی دەشی مرۆ هەبێت و سیاسەت نەبێت، وەک کە لە هەزاران ساڵی لەمەوپێش، سیاسەت سێبەریشی نەبووە، لە گەلێک شوێنی بەدبەختی ئەم جیهانەش سیاسەت بۆتە مەرگی خەڵقەکە، کە لەجیاتی

ئەوەی بە تیروکەمان یەکتر بکوژن، وا لەوەتەی حکوومەتیان پەیدا بووە بە تۆپ و ساروخ نەوازشی یەکتر دەکەن. لەو دەمانەدا کە جارێ سیاسەت پەیدا نەبووبوو، فکر چەندێکیش کز بووبێ لە کاردا بووە و تەفسیری هەڵەی بۆ دیاردەکانی سروشت هێناوەتەوە و هێزێکی نادیاری پەرستووە و سەرەدەریی لە چاندن و ئاژەڵداری کردووە...

خولاسە پێناسەی مرۆڤ کە هۆش بووە هەزاران ساڵ بەر لە سیاسەت و ئابووری پشکووتوە. بێگومان لایەنی گوزەران و خۆژیاندن هەمیشە لە گەڕدا بووە، بێ ئەوەی ئابووریی لێ پاشکەوت بووبێ تا دێرزەمانێکی دەیان هەزار ساڵی (وا باشە ساڵەکان و ژمارەیان بۆ پسپۆڕی ئەنترۆپۆلۆجی بەجێ بهێڵین چونکە تەخمینی ئێمەمانان جۆرێکە لە ڕەمڵ لێدان). کە سەرەتای ئابووریش پشکووت جارێ زۆری مابوو سیاسەتی لێ بەر بێتەوە. وەک بزانم سیاسەت و حکوومەت تێک بەستراون، ئەم ڕستەیەش لەوەوە دێ کە ئامانجی گەیشتن بە دەسەڵاتی وەیا بەشێکی وڵاتێک، جۆرێک پلان و ڕەفتاری دەوێت تایبەتە بەو ئامانجە. کە بێین نموونەی ڕوونکەرەوە بهێنین حاڵی سەرۆک عەشیرەت بە حاڵی سەرۆک دەوڵەت یاخود والیی هەرێمێک بگرین، سەرۆک عەشیرەت پتر پشت دەبەستێ بە ددان و بە نینۆک. هەرچی سەرۆک دەوڵەتە لە زۆر ڕووەوە ناچاری دیپلۆماسییەتە هەر نەبێ لەبەر زێدە بەربڵاویی وڵاتەکەی کە چەندین سەرۆک عەشیرەتی تێدایە، ئنجا دەورە دراوە بە حکوومەتان... ئنجا کەسانی لە خۆ ڕادیتوو زۆر چاویان بڕیبێتە سەرۆکایەتییەکە. خۆ لە وڵاتی کۆماری، بە عادەت، لە چەند ساڵێکدا سەرۆک کۆمار دەوری بەسەر دەچێت و دەبێ تێ بئاڵێتەوە بۆ تازە گۆڕەوشارێک، ئەوساش هەموو ڕابوردووی چەند ساڵی سەرۆکایەتییەکەی لێ بەخەبەر دێتەوە و لەجیاتی دوو فریشتەی سەرشانی عەبدی خوا هەزار چاوی حیزب و ڕۆژنامە و ڕیپۆرتاژنووس و وەکالەتی خەبەران لێی ڕاست دەبنەوە و «نەرۆی شازدە»ی لێ دەچڕن.

بە کورتی، ئەگەر قسەمان لەسەر پلەی شارستانیەتی ئێستاکە بێ، فکر و سیاسەت هەردوویان وەکوو مووی لووت بە مرۆڤایەتییەوە نووساون. کە

بچینەوە بۆ سەرەتاکانی پەیدابوونی «مرۆڤایەتی» فکر بە کزی هەر هەبووە و سیاسەت لە پزدانی کۆمەڵگەی ئەوسای ئادەمیزاد نەڕسکابوو، زۆر بە درەنگەوە، لەچاو فکر، هۆش و پەرۆشی تاک و کۆمەڵی بە خۆیەوە خەریک کرد.

دوارۆژ، بەلای باوەڕی منەوە، لە دەست سیاسەت ڕەها دەبێ و دەکەوێتە بەر فەرمانی زانست و تەکنیک و هونەر و جوانکاری و لایەنە پەسەندەکانی هێزی هۆش، بەڵام مەرجێک لە نێواندایە ناشێ هەرگیز لێی بێباک بین، دەبێ مانەوەی عیفریتی هەڕەشەی ئاتۆم لە گومگومی سەرمۆردا سیگۆرتە بکرێت، ئەگەرنا، بە بێ سیگۆرتە ڕۆژێک لە ڕۆژان دەردەپەڕێت و کاکە مرۆ ئۆغرت بەخێر!!

- تا ئێستا مشتومڕێکی زۆر بە دەوری پێناسەی «ڕۆشنبیر»دا هەیە، هەر خۆ بە ڕۆشنبیرزانێک بە پێی خوایشتی ڕێبازەکەی ناسنامەیەکی هەڵگرتووە، لە دیدی ئێوەوە ڕۆشنبیر کێیە، ئەو خەسڵەتانەی پێویستە لە ڕۆشنبیردا هەبن چین؟

بەلای باوەڕی منەوە ڕۆشنبیر کەسێکە لەگەڵ مانای وشەکە گونجاو بێ. دەبێ بیریار بێت و بیرەکەشی ڕوون بێت. هەم لەلایەن ڕاگەیاندنی پاتەوپاتەوە کە ڕووناکییە، هەم لەلایەن ئەو ئاکار و ئەخلاقەی لە مرۆی دروستبین دەوەشێتەوە. بابایەکی خۆ تەیار بکات بە زانست و تەکنیکی ئەزەل و ئەبەد بە نیازی لە خشتەبردنی خەڵک وەیا کردنەوەی قاسەی مجەوهەرات وەیا لە نانەوەی فیتنە... ڕەنگە پێی بگوترێ بلیمەت، بەڵام لەگەڵ «ڕۆشن» بە هیچ جۆرێک خزم نابێت... حیکایەتەکە لەوەندەدا کۆتایی نایەت...

سەیری ئەم جیهانەی ئادەمیزاد بکە و بێ کۆمەکردن و لایەنگیری و دژایەتی و بە دڵێکی ئارامەوە سەرنجی لێ بگرە و فکر و هۆشی تێدا بگێڕە، دەبینیت بەشی هەرە زۆری هەرای نێوان خەڵقوڵڵا ئەوەیە کە لە نێوان تاقمی ڕۆشنبیراندایە، واتە ڕۆشنبیریی بە پێی پێوانە و کێشانەی سەردەم لە بارێکدایە بە کردەوەی خۆی بەڵگەی «ڕۆشنبیربوونی خۆی» بە دەستەوە دەدات، لەو ڕووەوە کە ناشێ دوو لایەنی دژ بە یەکتر لە کێشەیەکدا، هەردوویان، ڕاست و دروست بن، خۆ ڕۆشنبیری شۆڕشگێڕ و پێشەنگ، لە خیانەت کەمتر وەپاڵ ناحەزەکەی نادات، ئیتر هەموو لایەنە خەباتگێڕەکان و شۆڕشاوییەکان کە یەخەی یەکتریان گرتووە و دەگرن بە شایەدیی «شۆڕشگێڕان»، نەک دەرەبەگ و ئیستیعمار، خیانەتیان بە ئیسپات دەگات، ئەوجا بۆ ئەوەی لەو تاوانەیان ڕزگار بکەین، هەر ئەو پەندە فەلسەفییە هۆشپەسەندە دەست دەدات کە بڵێین، عالەموڵڵا! شۆڕشگێڕەکانمان هەموویان درۆزنن، بۆیە دەتوانین بڵێین خائین نین، ئەمما هیچ نەزان و تاوگیر و تاریکبیرن، بەخێر کە شەیتانیان پێ پێکەنی، عەقڵێک دێتە کەللەیان...

خۆزی فەلاکەتی خیانەت وەپاڵ دانی شۆڕشگێڕ لە شۆڕشگێڕەوە، هەر ئەوە دەبوو کە لە نێوان دوو نەتەوەدا و لە حاڵەتی تێک هەڵقژانیان ڕووی دابایە... زۆر بە سەیری ئەم ئیحتیماڵە کز دەبێتەوە لەتەک نەعرەتەی دلێرانەی یەکتر تاوانبار کردنی شۆڕشگێڕانی یەک نەتەوەدا وەک کە کورد و ئەفغان و کوێ و کوێ دەیکات...

برای ئازیز!! من کە دێم لە نەرمونیانیی دارشتنی پرسیارەکەت هەڵدێم و بۆ سەر چەقی بەردی ڕەقی واقیعی شەق و پەق، پەرۆشێکی شڕ و دڕ و هەناسەبڕ پاڵم پێوە دەنێ بۆ گەیاندنی سەرەپەنجەی خوێنەر بە ئاگری سوتێنەری تراجیکۆمیکی کارنیڤاڵی «خۆ خنکاندنی دوو برا بە پەتێک». تێکڕای دیمەنی تێک بەربوونی «ڕۆشنبیر»ان چ لە جغزی یەک نەتەوەدا و چ لە جغزی جیهانی بەربڵاودا، کە ئەگەر ناوێکی پڕ بە پێستی خۆی بۆ بدۆزینەوە لەوە باشتر دەست ناکەوێ کە پێی بگوترێ «خەستەخانەی

شێتان» ئا ئەم ڕاستییە یەکسەر و یەکەندەردوو سیفەتی ڕۆشنبیریی لەو ئاکتەرانەی سەر شانۆی ئاهەنگی ماسکرێد دەسڕێتەوە و نێوێکی وەک قەسابی بنیادەمان یان دڕندەی گێل کە گۆشتی نێچیرەکەی ناخوات پێیان ڕەوا دەدیترێت... نووسرابوو، لە دەمی جەنگی دوەم، کە مستەر چەرچل لە سەردانێکی دانیشتووی ئەفەریقای ڕەش لەلایەن سەرەک عەشیرەتێکی ئادەمیخۆرەوە پێی گوترا، لەو شەڕەدا گۆشتی بێ مزەی بنیادەمتان زۆرە... چەرچل گوتوبووی ئێمە گۆشتی بنیادەم ناخۆین... کابرای ڕەش پێی گوتبۆوە کە گۆشتەکەی ناخۆن ئەدی بۆچی یەکتر دەکوژن؟ بە عەقڵی کابرای ڕەش دەبوو لە جیاتی مرۆ کوشتن کە گۆشتەکەی ناخورێ خەڵکەکە خەریکی ڕاوەماسی بێ!!

ئەو ئاپۆرەی یەخەی یەکتری گرتووی، بە ناو، ڕۆشنبیر تاک و تەرایەکی تێدایە لێشاوکەی سەرشێتان ڕامالّی داون بۆ تەندوورەی لووزەوی فێگرتووی کەف دەرکردووی خۆدۆڕاندووی تەپڵی بنی دۆزەخی دڕندەیی و تاریکبیریی... ئەم تاک و تەرایە لە شانۆگەرییەکەی ماسکرێددا دەبن بە مرۆی تار و ڕیزپەڕ و تەلی ناجۆری مۆسیقای ئادەمیکوژی!

بێ دوودڵی و گومان و زمانگرتن دەڵێم، ئەو صەدان ملیۆنەی بەناو ڕۆشنبیر، کە خۆشکەرەوەی ئاگری ناکۆکین و دەشبن بە سووتەمەنی، ببڕای ببڕای و بە هیچ جۆرێک و لە هیچ ڕوویەکەوە، نەک هەر ڕۆشنبیر نین بگرە مرۆی عادەتیش نین، بەڵام واقیع هەڵناگرێ و پێی ناکرێ سزایان بدات.

کاکی خاوەن پرسیار و کاکی خوێنەر.

ڕۆشنبیری بێفێڵ و حەقیقی کەسانێکن، بە دەم ڕۆژگارەوە و بە لێکدانەوەی بێ پچران و هەوڵی چاوساغانە و بە یاریدەی زانستی سەردەم توانیبێتییان خەریتەیەکی جیهان ساز بدەن کە هەموو ناوەڕۆک و ڕواڵەتی لەگەڵ یەکتردا گونجاو و سازاو و یەکتر تەصدیقکەر بن و هیچ زەڕڕەیێکی لە شوێنی خۆیدا لەق نەبێ، هەر لەقییەک هەبێت بێگومان هی ناتەواویی زانینە، چونکە جیهان

سەرتاسەر و بەیەکەوە بەستراو و بێ کۆتایی و ڕاست و دروستە لەگەڵ خۆیدا. کە ئەستێرەیەکی زل بتەقێ ڕاستبوونی دەستوورەکانی جیهان دەسەلمێنێ، ئەگەر نەتەقیبایە ئیشکال پەیدا دەبوو، تەنانەت ئەم دیاردەیەی گومڕایی بەرەی خەباتگێڕ و خۆبەختکەران، لەم ڕۆژانەی نیوەی یەکەمی مانگی ئابی 1996 کە ئەم دێڕانەی تێدا دەنووسم، ئا ئەم دیاردەیە ئەنجامی موعادەلەیەکە کە بریتییە لە

1. تەسکیی پۆڕگی لایەنی «عقلانییەت»ی خەڵک.
2. زیدە فرەیی ئەو کاریگەرە ئەرێتی و نەرێتییانەی کە واقیعی کۆمەڵایەتی و سروشت و دەوروبەری پێ ئاخناوە.
3. گوشاری نەفسی حەزۆک کە یەکجار بە درەنگەوە خۆی لە بیر دەکات (وا دەبێ نەفسەکە بە جانفیدایی بۆ بوتێکی ئادەمی حەزەکەی دابین دەکات).
4. هۆیەکانی سەرشێواندن و تەما وەبەرنان و ترساندن و... و...
5. هۆی دیکەش کە ئێستا من بۆی ناچم.

بەو پێیە، ڕووداو لە سروشت بێ یان لە کۆمەڵایەتی، زادەی بێ دەمەتەقەی ئەسبابێکن کە ئەم جۆرە بەبیلەیەی لێ بەردەبێتەوە، بەڵام!! دیسانەوە بەڵام! جیهانی مرۆ شەقڵێکی جوداکەرەوەی هەیە لەتەک سروشتدا ئەویش کاریگەریی «ئیرادەی بە هۆشەوە بەستراو»ە نەک غەریزە... کە هۆش دەنگ ناکات غەریزە ڕێی خۆی دەگرێتە بەر چ مرۆ بێ چ مەیموون و پشیلە. کاریگەریی هۆش لەوانەیە ئەنجامی کۆمەڵێک هۆی کاریگەر بە تێبینیەکی کەمبایەخ بگۆڕێت، واتە «حتمیة»ی ڕووداوی سەر بە سروشت و سەر بە غەریزە، هەموو جاران، لە کردەوەی مرۆ پەیدا نییە. ئەم ڕاستییەش وەها دەکا مرۆ بەرپرسی کردەوەی خۆی بێت. بە کورتی، ئاکامی هۆیەکانی کە کردەوەی مرۆ پێک دەهێنن، لە گەلێک حاڵوباردا سیفەتی «احتمالی»

وەردەگرن. لە میسالدا دەڵێم، لەوانەیە کۆمەڵێک هاندەر دارا بخەنە سەر دەستدرێژی کردن لە خولە کەچی کۆنە هەڵوێستێکی مەردانەی خولە بە بیری دارا دێتەوە و دەستی دەگرێت. حیکایەت دەکرێ، دزێک لە دەمی خەریکبوون بە ڕاگوێستنی کەلوپەلی ماڵێک شتێکی ورد لە قاپێکدا دێتە بەر پەنجەکانی کە تامی کرد خوێ دەرچوو. گورج بە هاوڕێکانی گوت، نمەکی ئەم ماڵەم کرد تازە دەبێتە حەرامزادەیی لێی بدزم.

لەم قسانەدا ڕۆشنبیر و تاریکبیر تێکەڵ بەیەکتر بوون، هەر دەشێ بە جۆرێک لە جۆران بگەنەوە یەکتر چونکە هەمووی هەر مرۆیە تا ئەوەی دەشێ ڕۆشنبیری جیهانناس و ئەندازەگرتووی هەموو قوژبنێکی جیهان سەبەب بە مەیلێکی زێدە بەهێزی نەخۆشییەکی دەروونی، لە دەرفەتدا، ڕەفتاری ساوایانە وەیا شێتانە وەیا دڕندانە بکات کەچی بابایەکی نەزان و سۆفیمەشرەب هێندەی فرشتە پاک بێت... ئەو ڕۆشنبیرانەی!!! خەریکی یەکتر بڕینەوەن بە مەیدانەهای فەلەکی دوورن لەوەی من بە ڕۆشنبیری ڕاستینەی دادەنێم. کەسێک خەریکی براکوژی و دراوسێ بڕینەوە بێ بە تەنەکە و بەرمیلیش ڕۆشنایی تێ بکەیت شەرەفی سەگێکی مێگەلپارێزی نابێت. تۆ سەیری باخەڵی بکە و سەڵەواتی بۆ لێدە!!

ساڵی exodus ی کوردی عێراق بەرەو کوردستانی ئێران و تورکیا، من گەیشتمە ورمێ... حەجێکی بارەگای «سروە»ی پیرۆز و نازۆم کرد... لە حەجی دووەمدا، وەک لە بیرمە، لە خزمەت مامۆستا ئەحمەدی قازی و هەواڵەکانی بە ناو گەلێک بابەتی سەر بە فیکر و لێکدانەوە و مەتەڵی سروشت و جیهانی گیانلەبەر منیان هێنا و برد، تا مامۆستا ئەحمەد لێمی پرسی، تۆ کە خەریکی ئەم تەرزە ئەندێشانەیت چۆن دەتپەرژێ (وشەی - دەتپەرژێ- قاڵبێکی دیکەشی هەیە دەگوترێ- ناپەرژێت، دەپەرژێم- هەردوو قاڵب دەستوورین) لەگەڵ کوردایەتی خەریک بیت؟ عەرزم کردەوە: من کە یەقینم بە «موتڵەق»ەوە بەستراوەتەوە کوردایەتییەکەم «مەوسمی — هی کژوکات» نییە، بێگۆڕانە، ئەگەر بزانم کەمایەتیی نەتەوەیەک بە دەست

کوردەوە مەغدووورە من لایەنی ئەو کەمایەتییە دەگرم لە نوختەنەزەری مەغدوورییەتەکەوە. شەڵڵا مامۆستا ئەحمەد وتوویژەکەی باشتر لەبیر مابێ، چونکە من کەسم بە دەورەوە نییە لە بەغدا، حازری ئەو مەجلیسە بێت و قسەکانم بە بیردا بهێنێتەوە...

لە تێکڕای هەڕەمەی بیروڕاکانمدا بۆت ڕوون دەبێتەوە، ڕۆشنبیری ڕاست و دروست و تەیار لەچاو ژمارەی لە ملیارەها نارۆشنبیر و تاریکبیر و نەفسگورگین و ویژدانوێران ئەوەندە کەمئەژمارە، دەشێ ئەژماری پێوە بەند نەبێ... هەرچەند زەحمەتە نیسبەتێک ڕەچاو بکرێت بۆ ڕۆشنبیری ڕاستینە، دیسانەوە بە نیازی نزیککردنەوەی کێشەکە لە زەینی خوێنەر دەشێ بڵێم، لە دەهەزار کەس، ڕەنگە تاکێک هەبێ لە دەروونداا هێندە ڕوون بێ و بۆشی ڕێک کەوتبێ بتوانێ ئەو خەریتەیەی جیهان پێک بهێنیت کە خۆی، خەریتەکە، ببێتە بەڵگەی ڕاستبوون وەیا هەڵەبوون وەیا نوقسانبوونی خۆی کە بەئەسڵ لە هەست و بۆچوون و زانست و تەجرەبەی خاوەنەکەی هەڵنراوە.

خوێنەر دەبێ ئاگاداری لایەنێکی گرنگی بۆچوونەکەم بێت، مەرج نییە پسپۆڕی زەڕڕەقلاشی وەیا فەلەک وەیا کیمیا... فیزیا... جوغرافیا... ڕیاضیات... ئەنترۆپۆلۆجی... جیۆلۆجی... و... و... هتد، ئەو دەروونڕوونە بێ کە بتوانێ خەریتە باسکراوەکە ساز بکات و دەرمانی دەردی کۆمەڵایەتیی لێ هەڵێنجێت، کە دەزانین، یا دەبێ بزانین، «مرۆ»ی کۆمەڵایەتی شتێکە جودا لە «مرۆ»ی ئەنترۆپۆلۆجی. ئەو نیسبەتی 1\10000 کە بۆ ژمارەی ڕۆشنبیرانم دانا نیو ملیۆن مرۆی ئەوتۆیی دەگرێتەوە کە دەڵێن ژمارەی سەرلەبەری خەڵق پێنج ملیار کەسە. هەڵبەت من ئەم ژمارەیە لە قەبەڵ ئەو کەسانە ناکەم کە لە ڕووی میرخاسییەوە مرۆدۆست و هەژارنەواز و دژەستەم و لاشەڕن، چونکە دەشێ کابرایەک هێندەی فرشتە پاک بێت بەلام، وەکوو مسڵمانیک، لەعنەت لە بەراز و بەرازخۆر بکات وەیا لە ئاست مافی ئافرەت قیچکەتەنگ بێت، ڕۆشنبیر پاش تێگەیشتنی ڕاستینەی «مرۆ» و سروشت بەهەموو ناوەڕۆکیەوە، باوەڕی خۆی و زەوقی خۆی ناکاتە عەیارەی چاکە و خراپەی

«بابەت»، تا پێی بکرێت دەکۆشێت بۆ پەرەسەندنی ئەو عەیارەیەی بەلای خۆیەوە پەسەندە، بەڵام لەسەری بەشەڕ نایەت و ڕێز لە قەناعەتی خەڵک دەنێ. ئەوجا کە ئەمەی کرد و بایی بەرپرسیارەتیی خۆی ڕێی ئاشتیی گرتەبەر چ گلەیی لەو ناکرێت کە بەرانبەرەکەی پێکۆڵی شەڕ بکات.

دەشێ خوێنەر هەبێ، لەوانەیە زۆریش بن، لایەنی ئاکار و ویژدان تێکەڵ بە ڕۆشنبیری نەکات. من لە کەسانێک نیم نەک تەنها لەبەر بایەخی ویژدان و ئاکار، بەڵکوو لەو ڕووەوە کە باوەڕ دەکەم تێخوێندنەوەی سەلامەتیی گیان و ماڵ و نامووسی خەڵک، لە نادروستی و هەڵەی لێکدانەوەوە دێت، واتە حیسابەکە لە بنەڕەتدا بێ بنەمای سەخت و پتەوە وەیا هەمەلایەن نییە...

- بەلای ئێوەوە کورد «ڕۆشنبیری» هەیە، گەر بەڵێ، ئەرکەکانیان چین؟

پرسیارەکە بە بەریەوە هەیە «ڕۆشنبیر» و «ڕۆشنبیری» بگرێتەوە چونکە «ی» کۆتایی وشەکە خراوەتە نێوان جووتکەوانەوە... من دەیدەمەوە بە پرسین لە هەبوونی «ڕۆشنبیر».

بێگومان بەو مەفهوومەی کە خەڵک ڕۆشنبیری پێ دەناسنەوە کوردیش وەکوو میللەتێکی جیهانی سێیەم بەولای دەیەمەوە ڕۆشنبیری هەن، تێشیاندا هەیە لە مەیدانی خۆیدا دەستنیشانە، بەڵام لەبەر تیشکی کۆتایی پرسیارەکەتدا کە دەڵێی ئەرکەکانیان چین؟ قەڵەم کلۆڵ دەبێت و نازانێ چ بنووسێت و چ بڵێت؟

گریمان لە خەیاڵەوە لیستەیەکمان ڕێک خست و بە ناو و ئەدرەسی ئەو ڕۆشنبیرە کوردانەی کە پێشتر «لە وەڵامی پرسیارێکتدا» پێناسەم بۆ دانان، ئایا چ بەرنامەیەکی ڕێنموونیی کوردایەتی خۆ بە دەستەوە دەدات کە مامۆستا «ئا»ی بەرلین و «بێ»ی هەولێر و «جیم»ی سنە و «دال»ی نیویۆرک و «هێ، واو، زێ، ژێ و... هەموو پیتەکانی ئەبجەدییە»ی لە بەغدا و ئەنقەرە و

بەهەشت و جەهەننەم پێی ڕازی بن و هەر جارە بە نامە و ڕاسپاردە و تەلێکس و دەنگی دەروونی لێکتر بگەیەنن، فڵانە بەند و فیسار و وشە هی لەبارتریان هەیە... هەتا بەرنامەکە قاڵ دەبێتەوە، ئیتر دوای شیردا و لۆ داپیردا، بکەونە سەر خستنەگەڕی بەرنامەکە... کاکی خۆم هەتا دەرمان و ئیکسیر بە مارانگاز دەگات خوا لە کاری خۆی دەبێتەوە...

بەرنامە بۆ ڕێنموونیی ئەرکی ئەرکدەران بە پرسین و وەڵامدانەوە نە دەبێت و نە هیچ سوودێکی تێدایە. تۆ لەوە هەر بگەڕێ کە هەوڵی بەرنامەی ئەوتۆیی وەیا هەر پلانێکی ڕۆشنبیرە دڵهۆشیارەکان پەسەندی بکەن یەکسەر و سەرلەبەر و سەرانسەر لە لایەن ئەوانەی بە براکوژی خەریکی ڕزگار کردنی کوردستانن، تاوانبار و خائین و حەرامزادە حیساب دەکرێت مەگەر بەرنامەکە هێندە بێعەیب و کەلێنگر و پوخت و خۆشجڵەو بێ، پاڵەوانانی یەکتربڕینەوە لێی بترسێن و ناچاربن بە برایەتی یەکتر، ئەمیش وڕێنەیەکی تادارانەیە هێندەی مەیموون هەڵپەڕاندن سەیر و سەمەرەیە، کەسێکی خەنجەری هەڵکێشابێ بۆ هەڵدڕینی هەناوی خۆی چۆن ڕازییە بە نیازی شیفاهێنان کنین و شەربەتی نازانم چی لە دکتۆر وەربگرێ! هەرچەند بێ بەرنامە و هاریکاری چ هەوڵێک بەردار نابێ بۆ چارەسەرکردنی چ دەردێکی کۆمەڵایەتی، هەمیسان دەشێ لە بواری «أضعف الأيمان»ەکەی حەدیس ڕازی بین بەو هێندە ئیمکانەی لە دەستدایە و ڕۆشنبیرە ڕاستەقینەکان (کە بە زەحمەت دەناسرێنەوە لە نێوان ئاپۆرەی نووسەران و بێژەران و خەبتەراندا[8]) بکەونە سەر نووسینی خەستوخۆڵ و بڕندە:

1- بۆ تاوانبار کردن و حەیابردنی ئەو قەسابخانەیەی وا لە کوردستاندا ڕۆڵەکانی کورد بەرپایان کردووە،

2- بە ئیسپاتگەیاندنی مومکینبوونی پێکەوە هەڵکردن بێ ئەوەی یەک لە دوو لایەنان بنەبڕ بکرێت،

3- به دەنگدانی خەڵک بۆ کڕینەوەی ڕۆحی خۆیان و منداڵیان بە هەوڵی وەستاندنی شەڕی ناوخۆیی کە بێگومان فۆتانی هەموو ئاواتێکی بە دمەوەیە.

خوێندوومەتەوە، لە سەرەتاکانی ئەم سەدەیەدا، وەیا کمێک پێشتر، سێ دەوڵەتی ئەمەریکای باشوور کەوتنە سەر باری شەڕ، ئافرەتانی هەر سێ دەوڵەت لە پیاوەکانیان ڕاست بوونەوە و بوون بە مانیعی شەڕەکە. لە ئاکامدا شاژنی ئەوسای بەریتانیایان کرد بە بەریوان و سنووری بۆ دانان. پارەی شەڕەکە بوو بە مەسرەفی ڕێگایەکی شەمەندەفەری سێلکی لە بەرزایی 10 هەزار پێ تونێلێکی بۆ لێدرا و پەیکەرێکی مەسیحیشیان لەو شوێنە هەڵکەند... ئەگەر هەڵەی بچوکم تێدا کردبێ، لەم ڕیوایەتە، ڕووداوەکە حەقیقییە.

بەر لە سێ ساڵێک، کە دوایین سەفەرم بوو بۆ کوردستان (تا ئەم دەمە) لێم دەپرسرا ئاخۆ سەرەنجامی کورد بە چی دەگات؟ ئەوسا شەڕیی ناوخۆیی، جارێ، ئاگری نەگرتبوو، خەڵکەکە باوەڕێکی بێ ئەساسی هەبوو بەوەدا کە من لە هەندێ چەندوچۆنی کاروباری دنیا پێشبینیم ڕاست دەرچووە، دەبێ لە حاڵی کورد دەفتەری دوارۆژ بخوێنمەوە، من کتێبگرەوە نیم. ئەوەندە دەزانم ئەگەر سیاسەتی جیهانی سەر بەم ڕۆژهەڵاتەی کوردستانی تێدایە گۆڕانکاریی گەورەی تێدا ڕوونەدات و کوردەکەش بە دەستی خۆی، خۆی نەکوژێت دوارۆژی گەلێک ڕوونتر دەبێ لە هەرچی ڕابوردووی هەیە و هەبووە. کە دێم مەرجی «نەگۆرانی سیاسەتی جیهانی» دەیەخەمە بەرایی «خۆنەکوشتن»ی کوردەوە لەوەوە دێت، ئەگەر سیاسەتی جیهانی یاریدەدەر نەبێ، کورد لە بارێکدایە و وەها دەورە دراوە بە ڕیزی زنجیر لە دوای زنجیر، چ زنجیری ناوچەیی بێت و چ ئاڵقەبەندبوونی زنجیری ناوچەیی بێ لەگەڵ زنجیری «ئابووریی جیهانی... !»، قوتاربوونی لە ئیمکانی خۆیدا نییە، ئەگەر هەر تاکێکی هێندەی پڵینگ ئازا و هێندەی لوقمان حەکیم بێت. ئەم قسەیەشم هی سەرکێڵی و وزەشکاندن نییە. ئا لەم ڕۆژەدا کە کوردی عێراق هەرگیز هێندی ئێستاکەی چەک نەبووە، ئەگەر سیاسەتی جیهانی ماڵاوایی لێ کرد لە

پازده ڕۆژ پتر خۆی ناگرێ... کە دەڵێم «پازدە ڕۆژ» خێر بە خۆمان دەکەم چونکە لەترووکەیەکدا دەبینە تۆزی بابان. هەتا فەلسەفەی من و تۆ تەپەتەپی دەگاتە بەر گوێی گوێنەدێران، دەفتەری ئەمڕۆژەمان ڕەش دەبێتەوە بۆ دوارۆژێکی چاو تێبڕنەکردوو کە ڕەنگە پەنجا ساڵ بێت و ڕەنگە کورتتر و درێژتریش بێت.

لێرەدا نامەوێ یەخەی خاوەن بیروڕای جودا جودای سەر بە کوردایەتی بگرم، من یەک پەندی دوو سێ حەرفیی کوردویستی دەزانم و دەخوێنمەوە. لە «کوردایەتی»ی خەست و خۆڵ و بێ خەوش و بێ تەئویل بەولاوە هەرچی ئایدیۆلۆژییەکی سەر بە چینایەتیی و دینایەتیی و ڕاڕەوی ئەدیبایەتیی و هونەرایەتی هەیە کە کەندرِک دەخاتە ڕیزەکانی «سی ملیۆن کوردی نامزدەی مەرگ» تێکڕایان گوناهبارن، ئۆباڵ لە ئەستۆن، گومڕای مرۆڤایەتین، کوتەکی دەستی شەیتانن، خائینی nامووسی دایک و خوشک و کیژ و ژنی خۆیانن... بایی ئەوەی کە ئەندامانی یەک خێزان دەبێ بەری بن لە خوێنمژینی یەکتر «لە حەقیقەتیشدا بەرین» هەروەها کوردی هەموو کوردستانی گەورە دەبێ بەو چاوە تەماشا بکرێن و تەماشای یەکتر بکەن... منداڵی ناو بێشکە کە کورد بوو حیسابی سەربازی لەگەڵدا دەکرێ بە بەڵگەی ئەوەی دەیان و سەدان هەزار منداڵی کورد کەرت و پەرت کران. ئەوجا ئەگەر یەکێک و لایەنێک، بە پەندێک لە پەندەکانی و خەونێک لە خەونەکانی ویستی جێپێی یەک سەربازی بەچەک و بێچەک لە ڕیزی دابەستەی قوربانییەکانی کورد لەق بکات، نەکا تریفەی تابلۆکەی کز بێتەوە، ئا ئەو کەسە و ئەو لایەنە و تابلۆکەی و بلیمەتییەکەی زادەی زۆڵی و بێناموسین... و بمبەخشن لەو زارهەراشییەی ناچاری کە کورت دێنێ بەبەر بەژن و باڵای خیانەت...

- ئیسلام و مارکسایەتی چۆن دەتوانن دیمۆکراسی بن، لە کاتێکدا بۆخۆیان ڕەوتی مێژوویی چارەنووسی ئادەمیزادییان ڕەنگڕیژ کردووە و جگە لە خۆیان هیچ بیر و ڕێبازێکی دیکە ناکەوێتە کەوشەن و دامێنیانەوە! ئیسلام پەیامی قورئان و مارکسایەتی دیکتاتۆرییەتی پرۆلیتاریا لە ڕێگەی خەباتی چینایەتییەوە بهێننە کایەوە، حوکم وەدەست بگرن، ئەم زۆرە ملێیە لەگەڵ مێژوودا چۆن دەتوانێ دیمۆکراسی بێت؟

بێگومان زۆرەملێی ئەوتۆیی کە لە سەرەتاوە بە پەکخستنی هەموو «لایەنانی بەرانبەر» ساز درابێ ناشێ دیمۆکراتیک بێت، مارکسیزم دەرگای لای خواپەرستیشی داخستووە «مەبەستم غەیبە بە هەموو جۆریەوە»، لەمەشدا، بە باوەڕی من، لایەنی عاتیفە و پەرۆشی کەلێنبڕینی نامادديیەت لە فەلسەفەکەدا، پەلەی بە خاوەنانی نەزەریەکە کردووە، چونکە تا ئەم دەمەی قەڵەمڕانیی تێدا دەکەم زانستی سەردەم لە ناوەڕۆکی ماددەدا خەمیرەی هێزی «زیندووەتی - حیاة»ی نەدۆزیوەتەوە، لەوە هەر بگەڕێ چۆناوچۆنی بێ مامۆستا و هۆش و تەدبیر ماددەی تازە گیان تێگەڕاو بە درێژایی ڕۆژگار ملیارەها باری لەباری «تطور»ی بۆ ڕەخسا تا لە تاکە «خلیة»وە گەیشتە پلەی ئادەمیزاد، کە هەر «حجیرة»یێکی موعجیزەی بێ ئەژمارەی بە دەوردا لە کاردایە و هەر تروسکەیەکی چاو وەیا پاکبوونەوەی خوێن بە ئۆکسجین لە سییەکاندا وەیا مایەی نێرینە و مێینە لە ڕەحمدا وەیا تەکوینی مێشک... وەیا... هەتا ملیۆنەها وەیای پڕ موعجیزە، ئا ئەم پرسیارە بێ وەڵامانە دەبوو هەڵوەستێک بە تێکڕای مولحیدان بکەن، تا ڕۆژێکی نهێنیەکانی ژین و «تطور»یان لە خودی ماددەدا دەدۆزییەوە، ئەوسا فکرەی هەبوونی «تەدبیر»یان لە بوونەوەری سروشتی دەسڕییەوە. جیهانی ماددی، بە باوەڕی من، خۆی تەفسیری خۆی دەکات بەڵام «زیندووەتی» لە ماددەی مردوودا جارێ تەفسیری نییە... قسەش درێژەی هەیە بە دووی ناکەوم!

مارکسیزم بە شێوەیەکی ڕووکەشانە لە ڕێی هاوچوون کردنی باری ژیانی کۆمەڵگەی مرۆ بە پێی ڕاگەیاندنەکانی، چاری نەبوونی دیمۆکراسیی کردووە

که لزووم نامێنێ له بەهەشتی یەکسانی و تێری و برایی… چەقەچەقی دەربڕینی بیروڕا خەڵکەکە ناڕاحەت بکات. بەهەشت بە مەلائیکەتی تەبا و ڕەبا و تێر و تەسەلەوە بەهەشتە. نەڕەنەڕی مرۆی سیاسی زار قەلەباڵغ و بە هەڵەبەر سەرێشەیەکی ئێسکقورس و دژی بەرژەوەندە و بە ئەرک و ئێشیشە. هەڵبەت ئەم بۆچوونە پتر خەیاڵ و ئاواتە لەوەی بەرنامەیەکی واقیعی و دروست بێت. کرێکار و وەرزێرێکی نەزانێ ناوی خۆی بنووسێت چۆن دەبێتە حکوومەت؟ وەکیلی وەکوو ستالین و پۆڵپۆت ڕۆژگاری لێ دەکەنە چراخان و بە زەبری قەمچی هەنگوین و گێمەڕی دەدەنێ!!

ئیسلام کە بەلای خۆیەوە پەیامی خوایە، بە ناچاری و بە شێوەیەکی حەتمی، هەموو بیروباوەڕ و دینێکی دیکە و ڕاڕەوی عیلمانیشی بەلاوە پووچەڵە مادەم لەگەڵ دەقەکانی قورئان و حەدیس و فەتوای موجتەهیدەکان ڕێک نەکەوێ. زۆر بە سەیری مارکسیزم و ئیسلام بێ ئەوەی مەبەستیان بێت لە شەقڵێکی بنەڕەتیی پێناسەیاندا، جیهانی مرۆ گردەبڕ دەکەن بە دوو کەرت و خەندەقێک لە نێوانیاندا دەسازێنن کە پڕ کردنەوەی بۆ نییە. هەرچی ئیسلامە «دار السلم»ی بۆ وڵاتی مسڵمان داناوە و «دار الحرب»یش بۆ غەیری مسڵمان. ئەوجا ئەگەر کتێبی Holly Terror، ساڵی 1987 ز، لە نووسینی ئەمیر طاهیری بخوێنیتەوە و «أصولي — Fundamentalist»ی ئیسلامی سەردەم بە ڕوونی بخەیتە زیهنتەوە ئەم ڕاستییە بە بارستی خۆی و پاشخانی مێژووشیەوە جلوە دەبەستێ بۆت.

مارکسیزم لە لای خۆیەوە مرۆڤایەتیی کەرت کرد بە دوو بەشەوە: 1- خوێنمژ. 2- خوێنمژراو. بە حەقیقەت ئەم کەرتکردنە دانسقەیە کە هەرگیز بەو جۆرەی وەها گردەبڕ و هەمەگیر لە هیچ مێژوویەکدا نەبووە گەورەترین و بەرینترین کەندڕی دابڕ و دازڕی خستە وەسوەسەی پرۆلیتاریای مارکسیست، ئەگەر بسەلمێنین لە مسڵمانەتی کە بە فەرمانی ئاسمان جیهانی مرۆ دوو کەرتە، چ فەرمانێکی ئاسمانی و حەقیقەتێکی سەر بە کۆمەڵایەتی ناچارمان ناکات بسەلمێنین ئەو خەڵکە دەبێ خوێنمژ و خوێنمژراو بێت، بە

چاوی خۆشمان دەبینین وڵاتی هەرە پێشکەوتوو بێ گوێدانە ئەو تەرزە مشتومڕە و (بەهۆی نەبوونی مشتومڕەکە) لە پۆپی ئارامیی و ئاسوودەیی و تێری و ئازادیدایە... قەسابخانەی ستالین کە لەسەر بنچینەی خەندەقی خوێنمژ و خوێنمژراو هەڵستا، بە زۆریش خوێنمژراوی تێدا چوو، قەشمەرییەک بوو، بە فکر و بە تاک و بە کۆمەڵ و بە مێژوو و دوارۆژ کرا. بایی گۆڕەوشاردنی «ئازادی»ی مرۆڤ لەو قەسابخانەیەدا سۆڤێتستان دەستەبەتاڵ و قومارباز بوو لەچاو وڵاتی نزیک خۆی کە ڕێی دیمۆکراسی و یاساپەسەندیی گرتەبەر... هەڵبەت ئەم ڕێگەیەی ڕووەو بەهەشتی ئارامیی کۆمەڵ، هەروا بە کەیفە قیرتاو نابێت، لەگەڵ ئەمەشدا کە هۆیەکانی قیرتاوبوونی ژێرلێو بخەین وەیا بۆی نەچین، ڕاستییەکەی ئاکامی قەسابخانە و ئاکامی هاریکاری هێند ئاشکرایە بە سەری پەنجان هەستی پێ دەکرێ...

لەم جۆرە قسانە تا بڵێی دەفری بەڵگە و حەقیقەت و شایەدیی ڕووداو ماڵامالە تا لێی هەڵێنجیت بە دوا دەستدا دێت، بەڵام دەبێ بزانین ئەم نرخاندنە و ڕەخنەگرییە لە مارکسیزم و ئیسلام، بە تایبەتی لە ئیسلام، سەر بە هیچ ئەنجامێکەوە نانێ سوودی تێدا بێ بۆ قۆناغی ئێستاکەی کوردەواری، تەنانەت دەنگ و ڕەنگێکیش ناداتەوە لە نێوان خەڵکدا خزمەتی سەقافەت بکات، کاتێک بابایەکی لە خۆ ڕادیتوو یەخەی کێشەکەی گرت و لێکۆڵینەوەیەکی تێروتەسەلی لە بابەتەکە کرد و «ئا» و «نا»یەکی تێدا گوت بە بەڵگە و سەنەد، دەشێ وەک باسێکی ئەکادێمی وەیا وەک بیردۆزییەک لێی قبووڵ بکرێت، بە مەرجی زمانخاوێنی و ئابڕووپاراستن، کە نەچێتە ڕیزی The Satanic Verses. لەو حاڵەبارەی بزووتنەوەی ئێستاکەی کوردایەتیی «هەرێم» تەنانەت بوتپەرستیش ڕێڕەوێکی پەسەند دەردەچێت چ جایی مارکسیزم و ئیسلام کە توانیویانە دەوڵەت بەڕێوەبەرن... لەوانەیە مارکسیزم کە لە کولانەی دەوڵەتپارێزییەوە گەشانەوەی نەبوو لەتەک داوا چەور و لووسەکانی، دەشێ لە هەلێکی دوارۆژدا بە خۆی و ستوونە فکرییەکانیدا بێتەوە و لە ئەزموونی ئایندەدا جۆرێک بخەبتێ لەگەڵ نەبزی مێژوو، کە بریتییە لە

نەبزی کۆمەڵایەتیی ڕاستەقینەدا هەنگاو هەڵێنێت و خەندەقەکە پڕ بکاتەوە و ئادەمیزاد بکاتەوە بە خزم و برادەری یەکتر... هەر ئەم ڕێگەیەی خۆچارەکردنیش هەیە ئایدیۆلۆژیای وەک مارکسیزم پێی شیفا بێ. ئەگەر چاوەنۆڕی دەرمانی دەرەوەی جغزی خۆی بێت تاکە یەک چارە هەیە ئەویش لەناوبردنە. هەرچی ڕێگەی چەوتی نێو کۆمەڵایەتی هەبێ ئەگەر چارەی خۆی نەکات بە ڕەشکردنەوەی فکرە چەوتەکانی، دەسوێت، دەپوێت، تێ دەچێت، مەگەر لایەنی غەیب تێیدا دەست بە عومریەوە بگرێت و دەشگرێت...

بە نیازی زێدە ڕوونکردنەوەی مەبەست و یەکالاکردنی بابەتی پرسیارەکە لە ئاست ئیسلام و دیمۆکراسی دەبێ بڵێم بزووتنەوەی ئیسلامیی سەردەم، لە قاڵبی دینیدا نەک لە سیاسەتی حکوومەتەکانی مسڵمان، یەکێک لە ئامانجەکانی هەرە پێشەوەی ئەو بزووتنە«وانە» سڕینەوەی ناوی دیمۆکراسییە لە تۆمارخانەی بیروباوەڕی خاوێن.

- وەرگێرانی بەرگی یەکەمی مرۆڤ و دەوروبەر لە کوردییەوە بۆ عەرەبی و «من الهموم الحياة» لە عەرەبییەوە بۆ کوردی لە لایەن بەڕێزتانەوە... پێ دەچێ بەڵگە بن بۆ سەختی و زارتۆقێنیی بەرهەمەکان چ لە بابەت دژواریی زمانی نووسینەکانەوە، چ لە باری قووڵیی بابەتەکانەوە، گەر وا بێت ئەوا چۆن خوێنەری کورد چاوی بە وەرگێرانی بەرهەمەکانی وەکوو «اعادة التوازن... ، وجهة نظر في التفسير... ، الى العظيم غورباتشوف... » و چەندین بەرهەم و وتاری دیکەتان ڕوون بێتەوە، ئایا بیری وەرگەڕاندنی ئەوانەتان لەلا نەڕسکاوە؟

وەرگێڕانی ئەو بەرهەمانە لەسەر داخوازیی غەیری خۆمەوە بووە و لە بواری گوزەرانیشەوە، وێڕای لایەنی خزمەتی فکر، ئەرکەکەم هەڵگرتووە چونکە پاداشی تەرجەمەکەم وەرگرتووە، خۆ من کە بە غەریبی و لە خانووی کرێگرتەدا دەژیم لە بەغدا، قەڵەمەکەم دەمژێنێ، مەعاشێکی تەقاعودم هەیە

بە سێ مانگ بایی نەفەرێک کەباب دەبێت، بەشی سێیەمی «مرۆڤ و دەوروبەر» جارێ نەخراوەتە ژێر چاپ، قەول بوو لە سەرەتای ساڵی داهاتوودا چاپ بکرێت...

لە حاڵوباری ئێستاکەدا کتێب بڵاوکردنەوە هەر بە پاڵەوانان دەکرێ. ئەو بەرهەمە عەرەبییانەی باست کردن ئەگەر لێم داخوازی نەکرێ تەرجەمەیان بکەم، نە دەتوانم مانگەها بۆی بە ڕۆژوو بم نە ڕووشم دێت بە مل کەسێکیدا ببرم کە نەیویستووە... خۆ ئەوەی ڕاستی بێ ئەگەر ناچاری نەبێ و گوشاری گوزەران فرزە نەبڕێ من گەلێک کاری نەکردووم بە ملەوەیە، یەک لەوان نووسینێکی تێروتەسەل و شایانی بابەت کە واجیبە بە سەرمەوە، ژیان و فکر و کۆشەشی باوکمە کەوا بێگومان پتر لە ساڵێک دەخایێنێ تا لە هەموو لایەنێکی دەبمەوە، بە تایبەتی لایەنی فکر! من لە گۆشەی تەوازوعکارانەی خۆمدا بە درێژایی ساڵەها، وتووێژی دەروونیم لەگەڵ بوونەوەردا کردووە و ئەنجامەکانی ئەو گەشتە فکرییەم بەو سەرچاوانە گرتووە کە فکری پێ تاقی دەکرێتەوە، وەکوو دەروێشی دەرگەودەرگ و ماڵەوماڵ کەشکۆڵێکم نیوە پڕ کردوە لە ئاوێتەی فکری خۆم و نموونەی یار و نەیاری خاوەن بیروڕایان، هەمووشی لە گۆشەی مێشکمدا کۆمەڵە نەکە لە پسوولان... لە چ ئاسۆیەکەوەش ڕووناکی نابینم ئەو ئاواتە بێتە دی... وا بووە برادەر و دۆست لێمیان پرسیوە، بۆچی ناگزووریی حاڵی خۆت ئاشکرا دەکەیت لە نووسینتدا؟ پێیان دەڵێمەوە، من مرۆیەکی ئاشکرای بەر هەتاوی نیوەڕۆژەم، شەرم لە واقیع ناکەم، دەشمەوێ بزانرێ لە چ بارێکدام هەتا گلەیی بێ ڕێوجێم لێ نەکرێ! نالی گوتەنی «دەست لە مافیهای زەمان بڕیاوم ئەز».

چی لە پرسیارەکەدا هێمای بۆ کراوە لە سەختیی زمانی کتێبەکانم کە هۆی وەرگێڕانی هێندێکیان بێ لە کوردی بۆ عەرەبی و لە عەرەبییەوە بۆ کوردی تەنها تەرجەمەی عەرەبییەکە بۆ کوردی دەگرێتەوە کە دەشێ کوردەکە لە عەرەبییەکە نەگات، تەرجەمەکەش لەسەر داواکردنی «دار الثقافة والنشر الكردية» بوو، نەک لە خۆمەوە کە لە توانامدا نییە و بیریش ناکەمەوە لە

هێندێ ئاخۆ خوێنەری عەرەب نووسینی کوردیم چ لێ دەکات (مەبەس لە تەرجەمەی مرۆڤ و دەوروبەرە کە تەرجەمە کرا بە «الانسان وما حوله» هەرچی تەرجەمەی «من هموم الحیاة» لەسەر داوای مامۆستا ئاسۆس کەمالەوە بوو).

مەسەلەی سەختیی تەعبیر لە عەیارەی مندا کە بە زمانی عەرەبی بنووسم، عەرەبییەکی 1400 ساڵە ڕەگی لە سەقافەت داکوتاوە و نموونەی زێدە بەرزی هەیە لە مەتانەت و لە ڕەوانبێژی و زمانێکی بەهەند هەڵگیراوی ئێستاکە و مێژووە و نووسەری مەشووری دنیای هەیە و خاوەنی بیست یان بیستویەک ئاڵای هەڵکراوە لە نەتەوە یەکنەگرتووەکان و پتر لە 200 ملیۆن ئاخێوەر و سەدان بنگەی سەقافی و زانستی و پتر لە دەیان شاری گەورە و خاوەن پشکێکی بە پۆزە لە نەوتی هەموو دنیا، ئا عەرەبی ئەمە بێ و منیش تاکێکی بێ دەسەڵات و پشتیوان و ئاوارەی دوورە وڵات و لە قەڵەم نەبێ خاوەن هیچ سەروەتێک نەبم و قسەی قەڵەو قەڵەویش بکەم و بە هیچ شتێکی دێتە بەرچاوم لەم غەریبییەمدا ڕازی نەبم و کوردایەتییەکی خەستوخۆڵ و نەترساویش بکەم و توانای جۆرێک نووسین بم، بارتەقای نووسینی هەرەبەرزی نووسەرە هەرە زلەکانی عەرەب بێت، چ ڕێبازێکی نووسینم لە پێشە غەیری ئەو نووسینەی کە حورمەتی خۆی بسەپێنێ بەسەر هەموو عەرەبێکی هەڕێ لە برێ بکاتەوە؟ لەمەش زیاتر، بەشێکی بەرچاوی نووسینی عەرەبیم کە برندەیە، ئەگەر لایەنی مەتانەت و هونەرەکەی شەفاعەتی بۆ جورئەتەکەی نەکردایە لە ئیمکاندا نەبوو بڵاوبکرێتەوە... وەها بووە خەبیرێک نەیوێراوە موافق بێ لەسەر بڵاوکردنەوەی نووسینێکم، هەر لە دائیرەی رەقابەتەوە نووسینەکەیان داوە بە خەبیرێکی زێدەبەرز موافەقەی لەسەر کردووە. وەهاش بووە وەزیری ئیعلام خۆی ڕێی داوە بە بڵاوکردنەوەی هێندێ لە گوتارەکانم (ئەو وەزیرە چەند مانگێکە لادراوە لە وەزارەت). بگەڕێیتەوە بۆ ساڵی 1960، ئەوساش دەبینیت ئەگەر شێوازەکەم ئەوە نەبایە کە هەبوو نە بڵاودەکرایەوە نە کەریم قاسمیش لە خۆیەوە بەرەو دۆستایەتیم

دەهات. خۆ من لە قەڵەم بەولاوە هیچ شتێکم نەبوو... نەختێکیش بۆ لایەنی «فکر»ی ناو نووسینەکە بڵێین و غەدری لێ نەکەین، هەر نەبێ ئەوەندەی تێدا بوو کەوا، ڕەنگە، کەسێکی دیکە نەبوو بەو سەراحەتەی بەکارهێنابێ، بە تایبەتی لەوەتەی حیزبی بەعس لە حوکمدایە.

برای بەڕێز! کە لێم دەپرسییت ئایا وەرگێڕانی بەرهەمە عەرەبییەکانم بۆ کوردی لا ڕسکابێ؟ بە ئاشکرا دەری دەخات کە لە حاڵوباری من ئاگادار نییت، گریمان توانیم بۆ ماوەی ساڵ و نیوێک، دوو ساڵێک دەرویشانە ملم نایەوە وەرگێڕانی 1- اعادة التوازن، 2- وجهة نظر، 3- الى العظيم... ، 4- دوو بەرگی بیریسترویکا غورباتشوف... بۆ سەر کوردی و لێیان بوومەوە بە ساغوسەلامەتی، چۆنیان بڵاوبکەمەوە؟ چەند وەختی دیکەی دەوێ تا ئەو بڵاوکردنەوە خەیاڵییە بەسەر دەچێت؟ خۆ ئەگەر، بۆ ئاسانکردنی ئەم کارە سەختە، کتێبێک بە کولەمەرگی چاپ بکەم و بیفرۆشم و بە پارەی ئەو فرۆشتنە کتێبێکی دیکە بخەمە ژێر چاپ ئەوسا مەسەلە دەبێتە شیر دا بۆ داپیردا... و گەپێکی ئێسکقورس دەردەچێت. سەیریش ئەوەیە کە من بشمەوێ تەرجەمەی ئەو کتێبانە بکەم نوسخەی بەعزێکیانم هەر لە بنەڕەتدا نییە، ئەوجا دەمێنێتەوە ئەو هەموو گوتارانەی عەرەبیم کە لە ڕۆژنامان‌دا بڵاوبوونەتەوە (زۆربەی هەرە هەرە زۆری ئەو گوتارانەم لا نییە، ڕەنگە هەر هیچ بێت... ) نەخێر! مەسەلەکە هی باسکردن نییە و بەولای خەیاڵاتەوەیە!!

- وەک ڕوونە لە بواری شیعر و وێنەکێشان و سەلیقە و زەوقی مۆسیقا توانایەکی گەورەتان هەیە، بە تایبەت لە سەرەتادا شیعرتان وتووە و جارە و جاریش لە گەشتی ژیانمدا لەو بابەتە بەرچاو دەکەون. ئایا ئەمانە تەنێ میراتێکی خێزانی بوون، یاخۆ پاش ڕووکردنە سیاسەت و نووسینی بابەتی فکری، بێ بایەخ و بێ خزمەت کردن مایەوە؟

بە کورتی دەڵێم، مەلەوانی و دارەوانیی لێ دەرچێت کە هەرگیز میلیمەترێک تێیدا پێش نەکەوتم و فێریان نەبووم (بە پێپلکەی دار هەڵگەڕانیش هەر لە بابەتی دارەوانییە) چی لە توانای مرۆی عادەتی و هەڵکشاوتریش بووبێ لە منداڵیمدا من تێیدا پێشکەوتوو بووم. لە تۆپێنە و جگێنە و سێباز و کەوشەک و بازدان و یاریی شەوانەی خوازەڵێ (لە کۆیێ پێی دەڵێن خواجەڕۆیێ) و چاوشێرکێ و زرینگ زرینگ تاوە... لە هەمووی بەرچاو بووم... وێرانی خۆفڕیدان لە بەرزایی کە لەوانەیە کوشندە بێ من و هاوزایەکی ئەوسام تێیدا قارەمان بووین... بێینە لای شیعر و گۆرانی و بابەتی سەر بە خوێندن، لەوێدا بە مەیدان پێش هاوزایەکانم دەکەوتمەوە. کە من لە منداڵیم بڕە شیعری کورت کورتم دادەنا و شەرمم دەکرد ئاشکرایان بکەم، ئەو هەڤاڵانەم بە خەیاڵیشیاندا نە دەهات هەڵبەست چییە، لە پۆلی چواری سەرەتایی بووم یەک لە درۆیە زلەکانی کابرایەکی ئەوسام کرد بە هەڵبەست گۆیا ماکەرێکیان بە شەو زاوە و سبەینێ جاشەکەی نەماوە دوای دوو مانگ دەبینن جاشەکە وا لە ناو دەفرێکی فەغفووریی گەورە بەسەر ڕەفتێکەوە دەزەڕێ... ئێستا تەنێ 3 - 4 بەیتی سەرەتای هەڵبەستەکەم لە بیر ماوە:

لە نەوادیری پیاوێکی کۆیی
باسێکی دەکەم هەر بۆ دڵجۆیی

ئەو پیاوە گوتی جارێک لە جاران
ماکەرێکمان بوو خۆشرۆی بەهاران

ڕۆژەک لە ڕۆژان لە نێو ڕەوەدا
نێرەکەرێ شین کوتی پێوە دا

دوای چەند مانگێک زگی هەراش بوو
پڕی هەناوی سەروپێی جاش بوو

وەک لێتەوە دیارە، لەو تەمەنی شلکدا تێبینی لایەنی جوانکاریی «لزوم ما لایلزم»م کردووە. بەڵام شەرمم دەکرد شیعرم بڵاوبێتەوە. هەر ئەو شەرمەش بوو نەیهێشت مەراقەکەم ڕەگ داکوتێ. وا دێتە دڵمەوە هۆیەکی دیکەی مانعی شاعیربوونم، جگە لە شەرم، مەراقی هەمەجۆری کنەکردن لەو دیاردانەی دێنە بەرچاو و تێگەیشتنی چەند و چۆنییان دەیدزیمەوە لە خەریکبوون بە شتی مەفهوومەوە. لە نموونەدا دەڵێم، جارێ لە سەرەتاکانی خوێندنی قوتابخانە بووم، خرت و پرتی بەرزایی و نزمایی درەخت و خانوو و گرد و تەپۆڵکەی بەرچاوم، ئاخۆ کامیان لە کامیان بەرزترە، بێوچان سەرەتاتکەی پێ دەکردم لە هەموو لایەکەوە تێیان بڕوانم. هەر لەو مەراقەم لێم ڕوون بۆوە کە بەرزاییەکی دەکەوێتە لای دەستی ڕاستم خۆی بڵندتر دەنوێنێ لەهی لای دەستی چەپم، بە بەڵگەی ئەوە کە جێگەی خۆم دەگۆڕی و هی چەپ دەبوو بە هی ڕاست ئەوسا ئەمیان بەرزتر خۆی دەنواند (ئەمەم لە شوێنێک باس کردوە). دوای پتر لە چل ساڵ ئەوجا لە کتێبێکی سەر بە زانست خوێندمەوە دەڵێ لە سروشتدا لای ڕاستە ڕادەکشێ بەسەر لای چەپەدا... دەهاتم داوێکی یەک دوو مەتریم دەکرد بە ڕست بەسەر دوو چیلکەوە بە جۆرێک ئەمسەرەوسەری داوەکە لەیەک ڕێکار بن. ئیتر چاوم دەبڕییە داوەکە و ڕوویم دەکردە شوێنێک تا بزانم جێگەی خۆم چەند بەرزتر یان نزمترە لەو شوێنە... چەند سەیر بوو بەلامەوە کە بە پێی ئەو تەجرەبەیە شوێنی من لە هەندێ شوێنی ئاسۆی لای قیبلە (کەرکووک) بەرزترە، کە پێشتر وەهام دانابوو ناشێ لە ئاسۆ بەرزتر بم چونکە بەولای ئاسۆوە هەر ئاسمان هەیە، ئیتر چۆن دەبێ لە ئاسمان بەرزتر بم... بەینێک لەگەڵ خۆمدا نەمدەسەلماند ئەمە حەقیقەت بێت و خۆم دەسەخڵەت دەدا. ئاخر ئەوسا زۆر منداڵ بووم، مەراقەکەشم لای کەس نەدەدرکاند. خۆ ئەگەر بشمدرکاندایە کەسی وەها نەبوو گرێکوێرەکەم بۆ بکاتەوە مەگەر باوکم و مامم کە شەرمم دەکرد پرسیاریان لێ بکەم. خولاسە مەسەلەی بێبایەخبوونی بابەتی شیعر و هونەر بەهۆی سیاسەتەوە نەختێک لە واقیع دوورە. من دەشیا وەک

amateur بەو لایەنانەوە خەریک بم، بەڵام باری ژیانم و تەسکیی مەودای جووڵانەوەم و شوێنەواری پتر لە 600 ساڵ مەلایەتی، باخصوص دوای هاتنی مەلا عەبدورڕەحمانی کاکی جەلی بۆ کۆیێ، و بە دوای مەرگی مەلای گەورەوە، هەر ئەوەندەی ڕێ دەدام مەراقێکی خۆم لە ڕەسم و گۆرانی و تێکرای هونەرە جوانەکان دابین بکەم.

عیشقم بۆ ئەم لایەنانە لە هەستێکی ئاساییەوە نەبوو، بە هەموو دڵ و گیان و هۆش و گۆشەوە شەیدایان بووم، بەڵام هەر بابەتێکی هونەری تێکەڵ بێ ئەگەر لەسەرەوەی ناوەڕاستەوە نەبێ دڵم نابزوێت، بگرە گوێی نادەمێ و لێی دەتارێم... شتی نزم و ناوەڕاست هێندە زۆرن وەکوو تۆڵەکەی بەهاران بێنرخن، بە تایبەتی دوای پەرەسەندنی بیستەمەنی و بینەمەنی و بەهۆی ڕادیۆ و تەلەڤیزیۆن و کتێب و گۆڤار و ڕۆژنامان کەڵەکەیان کردووە، ئەگەر ڕۆژت پەنجا سەعات بێ شەویش سەد سەعات، بە دەیەک و هەزاریەکی ئەو «... مەنی»یانە ڕاناگەیت. ئەوجا یەکێک مجێزێکی سازگاری هەبێت چۆن دەتوانێ ساڵە و ساڵ گوێ بگرێتە «هەی بەلار» و «صندوق أمين البصرة». لە ساڵی 1936 بۆ یەکەمجار گوێم لە گۆرانییەکی قمر الملوک زرابی (وابزانم وەزیریشیان پێ دەگوت) بوو ئەویش لە گوندی خدرانی سەر بە ڕانیە، ئەشەدوبیللا تاساندمی... وام لەبیرە دەیگوت:

زولف سیاه موی تو کرد سیاه روز من
روی سفید ماه تو کرد سفید موی من

قمر الملوک بارتەقای کەلسوومی میسر بوو لە ئێران. ئەو قەوانە تاکەم بیست... پاش پتر لە پەنجا ساڵ گۆرانیم لێ بیست هی دەمی پیری... من ناشێ ببم بە خەبیری ڕەسم بەڵام، بێگومان، لە نرخاندنی دەنگ، چ قورئان چ گۆرانی چ مۆزیقا، هەستیارییەکەم لە حەد بەدەرە. بەو پێیە گوێگرێکی دەنگناسم. جارێکیان گوێم لە شریتێکی دەنگی مەرحووم صالح دیلان بوو بە

ئەڵڵاوەیسی بێ مۆزیقا پڕ کرابۆوە، ئەمما ئاگرێک بوو بۆ خۆی... لە 1957 دیتمەوە پێم گوت، کاکە صالح وا دیارە ئەم ئەڵڵاوەیسییەت بۆ دڵی خۆت گوتووە... گوتی بەخوا ڕەنگە وەها بێ!!

- خوێنەری کورد چاوەڕێی شاکاری نوێتانە لەمەڕ «حاجی قادر» و «مرۆڤ و دەوروبەر»ەوە، ئایا هیچتان لەم بارەیەوە هەیە؟

کاکی بەڕێز، من کە سێ بەرگی حاجی قادری کۆییم نووسی ئەندامی کۆڕی زانیاریی کورد بووم، گرفت نەبوو لە پێش نووسینم، ژیانم مسۆگەر بوو، مەکینەی چاپیش لە تەنیشتمەوە، ئیتر کێبەرکێ لە نێوان نووسینی من و خێراییکردنی بەرپرسی چاپەکە بوو... ئەو دەمە لە بەرنامەدا بوو بەشی چوارەمی کتێبەکە تەرخان بێ بۆ ڕوونکردنەوەی ژیانی لە ئەستەنبوڵ. نیاز بوو بچم بۆ ئەنقەرە و ئەستەنبووڵ، وەک هەناردراوێکی کۆڕ، بەڵکوو ئاسانتر دەستم بە هەواڵ و حاڵ و باری حاجی ڕابگات. بەشی پێنجەمی کتێبەکەش خەریکی دەرخستنی شەخسییەتی حاجی بێت لە چوونە ناو بەشێکی هەڵبەستەکانی کە نوێنەری بلیمەتیی ئەو کەڵە شاعیرە بێت. دوای بڕانی پێوەندیم بە کۆڕەوە ئەو ئیمکانەم لە دەست چوو، منیش ڕکەبەری لەگەڵ واقیع ناکەم. دەزانم لە وزەمدا نییە ئەو ئەرکە بە ئەستۆوە بگرم کە لە دەمی ئەندامەتیم، لە کۆڕ، پێم دەکرا... خۆ تەفرەدان گەپێکی ناقۆڵایە. ئەمما دەرچوواندنی بەشێکی سێیەم لە مرۆڤ و دەوروبەر شتێکە جێی ئومێد، هەر دەیەوێ عومر یار بێ و بار لە بار بێ... با بڵێین ئامین.

- وەک بۆمان دەگێڕیتەوە، باوکتان مەلای گەورەی بەهەشتی، یەکەم کەس و دوا کەسە کە بە قووڵی و گەورەیی کاری تێکردوون، هێشتا بە کامی دڵی خۆتان نەتانتوانیوە لەسەری بنووسن، بە پێی ئاگاداری من گەلێ کەس ئەو داوا و چاوەڕوانییە لە بەڕێزتان دەکەن خامەی بە پێزی لێ بخەنە گەڕ تا ئەو

زاتە گەورەیە وەک خۆی بێتە ناسین، چۆن لەسەر کۆیی و نالی و حەماغای گەورەتان نووسی و باوکتان دواخست؟

وا بزانم لە وەڵامی پرسیارێکی پێشووتر گوتوومە، نووسین لە بارەی باوکمەوە بەلای کەمەوە ساڵێکی دەوێت، ڕاستییەکەی دوو ساڵیشی گەرەکە...

من کە لەسەر حەماغام نووسی هەوڵی گوزەران، جگە لە شەخسییەتی حەماغا و بەکارهێنانی توانای نووسینم، ئەو کارە پیرۆزەی پێ کردم، ئەوسا 1300 دیناری ساغڵەمی دەمی ڕەواجی پارەی عێراقی خستە دەستمەوە، کە ئەگەر خاترانەی حەماغا نەبوایە پترم داوا دەکرد، نەک لەبەر تەماع بەڵکوو بە پێی نرخی کارەکە. لەو ساڵەدا مەسرەفی هاتوچۆی خۆم 300 دینار بوو، کە ئەویش کەوتە ئەستۆی میراتگری حەماغا کە خۆی داوای کرد لێم ئەو کارە بە ئەنجام بگەیەنم. با ئەوەش بڵێم، کە لە نووسینەکە بوومەوە بەو میراتگرەم گوت، ئەگەر خۆت سەرپەرشتیی لە چاپدانی دەکەی من کتێبەکە پێشکەش دەکەم، بێ مزە، لەبەر برادەرایەتیی نێوانمان و گەورەیی حەماغا، ئەگەر من سەرپەرشتیی بکەم 700 دینارت دەچێ، چونکە بە لای کەمەوە دەوری 6-7 مانگ دەبێ ئاگاداری بم و سەراسۆیی لێ بکەم و بچم بۆ چاپخانە و هەڵەی چاپ ڕاست بکەمەوە... هتد. وابوو 700 دینارەکەی سەلماند، 600 دینارەکەی تر کە 1300 ەکە تەواو دەکات پاداشی خۆم بوو لەلایەن «دار الثقافة»ی کوردییەوە. بەو حاڵیش پیاوچاکان دڵی ئەو دۆستەیان کرمێ کرد لێم بەوەدا کە دوو جاران مزەم وەرگرتووە... پەحا ئەم دنیایە چەند خوێڕووە!! بەو میراتگرەم گوت، خۆزی ئەم کتێبەم بەر لە چاپکردنی، پەڕ پەڕی بە ئاگر سووتابایە... دەبینیت من کە حاڵوباری خۆم بۆ خەڵک ڕوون دەکەمەوە چەند لەسەر حەقم. وا تۆ بە دڵپاکی خۆتەوە وەها چۆتە دڵتەوە کە من بە بادی هەوا وەیا بێ سەبەب باوکم دوای حەماغا وەیا نالی و حاجی قادر خستوە. وا مەسەلەی حەماغا ڕوون بۆوە... نالی و حاجی قادریش لە خۆوە ئاشکران کە ئەگەر لە دەمی ئەندامەتیی کۆڕمدا لەسەر باوکم نووسیبایە بەرەی چەپی کورد و ئەوانەی دڵیان کرمێیە دەیانگوت کۆڕ بۆتە چاپخانەی جەلیزادان...

مدیرێکی ئەمنی عام بۆمی گێڕایەوە، دەستەیەکی قەڵەباڵغی مامۆستاکانی جامیعە، لە چەپییەکان، لیستەیەکیان ڕێک خستبوو بۆ تۆمار کردنی ناوهێنانی «کۆیێ» لە هەموو نووسینەکانمدا، بە نیازی ئیسپاتی ناوچەپەرستی لە مندا!! ماڵیان ئاوابێ چووبوونە لای یەکێکی تر لە مدیرانی ئەمن، کە کۆڕ بۆتە لکێکی ساڤاکی ئێران چونکە هەمیشە هێمن و هەڤاڵەکانی کوردی ئاوارەی کوردستانی ئێران بە دەوری منەوەن و ئەمانەش جاسووسی ساڤاکن. دوو جار لەسەر ئەم مەسئەلەیە توێژینەوەم لەگەڵدا کرا لە لایەن نوێنەری ئەمنەوە، یەکێکیان کەمال پژدەری بوو، ناوی ئەو کۆمەڵە نامەردەی یەک یەک بۆ هەڵدام... دیسانەوە دەڵێم، پەحا ئەم دنیایە چەند خوێڕووە. بەڵام زۆرم پێ خۆش بوو کە هەردوو مدیر ئەمنی عام بە بێ حورمەتی سەیریان کردبوون!!

- بەرانبەر بەم زاتانە پیرەمێرد، سەجادی، مەلای مودەڕڕیس، هەژار، چ هەستێکتان لا دروست دەبێ؟

پرسیارەکە نەختێک سەغڵەتیبەخشە چونکە کەس نییە بێ عەیب، لەمانەش تەنها مەلای مودەڕڕیس بەرحەیاتە، تەمەنی درێژتر بێ. ئەمیان لە بواری خۆی خزمەتێکی زۆری بابەتی هەمەچەشنەی سەر بە کوردەوەی کردوە، وێڕای خزمەتی ئیسلامەتی کە ڕاڕەوی خۆیەتی... هەندێ خاوەن بیروڕای کورد گلەیی ئەوەی لێ دەکەن کە ڕەچەڵەکی بەشێک لە ناودارانی کوردی بۆ نژادی عەرەب بردۆتەوە. من نەپەرژاوم ئەم لایەنە بخوێنمەوە. ئەگەر بەڵگەی ئیسپاتی لابێ، منێکی واقیعی پێی ئازوردە نابم. ئەگەر هاتبایە بە دم ئەوکەسانەدا هاتبایەوە کە زلپیاوی غەیری عەرەب بە عەرەب دادەنێن هەر چونکە بە عەرەبییان نووسیوە خێری دەگەیشتێ و بۆی بە چاکەیەکی گەورە دەژمێردرا. بێگومان مامۆستا مەلایەکی زێدە زلە، بەر لە 25 ساڵێک، لە بارەگای گەیلانی مەلایەکی عەرەب بە ئاشکرا و دەنگی بەرز، لە مەجلیسەکە گوتی، مامۆستای مودەڕڕیس تاکە مەلای حەقیقەتە، ئێمەمانان حاشیەین بە

دەوری مەتنەوە. من گلەییەکم لێی هەیە و (لە ئیمامی غەزالیش) کە لە توانایاندا هەبووە و هەیە هەندێ قسەی کۆنینەی وەپاڵدراوی سەرامەدەکانی ئایین ڕەت بکەنەوە کە ناشێ وەپاڵ موعەللیمێکی سەرەتایی بدرێت چ جایی لەسەر خوا حیساب بکرێت...

مەلای مودەڕڕیس ئەگەر جورئەتی باوکمی هەبوایە دەیتوانی «اجتهاد»ی خۆی لە گەلێک سەروبەری ژیان و چاکە و خراپەی دنیایی بەکاربهێنایە... کەمجورئەتیشی هی گیرۆدەبوونی لایەنی «تقلید»ە کە لە نوختەنەزەریی سەلامەتیی «عقید»ەوە بێخەتەرترە، «تصوف»یش لەوەدا دەخلێکی هەیە.

پێرەمێرد، گەورەترین پێدا هەڵگوتن بەو کەڵەمێردە ئەوەیە کە وشەی «پیر» لە لەقەبەکەیدا ڕۆحی هەموو کوردێکی بە ئەمەک لە گەرمای ئاب و سەرمای کانوونی دووەمەوە دەباتەوە بۆ چڵ و پۆپی نیسانی پیرەمەگروون و ئاداری نەورۆز!

سەجادی، سووربوونی لەسەر خزمەتکردنی سەقافەتی کوردی تا ئەوەی ئەگەر بە ناچاری «ایمان»ی لەسەر دانابایە وازی لێ نەدەهێنا، چەند جاران لە باڵای خۆی بەرزتری کردەوە و پێی بوو بە تۆقەڵان... هەزار هەزار موبارەک بێ لێی.

هەژار، فکر و گیانێکی بە بڕشتی کوردایەتی و ڕۆشنبیری وەکوو کاریزی ئاوەدان بە بەریەوە هەبوو بزێتەوە و بزێتەوە بایی گۆمێکی سێیەمی پڕ لە گەوهەری هەڵدەنا بە تەک دەربەندیخان و دوکانەوە...

- پەیوەندیتان لەگەڵ مامۆستا «هێمن»ی بەهەشتیدا تەواو توند و تۆڵ بووە و خۆتان گوتەنی، قەت لێی تێر نەبوون، شیرینترین بیرەوەریتان کامەیە بتوانن بۆمان بگێڕنەوە؟

بیرەوەرییەکان لە ئەژمار نایەن، بەڵام ئەگەر بە ڕێکەوتیش بێ، ساڵێک لە ساڵان دوو کەسی کۆیی، یەکیان زۆر خوێندووی مەیلەو تەقەڵ هەڵوەشاو، ئەوی دیکەیان خۆ بەزلزان و بەتاڵ، یەک لە دوای یەک مردن، هێمن گوتی، بە خودای دیارە کۆیێ بەختی کەوتۆتەوە گەڕان...

- لە گەشتی ژیانمدا لەو شوێنانەی باسی خواردن و داوەتان دەکەن، ئێدی دۆڵمە، گون و گورچیلەی برژاو بێت، یاخود داندۆک، خوێنەر نوقمی لیکاوی ناو دەمی دەبێت، خۆشترین خواردن لاتان چییە؟

جارێ با بڵێم من «دۆینەی بە کەشک»م لەگەڵ ڕۆنی بێ حیساب پێ خۆشە نەک داندۆک. لە شوێنەواری خۆم قوبڵیی برنجی گردەی کوردیی بیتوێن و بەر ڕووباری شۆڕان لە پژدەر و هێندێ شوێنی شارەزوور بە ڕۆنی مەڕ لەگەڵ گۆشتی مریشکی تازە هێلکەکردووی قەڵەو وەیا گیسکی پەرێزخواردوو وەیا بەرخی نەبڕایەوە کە گۆشتاوەکەیان دێمی بە قوبڵییەکە دابێت، شای هەموو خواردنێکە... جارێکیان شێخ حوسێنی حاجی سەید گوڵ لە بەغدا دەگەڕایەوە، قوبوولییەکی ئەوهایان بۆ سازداین لە ماڵی خۆمان، ئەوساش تازە سۆڤیەت مووشەکەکی ئاسمانیی هەڵدابوو. شێخ گوتی، دەبوو نەختێکیش لەو قوبڵییە بۆ ئاسمان بە دیاری چووبایە... لە بەغدا مەزگووفی ماسیی شەبووتی زیندووی سەرەتای هاوین، زۆر پەسەند دەکەم. جارێکیشیان لە وەختی سەرۆکایەتیی عبدالسلام عارف، ئەمیری کوێت لە دەعوەتێکدا منیشی بەسەر کردبۆوە، بە مێوانی هاتبووە بەغدا، دەوری 100 بریانییەکی بەرخ لەسەر مێز بوو، تەباخی ئەمیر سازی دابوون. ئەو بریانییەی من لێم خوارد بەڕاستی دەبوو سەڵەواتی بۆ لێدەی... خۆ خوانەخواستە زارت نەزاوەتەوە؟ دەڵێن ئاڵووی پێ دەکەوێ!!

- خۆشترین یادگار لە ژیانتاندا چییە؟ گەورەترین ئاواتتان چییە؟ ئەدی تاڵترین و زەقترین یادگار و هەڵەی ژیانتان چییە؟

گەشترین بیرەوەری لە ژیانمدا ئەوە بوو کە ئێوارەی یەکەم ڕۆژی ڕەمەزانی 1953 چوو بووم بۆ سەر داوەتی فتار لە «بلاط ملكي» لە لایەن فەیسەڵەوە بۆ ئەعیان و نائیبانی سازدابوو، کاتێک دەمی مەلای ئێوارە هەنگاوم هەڵێنا بۆ ناو باغەکەی «بلاط» و ئەحمەد موختار بابان لە دوایی بیست مەترێکەوە بە نیمچە غاردانێکەوە بۆ لام هات و دەیگوت: أبشرك، القانون صدر بالعفو عن البارزانيين... موژدەت لێ بێ قانوونی بەخشینی بارزانییان دەرچوو... ئەحمەد موختار وەزیری عەدل بوو، پیاوێکی خاوێن و ڕێز لە خۆگرتوو بوو، منیشی خۆشدەویست و لە موناسەبەدا بە لایەنگیریی من بەرهەڵستی کرد لە قسە و توانجی خەلیل کننە، سکرتێری حیزبی «اتحاد دستوري» کە سەرۆکەکەی نوری سەعید بوو، بەوەشدا هەم خەلیل کننەی پاشگەز خستەوە و هەم منی لە هەڵکەوتێکی سەغڵەت چەپارە دا کە دەبوو بە توندی بە دم خەلیل کننەدا بێمەوە...

بەر لە 15 ڕۆژێک، بە بۆنەی موناقەشە لەسەر قانوونی عەفووی مەحکوومەکانی هەرای ڕەشید عالی، ساڵی 1940، داوام کرد بارزانی و کەسانێکی بەگەڵیان کەوتبوون لە ساڵی 1945 بۆ دیوی کوردستانی ئێران، ببەخشرێن... پاش یەک حەفتە لەو داوایەم ڕێک کەوت سەردانی نووری سەعید بکەم، کە وەزیری جەنگ و خاوەنی حکوومەتیش بوو... لێم داوا کرد عەفووی بارزانییەکان بە ئەستۆوە بگرێ... وەعدەکەی پێ دام و هەرچەند بۆ بەیانی سەفەری دەرەوەی عێراقی دەکرد. وەعدەکەی لە حەفتەیەکدا بوو بە قانوون.

مووژدەکەی ئەحمەد موختار بابان لە ئێوارەی یەکەمی ڕەمەزانی 1953 خۆشترین و گەشترین یادگاری هەموو عومری ڕابوردوومە، سەرلەبەری خەڵکەکەش دەیزانی ئەو عەفوە بەری ئەو چەند قسەیەم بوو کە لە

پەرلەمان هەلی عەفوی مەحکوومانی هەرای ڕەشید عالیم کرد بە دەرفەتی ئەو داوایە.

ئەو سەردانەم لە نووری سەعید لە چاپی دووەمی «گەشتی ژیانم» ڕوون کراوەتەوە لە دەمی بڵاوکردنەوەی ئاڵقەکانی «گەشتی ژیانم» باسی ئەوتۆیی ڕێی بڵاوکردنەوەی نەبوو.

گەورەترین ئاواتم ڕزگاربوونی مرۆیە لە ستەم کە کورد یەکێکە لە نەتەوە ستەمدیدەکانی هەرە زەق و زۆپی ڕۆژگار...

دوو هەڵەی گەورە هەیە لە ژیانمدا، یەکەمیان ئەوە بوو کە لە دەمی سەردانەکەم لە نووری سەعید و بەو جۆرەی پێشوازی لێ کردم و بەخێری هێنام و بە نوێنەری کوردی عێراقی وەرگرتم، بە بیرمدا نەهات کە ئەم هەموو بایەخدانە لەوەوە بە من گەلێک گەلێک گەلێک بەولای عادەتییەوەیە، دەتگوت ڕەئیس وزەرایەکی مێوانی عێراق بەخێر دەهێنێت... ئەشەدوبیللا دوای پتر لە دوو حەفتە ئەوجا مێشکم بە خەبەر هات کە من چۆناوچۆنی ئەو هەلە دەگمەنەم لە دەست دا، وەک دەڵێن، دار گەندەڵ دەبێ هەتا جارێک بازی بەسەرەوە هەڵدەنیشێ. سێ داوام لێ کرد، دووانی دەرلەحزە جێبەجێ کرد، یەکیان عەفووی بارزانییەکان، کە لێم داوا کرد، دەستی ڕاستەی هەڵگرت و خستیە سەرشانی چەپی و گوتی وا بزانە بەربوون... دووەمیان کردنەوەی ڕێگەی نێوان کۆیە و ڕانیە. یەکسەر تەلەفۆنی هەڵگرت بە وەزیری ئیعماری گوت، هەر ئێستە دەبێ دەست بکرێ بە کردنەوەی ئەو ڕێگایە. سێیەمیان چارەسەرکردنی حاڵی تووتن کە فەقیری کوردی پێ دەژیت و بە دەست ئینحیصارەوە لە زاکەزاکدایە... تەلەفۆنی هەڵگرت لەگەڵ وەزیری ئابووری بدوێ، کە ئەوسا تووتن سەر بە وەزارەتی ئابوورییەوە بوو. وەزیر دەرچووبوو بۆ وەزارەتی مواصلات کە وەکیلی ئەو وەزارەتەش بوو. تەلەفۆنی هەڵگرت ئێستا وەزیر نەگەیشتبووە شوێنەکە. گوتی تا تۆ لەگەڵ ئیعمار قسە دەکەیت من چاری مەسەلەی تووتنم کردووە. براینە من کە لە

وەزیری ئیعمارەوە ڕۆییم بۆ مواصلات کاتێک چوومە ژووری سکرتێری وەزیر دیتم نووری سەعید لە لای وەزیر دەردەچێت... تومەز ڕێگەی درێژی کورت کردبۆوە، خۆی هاتبووە لای وەزیر. ئیتر کە چوومە لای دەتگوت سکرتێری خۆمە... وەزیری ئیعماریش هەروەها بوو.

ئەم هەموو بایەخە بەشێکی هی خۆمە کە لە مەجلیس دەدوام و دەمزانی چ دەڵێم، بەشی هەرە زۆری هی ئەو ڕاستییەیە کە من نوێنەری کورد بووم لە حیسابی دەوڵەتدا. بێگومان ڕیزە گوتاری 15 ئاڵقەییشم لەسەر تووتن کە بەر لە هەموو شتێک ئیدارەکەی لە هەرە سەرەوە گۆڕی، سەنگی خۆی هەبوو بە تایبەتی ئاڵقەی دەیەم کە باسی کۆماری مەهاباد و سیاسەتی ئینگلیز... و... هتدی تێدا بوو بەوپەڕی جورئەتەوە نووسرابوو، لە زۆر لاوە موبارەکبادیم بۆ دەهات...

ئەوجا براکەم! ئەگەر لە دەمی سەردانەکەم عەقڵی پاش دوو حەفتەم هاتبایە کەللە، هەوڵم دەدا پەیمانێکی سوێندخوارانە لەگەڵ نووری سەعید ببەستم، لە منەوە سوێند و لەوەوە بەڵێنی ڕاستی لەسەر هێندێ کە نووری سەعید داخوازییە پشتگوێ خراوەکانی کوردی عێراق، بە پێی بەرنامەیەک بهێنێتە دی، چ لە ڕووی سەقافەتەوە چ لە ڕووی ئاوەدانییەوە بێ، تاکوو ئیمکان هەبێ کوردەکە لەبەر تەنگەتاوی خۆ بە دار و بەرددا نەدات. لەوەوە دەشێ سیاسەتێکی مامناوەنجی بە مەسلەحەتی کورد و عێراقەوە پێڕەویی لێ بکرێت و بەرژەوەندبینی کوردیش پشتگیری لێ بکات، یەک لەوان خۆم بم. هەڵبەت ئەم بەرنامەیە شتێک دەبوو لە نێوان نووری پاشا و مندا کە بە هیچ جۆرێک نەدەشیا بکەوێتە بەر گوێی کەسی سێیەم. ئەوجا ئەگەر یەکێک لەم ڕۆژگارەدا گاڵتە بەم بیروڕایە بکات پێی دەڵێمەوە، ئەگەر بەرنامەکە فشایەوە کەس زەرەری تێدا نەکرد، وەکوو جاران بە دوو پاران، نیوەی تووتنی هەژاران لە فەردە دەردەکێشرا و فڕێ دەدرا و بژی و نەژی و نەڕەنەڕی پاڵەوانپفانە لالغاوەی هەندێ شەویلەئەستووری پێ کەفپژێن دەبوو. ئەمە دەڵێم تاکوو لەسەر ساجی عەلییەوە بەراوردێ بکەم لە نێوان ئەو بەرنامەیە و ئەو

حاڵوبارەی کە هەبوو بێ بەرنامە، خۆ دەتوانم بڵێم و دەشڵێم ئەو داخوازییانەی لە هەر بەرنامەیەکدا بێت بەحاڵ هاوتای ئەو سێ داخوازییەی دەکرد کە لە دەقیقەیەکدا نووری پاشا نەک سەلماندنی بەڵکوو پێکی هێنان. ئێستا دەڵێم ئەو سیاسییە زلە کە وەها بە دەستمەوە هات، بێگومان و دە جاران بێگومان، وەهای ڕادیتووە لە زەکای من کە ئەم دڵفەڕاحییەی ئەو لە مەیدانی بەرینتردا بە چاکەی کورد و عێراق بجەڕبێنم. بە داخەوە نە زەکایەکەم لە دەمی خۆیدا بەخەبەر هات و نەدواتریش زەرف یار بوو بۆ پێداچوونەوەی بەرەو دوا بۆ دڵفەڕاحییەکەی نووری پاشا. ئەوجا ئەگەر میرخاسێکی ئەم سەردەمە مەرحەبای ئەوسای منی لەگەڵ نووری سەعیدا بە تەپکەیەکی ئیستیعمار و دۆستەکانی دابنێ، بە دوو بەڵگەی پتەو وەڵامی دەدەمەوە، یەکیان ئەوەیە کە لە دوای لەناوبردنی ئیستیعمار و دۆستەکانی، لە چواردەی تەمموزی 1958، گەلی عێراق بە کورد و عەرەب و کەمایەتییە براکانەوە، لەوەتەی ئەو ڕۆژەوە بە درێژایی 36 ساڵ خەریکی کوشتن و وێرانکردن و ڕیسواییکردنی یەکترن. ئەم حاڵەتەی جەریمە و شێتی و نامەردی و دەبەنگیی مێرخاسان، هەزاران جار ڕووی سەردەمی ئیستیعمار و نووری سەعید و «دوژمنەکانی» گەل بە ئاوی کەوسەر پاک دەکاتەوە. دەڵێن شەیتان بەلای کابرایەکدا تێپەڕی، دارێکی لە ڕەفیسکی مادە وشترێک بەستبوو، بەسەر دارەکەوە خەریکی کاری خێرێ بوو... شەیتان لێی پرسی چ دەکەیت؟ گوتی کاری شەیتان دەکەم. پێی گوتەوە، دەسا بە زولجەلال قەسەم لەوەتەی بە شەیتان خەڵق کراوم فێڵی ئەوتۆییم بە بیردا نەهاتووە. ئیستیعمار و دەوری پاشایی عێراق هەر چونکە لە جغزی بەرژەوەنددا دەخولانەوە، با بڵێین بەرژەوەندیی لەندەن، هەر نەبێ عێراقەکە بایی ئەوەی عەمەلەیەک ڕۆژانەی مەیلەو کەم و کەسر وەردەگرێت لە بۆرجوازی، نانێکی نەمر و نەژیی دەخوارد و لە هیچە و بە کەیفە شەقشەقانێی پێ نەدەکرا و حیسابی لە دەفتەری سیاسەتی حکوومەت نەدەسڕایەوە. هەر نەبێ بایی ئەوەی حکوومەت بەردەوام خەریک نەبێ بە

تۆپ و تەیارە میللەتەکە دابین بکات، ئەوەندەی تێدا دەهێشتەوە ئاپۆرەی خەڵک بە گوزەرانەوە خەریک بێت.

لە ساڵی 1953 یان 1954 یەک عەمەلە لە نمایشتی عەمەلەکانی بەسرە کوژرا. لە دەمی عەبدولکەریم قاسمدا وەزیری داخلییە و سێ بەرپرسی گەورەی سەردەمی نمایشتەکەی بەسرە ئیعدام کران. هەر لە دەمی ئیعدامکردنی وەزیرەکە بە نامەی کوژرانی عەمەلەیەک، هێزی پۆلیس وەیا تەحقیقات وەیا جەیشی شۆڕشی تەمووز لە مانگرتنێکی کارخانەی جگەرە چەندەها عەمەلەی پلیشاندەوە. دواتر گیانی شۆڕشگێڕیی گەیشتە کوشتنی دە هەزار کوردی هەڵەبجە و دەوروبەری بە غازی ژەهراوی. لە ئەنفال 180 هەزار کەس کوژران... کوردەکە خۆی ڕووی حکوومەتی بەعسی سپی کردەوە بەو براکوژییە زێدە گەرموگوڕ و بەردەوامەی وەها بیندرێژ کە ئەگەر لە عیبادەت و چاکەش سەرف کرابایە هەر لە پێویست زیاد بوو.

بەڵگەی دوەم بریتییە لە لێکدانەوەیەکی ئارام و بێ هەڵپە، لە ئاست بایەخی ئەو پەیمانە نەبەستراوەوە لەگەڵم وردبەوە، ئایا نووری سەعید بێ پەیمان و بێ دیدەنی و شناسایی پێشترمان بەو جۆرە بێسنوورە دڵ و کیسەی خۆی کردەوە بۆم چ تەئمیناتیش نەبوو بۆ سوودێکی دوارۆژی حکوومەت لەوەدا، ئایا ئەگەر متمانەی پەیمان و سوێندی لەگەڵدا بایە نەتیجەکەی چۆن دەبوو؟ خوێنەر هەرچۆنێکی مەیل دەکات ئازادە، هەرچەند دەشزانم ئازادییەکەی دەورە دراوە بە گەلێک شریتی فکریی شەتەکدان و بەند و بەستکردن بە تایبەتی کە سەر بە لایەنێکی ئایدیۆلۆجیستەوە یان خاوەن نیاز بوو، بەڵام من ئەوسا دەبوو خەریک بم نەهێڵم کەسی سەر بە حیزبایەتیی نهێنی و غەیرە نهێنی سۆسەی ئەو پەیمانە بکات، چونکە لە گومان بەدەرە، هەر کاتێکی بەرەی چەپ لێی ڕازی نەبێ هەرگیزاو هەرگیز خەباتگێڕی سەرووی بزووتنەوەی ئەوسای کوردی عێراق بە خیانەتی دادەنا. هەر نەبێ بە نیازی بێهێزکردنی بەرەی ئیستیعمار و یاریدەدانی سۆڤیەت. خۆ ئەوەی ڕاستی بێ ئەو سیاسەتگێرانەی حیزبایەتیی سەر بە کوردایەتی لە دوو لێویانەوە

دەرنەهات پێم بڵێن، بەخشینی بارزانێکانمان لێ پیرۆز بێ، نەکا بۆ حکوومەت قازانج بێت و وەیا بۆ من بە چاکە بڕوات... دەمێنێتەوە بڵێم، ناشێ ڕووداوی دوارۆژی پاش پێنج ساڵێک تێ بخوێندرێتەوە (کە 14ی تەممووزی 1958 بوو) لە گرتنەبەری ڕێگەیەکی چاکە و بەرژەوەندی ئەوسای کوردی تێدا دەبوو. من هەرگیز لەو بیروڕایەدا نەبووم کە ئەگەر دەسکەوتی جەماوەر لە ڕێی خەباتی شۆڕشگێڕانەوە نەبێت بێبایەخە. بگرە بە پێچەوانەوە دەسکەوتی بێ هەرا و لەسەر بنچینەی پێداویست نەک ورووژاندن بەرهەمهێنترە لە کاری عاتیفە و مەیلی شۆڕش چونکە بێگومان هەر کارێکی لەسەر دڵگەرمی و هەڵپە و کڵپە بنیات نرابێ، مەگەر چۆنها، دەنا دوورە لە بەرژەوەند و ساغڵەمی... من هەروەک منداڵێک بە دەم شیرمژییەوە بۆ گاڵوبوغ و فەراقەبوونەوە دەڕوات ئەو فراژیبوونەی لێ بە خراپە بە حیساب ناکرێت ئەگەر لە عومری پێنج ساڵی و دە ساڵی تووشی ئیفلیجی هات. تا منیش خزمەتێکی بتوانم لە 1954 و 1955 و... 1957 بە هاووڵاتیمی بگەیەنم ڕەش نابێتەوە بە شۆڕشی تەمووز، ئەوپەڕی خەسارەتەکەی ئەوە دەبێ کە خۆم تێیدا خەتابار دەبم. دەسا بە خاکی کوردستان سوێند دەخۆم ئەگەر چنگم کەوێ نووری سەعیدێکی 1996 (کە هەرگیز چنگ ناکەوێ) ئەو ڕەفتارەی نووری سەعیدی 1953 م لەگەڵدا بکات بە هەر دەپەنجەی دەستەکانم دامەنی دەگرم و دە جاران بە پەنجەی گەورەی دەستی چەپەم پەیمانی بۆ مۆر دەکەم! گۆیا کە من کۆشام بارزانی ببەخشرێن دەبوو نەکۆشێم نەوەک لە پاش 1990 بەشداری شەڕیی ناوخۆیی ببن؟ من بەر لە شەڕی براکوژی، لە دوانێکی ڕووەو ڕۆشنبیرانی زانکۆی «مستنصرية» و لە ئاست گلەییەکی لە ئاست مامۆستا جەلال تاڵەبانی کرا کە هاوکاری دەکات لەگەڵ ئەمەریکا، لە حاڵێکدا لە لاپەڕە هێندەی فلانە کتێبی نووسیویەتی، ئەگەر ئیستیعمار چەکمان بداتێ دەیەوێ عەرەبی پێ بکوژین. من دوای وەڵامی ئەم ڕەخنەیە بەو مامۆستایەی عەرەبی زانکۆم گوت، لە 1990 مەسعوود بارزانی پێی لە جەرگی خۆی ناو کوژرانی چەندین هەزار بارزانیی مێوانی حکوومەت و سێ

برای خۆی و پتر لە چل کەسی خزمی نزیکی فەرامۆش کرد و هاتە بەغدا بۆ سوودی هەموو عێراق، بەوەشدا ئەو مرۆیە بەلای بینینی منەوە گەیشتە پلەی «ئەبوو زەڕڕی غەفاری» و «عومەری کوڕی عەبدولعەزیز»، ئایا چیتان پێ بەخشی؟ قسەکەشم ڕووەو هەموو حازران نەک تەنها ئەو مامۆستایە بوو.

ئەوجا بە پێی ئاکامی دوای یەک دوو ساڵ کە پارتی و یەکیەتی کەوتنە گیانی یەکتر دەبوو جەنابم ئەو پاکانەیەی مەسعوود و قسە ڕەتکرەوەکانم دژی ڕەخنەگرتن لە جەلال خەفە بکەم لە هەناومدا، خۆ ئەو دەمەی ئەو دوو مرۆیەم بەو جۆرە بێپەروایە هەڵداوە لە ئاپۆرەی خەڵقێکدا کە بەشی زۆری بەعسی بوون، وەک مل لە پەت خشاندن بوو، بەڵام لە پایانی دەیان ساڵی نووسین و گوتنی سەریحم دەبوو ئەوە بڵێم و دەشم زانی لێم بە داوێوە ناکرێت چونکە زۆر قسەی ناو گوتارەکانم بڵاو دەکرانەوە تا بڵێی برندە بوون، ئەو جارەشیان خەڵقەکە بارەها چەپڵەڕێزانیان دەکرد... خولاسە پاڵەوانیی لە هەڵوەستەکانم نەبوو...

هەڵەی دووەمم ساڵی 1961 بوو، لە گەشتی ژیانم نووسراوە، عەبدولکەریم قاسم بە دوایدا ناردم بچمە لای بۆ بەغدا و لە خەڵک مەعلووم بوو عەبدولکەریم خاتری منی دەوێت. بەر لە دیدەنی سێیەمم لەگەڵیدا، مەرحووم عوبێدی مەلا مستەفا هاتە لام، پێی ڕاگەیاندم کە شێخ ئەحمەد و مەلا مستەفا داوا دەکەن بچمە لایان. پێم گوتەوە، کاکە عوبێد دەبێ بە عەبدولکەریم بڵێم ڕێم بدات بۆ چوونە لایان چونکە چوونم بۆ بارزان بێ پرسی ئەو، واتە عەبدولکەریم، هیچ سوودێکی نابێ بۆ ڕەواندنەوەی ساردایی... لە دیدەنیدا داواکەی شێخ ئەحمەد و مەلا مستەفام ڕاگەیاند... بە کورتی و کرمانجی بێ ئەوەی بە سەراحەت بڵێ ناشێ بچم، ڕێی چوونمی بەست... بە عوبێدم گوتەوە حاڵەکە وەهایە... من پاش ئەم ڕووداوە لەسەر هەوڵ و سیاسەتی ئاشتی نانەوە بەردەوام بووم بەڵام، و دیسانەوە بەڵام، لێکدانەوەیەک کە تەواوێک، لە دڵدا خەریکاندمی و دەهاتم بیسمیللای لێ بکەم، خرت و پرتی چەند لایەنی دەستی دەگرتم، بە دڵمدا دەهات پێوەندییەک بە شێخ

ئەحمەد و مەلا مستەفاوە بکەم، بەهۆی نامە وەیا ڕاسپاردە، دڵنیایان بکەم کە من لەو هەوڵەی دەیدەم مەبەستم سەلامەتی کوردەکەیە، بەڵکی لە ڕێی ئەو کۆمەڵە عەشیرەتەی بەردەر و پژدەر و کۆیە و کوێ و کوێ کارێک بکرێ دڵی عەبدولکەریم پاک بێتەوە لە گومان و لە نیازی دوژمنانە بەرانبەر بە کورد، کە لە سەرووی هەموانەوە بارزان بوو، وازبهێنێت. بۆ ڕوون کردنەوەی ئەم لایەنە تەماشای لاپەڕەکانی 390-394 ی گەشتی ژیانم بکە.

هەڵەی من ئەوە بوو کە نەمکرد بە جۆریک لە جۆران سکاڵای خۆم بگەیەنمە مەلا مستەفا کە لە وەفا و پەیمانم دڵنیا بێ. من هەرگیزاو هەرگیز ڕێبازێک ناگرمەبەر لە کوردایەتیدا چاکەی ئەوی تێدا نەبێ، چونکە سەرۆکایەتیی ئەو و کوردەکە جۆشخواردوو بووە، کوردیش بێ ڕابەرێکی بەهێز و کارامەی وەک ئەو و بارزان کە قارەمانی ئاشتی و جەنگن، خۆ لەبەر زەبری دوژمنەکانی ڕاناگرێ. لە وەهم و خەیاڵیش ئیمکان نییە من شتێک بکەم وەیا بە دڵمدا تێپەڕێت زەرەری بارزانیی تێدا بێت وەیا لە هێزی کەم بکاتەوە. ئەو سەرۆک عەشیرەتانە هەموویان دۆست و خێرخوا و فەرمانبەری ئەون، ئیتر تکا و ئەرجوو ئەوەیە لە لای خۆیەوە دڵنیا بێ و قسەی فیتنەبازان نەبیستێت و لێی چاوەڕوان دەکەم یارمەتیی ئەم هەوڵەم بدات... کە ئەمەم نەکرد ترسی ئاشکرابوونی پێوەندیم بە مەلا مسەتەفاوە لە لایەک و پاکی و بێگەردی هەوڵەکەم بۆ سوودی کورد لە لایەکی ترەوە، وێڕای موراجەعەی زۆربەی سەرۆک عەشیرەتەکانی کورد بەر لە چەند مانگێک بۆ عەبدولکەریم کە مەلا مستەفای تووڕە نەکرد، ئەمانە هەمووی لایەنی پێوەندی نەکردنم بە بە بارزانەوەی خستە قاڵبی ڕەفتارێکی عادەتی، هەروەک لە دەمی لێشاوەکەی سەرۆک عەشیرەتان بۆ بەغدا و نووسینی داوانامە بۆ عەبدولکەریم کە ڕێگەی خۆپارێزییان بدات بە پێکهێنانی حیزبێک، نە کەس خەیاڵی بۆ ئەوە چوو پرس بە مەلا مستەفا بکرێت و نە مەلا مستەفاش هەڵوەستێکی دژ بەو کارەی کرد. تەنانەت حیزب کە بە چاولێکەری لە حیزبی شیوعی دژ ڕاوەستا بەرانبەر ئەو موراجەعەیە، چ ناڕەزامەندیی دەرنەبڕی لە کوشتنی صدیقی

قادر بەگ کە تاکە کەسێک بوو لە ڕیزی سەرۆک عەشیرەتەکان تارا و بەوەشدا بوو بە هاوهەڵوەست لەگەڵ حیزبی شیوعی و پارتی بەرانبەر گەلەکۆیی عەشیرەتەکان، بگرە پێشی خۆش بوو تا ئەوەی کەسێکی نوێنەری حیزب نەچوو بۆ فاتیحە خوێندن...

خولاسە هۆی خامۆشیم لە ئاست مەلامستەفادا چ تامێکی «نەویستی» پێوە نەبوو، سافیلکەیی دڵی خۆشم و ترسی گوماناویبوونی عەبدولکەریمیش لایەنی قوتەقوتی «ڕاسپاردەی نهێنی» و کاکە و برالەی تایبەتی لەگەڵ بارزان بێ ئەوەی گرووپی سەرەک عەشیرەتەکانی ڕانیە و پژدەر باخەبەر بن لێی، مەیلەو ناجۆر بوو لەگەڵ تەبیاتمدا.

کورتەی حیکایەت، هەڵەم کرد، دەبوو مەلا مستەفا بە تەواوی دڵنیا بکەم کە هەرچی دەیکەم بە چاکەی کوردە و بارزانە، حەقیقەتەکەش هەروەها بوو، خۆ من نەدەبووم بە پێشەوای کوردایەتی، ئەوپەڕەکەی هەڵکشانم ڕوتبەی وەزیری بوو کە هی خوێڕیلەی بێسەنگ و ڕەنگیش تێی دەخزا...
عەبدولکەریم خۆی تەکلیفی وەزارەتی عەدلی کردم و عوزرم هێنایەوە... لە دەوروبەری دیدەنییەکەم لە نووری سەعیدیش بمویستایە دەبووم بە وەزیر، ئەمما وەزیرێکی عەیبدار و «والله غفور رحيم»ێک عەیبەکەی دەپۆشی!!

ئەم خامۆشییەم لە مەلا مستەفا بوو بە هۆی ئەوەی کە دەمی چوونی سەرۆک عەشیرەتەکان بۆ لای زەعیم، عەباسی مەمەنداغا عوزری هێنایەوە گوتی، وەکیلێک دەنێرم لە جیاتی خۆم... ئیتر من سارد بوومەوە لەو هەوڵەم و بە عوزر و بەهانە شتەکەم تەئجیل کرد... تەفسیلاتی سەرەنجامی کارەکە لە گەشتی ژیانم باس کراوە لە لاپەڕە 390 ەوە بە دواوە.

- لێم ڕوونە کە دەتوانن بەیانی تا ئێوارە بخوێننەوە، ئێوارەش تا بەیانی بنووسن، وەلێ بە شێوەیەکی گشتی پرۆگرامێکتان بۆ خوێندنەوە و نووسین هەبووە و هەیە؟

دەڵێن کابرایەک چووە بەر دەستی سەرتاش... لێی پرسی، چۆناوچۆنیت پێ خۆشە سەرەکەت بتاشم؟ گوتی لۆتییانە! سەرتاشیش بێ تەڕ کردن و سەرەو هەوراز بە وشکی ملی نایە گوێزانکاری... کابرا گوتی، کاکە لەو لۆتیانەش نیم! منیش برا! ئەگەر لە سبەینێ بۆ ئێوارێ... لە ئێوارێ بۆ سبەینێ، خۆت گوتەنی، خەریکی نووسین و خوێندنەوە بم دەبێ قەڵەمەکەم بکەم بە چەتاڵ و پەڕەکاغەزی پێ بکەم بە پاروو...

من لەوانەم نووسین و خوێندنەوەم یەکەم کاری خەریکبوونیانە، بەڵام حاڵەتی من ڕەنگە جودا بێ لە حاڵەتی زۆربەی نووسەر و خوێنەران، جارێ دەبێ بڵێم میزاجم چی ویست، لەوەی دەشێ مرۆ بە پێی لوان بیکات، ئەگەر نەیکەم نووسینم پێ ناکرێ، وەیا کەڵکی نابێ. لەو حاڵەتەدا خوێندنەوەشم نابەدڵ دەبێ، نووسینیش بەندە بە پووختەبوونی فکر لە دەروونمدا، پووختەبوونەکەش بەزۆری لە تێفکرینی هەمە کاتم و گوتنەوەی فکرەکەم چ بە بێدەنگی و چ بە دەنگەوە بێ، لە خۆوە بێ ئەندازەکاری و ڕستەگۆڕێ و پەڕە فڕێدان «مەگەر چۆنها» وەکوو ئاو لە نووکی خامەوە دەڕژێتە سەر کاغەز. ئەگەر لە ڕێنووس سەهووم کرد سەهوەکە بە دەمی مووس دەکرێنم، بە دەگمەن نەبێ وشە ڕەش ناکەمەوە وەک پنۆک بەسەر جلکی سپییەوە. کە دەڵێم فکرەکە بە دەنگی بەرز دەڵێمەوە ڕاستییەکی بێفێڵە. ئێستا من و کچێکم و دایکی لە خانوویەکی کرێگرتەی چوار ژووری، بۆ نوستن و هۆڵ و دیوەخانە و مەتبەخ، دەژیین. کە هاتمە بەغدا، بەر لە 31 ساڵ، 18 نەفەر بووین... لەو خانووە زلەدا شوێنی فرەوان هەیە پیاسەی تێدا بکەم و لەگەڵ خۆم بدوێم... بەڵێ بەشی زۆری دوانەکە دەسرێتەوە بەڵام خڵتەی دەمێنێ. لێرەشدا شەقڵێک هەیە لە دەروونم ڕەنگە بەشێکی کەم هەیانبێ (و لە جیاتیی ئەو، شەقڵی تر وەیا چاکتریان هەبێ) ئەویش بریتییە لە خەریکبوونی هۆشی ونم بەو گرێ فکرییانەی هۆشی ئاگا ناتوانێ بیانکاتەوە، ئیتر لە هێکرا و بێ ئەوەی مەبەستم بێ وەیا بیرم لێ کردبێتەوە مەتەڵێکی داخراو یەکالا دەبێتەوە. نەمدەزانی ئەم دیاردەیە لە مندا هی چ هۆیەکە هەتا لە گۆڤارێکی عەرەبی «استعمل عقلك

الباطن استعمالا واعیا» دەڵێ هۆشی ون خەریک دەبێ بەو گرێکوێرانەی هۆشی عادەتی تێیان بڕ ناکات. ئەوجا بەر لە نوستن و بە خۆ خاوکردنەوە قووڵ قووڵ تێفکرە لە مەتەڵێک تا خەو دەتباتەوە. منیش بێ ئەوەی موحتاجی ئەو بەرنامەیە ببم هەمیشە کات، بە زەوقەوە، لە مەتەڵی سروشت و جانەوەر و «بە تایبەتی» مرۆ کنە دەکەم… ماڵی بێئیشیشم، کە هەر ئاوا بێ، مەودای بێبڕانەوەم دەدات لەگەڵ مێروو وەیا خەیاڵاتی تێکهەڵکێش وەیا دۆڵمەی گەلاًمێو و شەڕەکانی ناپۆلیۆن و کارەمستانێی ڕەمەزانەکانی دەمی جەحێڵیم خەریک بم هەتا خوا حەز بکات… دەرچوونم لە ماڵەوە بەندە بە مەرجی هاتنی برادەرێکم بە خۆی و گەڕۆکیەوە، وەکوو کاغەزی موسەجەل، بمباتە شوێنی تازیە وەیا سوور وەیا… وەیا و بمهێنێتەوە ماڵەکەم… وا لەم ساڵانەی دواییدا د. کەمال مەزهەر ئەو قۆنتەراتەیەی بە ملەوە گرتووە بە خۆی و گەڕۆکێکی کۆنەوە، ماڵی ئاوابێ. ئەمجا ئەگەر بڵێم چی دەینووسم، مەگەر چۆن، کاری لێکدانەوەی بێ بڕانەوەیە، شتێکم گوتووە پڕ بە پێستی ڕاستی و واقیعی حاڵی خۆم. لە نموونەدا دەڵێم، تا ئەم دەمە یەک کتێب و یەک گوتاری ڕەخنەگر لە مارکسیزمم نەخوێندۆتەوە مەگەر ڕستەیەک لێرە و دێڕێک لەوێ (وەک ئەوەی کە بێرناردشۆ دەڵێ، نووسینی مارکس بێنی ئارەقە و دووکەڵی لێ نایەت، واتە ئاگای لە حاڵی فابریقەی عەمەلە و کێڵگەی وەرزێر نییە) ئەوساش ڕستەکە و دێڕەکە دەدەمەوە بە خاوەنی، دەست بەسەر ماڵی کەسدا ناگرم. ئەگەر شتێکم گوت وەیا نووسیم و بەر لە من یەکێکی دیکە نووسیبێتی، بێگومان، کاری ڕێکەوتە نەک ڕێگری و دزین، چونکە پێی ناوێ من بڵێم لە خۆوە ئاشکرایە، کەسێک نیمچەشێت نەبێ بە نوێژی نیوەڕۆ بەڕەی مزگەوت نادزێت. لەوە بگەڕێ کە من لەعنەتی ئەرز و ئاسمان لە دز و درۆزن و فێڵباز و مفتەخۆر دەکەم. تەنها یەک جاریش وەڵامی ڕەخنەی بێ ئینسافانەم داوەتەوە بە کتێبولکەی «اعادة التوازن… » ئەویش لەسەر تەکلیفی چەند ئەدیبێکی عەرەب کە بە تایبەتی هاتنە لام، لە کۆڕ، بۆ وەڵامدانەوەی لەو ڕووەوە کە ئەوان ئەسڵە کتێبەکەی حاجی قادر

تێناگەن چونکە کوردی نازانن. ئەگەرنا دڵنیان لەوەدا کە ڕەخنەگرەکە ناحەزێکی ڕق لە دڵە... نەشمدەزانی کێ ڕەخنەی لێ گرتووم، دواتر پاش نووسینی «اعادة... » زانیم مامۆستا لەتیف هەڵمەت بەخۆی ڕەوا دیتووە لایەنگیری نووسینێکی هەوەسبازانە بێت...

خوێندنەوەم هەرچەند بەردەوامە بەڵام لە ڕووی بەسەر ڕاگەیشتنی لووزەوی نووسینی ڕۆژانە و مانگانە و دوو مانگانە و ساڵانە زۆر هەژارە... بەو دواییە مامۆستا ئاسۆس کەمال قامووسێکی نایابی ئینگلیزیی بۆ ناردم سەر بە فەلسەفە کە بارەها و جارەها پێویستم پێی بووە و نەمتوانیوە مەبەستی دڵم بدرکێنم چونکە نەمدەزانی مەبەستەکە بەر چ فەلسەفەیەک دەکەوێ. هەندێ جار لەگەڵ خۆمدا بە لێکدانەوە دەگەم بە بڕیاردان لەسەر شتێکی سەر بە سروشت، دوای ڕۆژەها و ڕۆژگارەها دەبینم بۆچوونەکەم وا لە پەڕەی کتێبێکی سەر بە زانست نووسراوە. هەڵبەت لێکدانەوەکەم کاتێکی درێژی خایاندووە هەتا لێی دڵنیا بووم، ئەگەر کتێبەکە بەر لە چەند ساڵێک پێم گەیشتبایە سەرێشەی مەتەڵ هەڵێنانەکەی لە کورتی دەبڕییەوە... هەر چونکە ناتوانم و لە وزەمدا نییە ڕێکوپێکی لە ژوورەکەم و دەوروبەرەکەمدا بەردەوام بێ نارێکییەکی بەردەوام کاری ئاسانم لێ زەحمەت دەیەخێت، وەک ئەوەی کە کتێبێکم پێویست بوو هەرگیز لە دەمی خۆیدا نایدۆزمەوە... کتێبم بۆ دێت بیخوێنمەوە، ئیتر بە زۆری بێ سەروشوێن دەبێت و خەجاڵەتیی تێدا دەکێشم... خولاسە لایەنی حاڵوباری نووسین و خوێندنەوەم بە کەیفی دوژمنانە، نە پرۆگرام نە تەرتیب و نە زەوقیشی تێدایە، بەڵام ماڵم هەقە، بە باوەڕی خۆم، ئارداوێژەکەی جێی ڕەزامەندییە و نایگۆڕمەوە بە ڕێکوپێکییەکی زۆڵەفکر بزێتەوە:

من قسەی ساغی بەجێم پێ چاکە نەک بێجایی ساغ
کاسەکەل بێنە لە مەی پڕ، خاڵی نەک مینایی ساغ

چی گوتم لەبارەی پێوەندیی نووسینم بە میزاجەوە هەرگیز کەسی پێ تەنگەتاو نابێ و قورساییم ناخاتە سەر شانی چ کەسێک، من کە دڵم بۆ مەتەڵی وشەی تێکهەڵکێش چوو، لە ژووری خۆم وەیا لە هۆڵ، و دەستم هەڵگرت لە نووسین و خوێندنەوە، یاخود بامدایەوە سەر تاوڵیی یەکنەفەری (خۆم لەگەڵ خۆمدا تاوڵی دەکەم) ئێران و تووران هەقی چییە بەسەرمەوە. وەختی خۆمە و بە فیڕۆی دەدەم... کوردەکە دەڵێ کەری خۆمە و گوێی ناڵ دەکەم، من گوێی کەر ناڵ ناکەم چونکە ئێشی پێوەیە... لە حەقیقەتیشدا کات بە فیڕۆدانی تێدا نییە چونکە وەک گوتم، کە دژی میزاجم جووڵامەوە کەڵکی نووسینم پێوە نامێنێ... هەر ئەم تەبیاتەشمە توانام پێ دەدا بۆ ماوەی حەفتە و دوو حەفتە بە تەنهایی شەو و ڕۆژ ڕاببوێرم و کەسی تێدا نەبینم و وەڕزیش نەبم. تا ڕادەی «بە تەنها خۆڕازیبوون — اكتفاء ذاتی» لایەنی میزاج دابین کردن بە وردە خافڵاندن و لێکدانەوە و ڕۆچوون لە موشکیلاتی جیهانی بەربڵاو و بێسنوور و سەروبن تا دەگاتە مێژوو، باوەڕ، ئایین، سیاسەت، حەقیقەتی هەبوون و نەبوونی جوانی، مەودای نێوان قێز لێهەڵستان و شەیدابوون بۆ شتێک.. و... و بزێوی گیان و مێشکم پێ دەدات، کە دەشێ بۆ تۆ و یەکێکی تریش ببێتە بەرنامەی خۆڕسک بە مەرجێک پێوەندایەتیی هەبێ بە زانست و دۆزینەوە و بیروڕای زانا سەرامەدەکانی جیهان، دەنا جینگڵ خواردن لە پۆڕگی مێشکی دابڕاو لە جیهانی ڕۆشنایی سەردەمێ بەوەی پێی دەڵێن Empiricism با چیی دیکە بە خۆوە خەریک نەبم لە نێو چوار دیوارەی ژوورەکەم.

- کام بەشی کوردستانتان دیوە؟

ساڵی هەڵاتنەکەی 2-3 ملیۆن کوردی عێراق من لە حاجی ئۆمەرانەوە ڕۆییم بۆ ورمێ، مێوانی بارەگای پارتی بووم، هەر پارتیش منی گەیاندە ئەوێ... بە خانە و شنۆدا تێپەڕیم، هەردوویان دڵگیربوون، بە تایبەتی شنۆ یەکجار

ئێسکسووک هاتە بەرچاوم، تا ڕۆژی سێی حوزەیران لە ورمێ مامەوە، تەنها ڕۆژێکیان لە جەژنی ڕەمەزاندا چووم بۆ نەغەدە، کە لەو ڕۆژانەدا کاکە زیاد کۆچی دوایی کردبوو، هەر ئەوەندەم دیتووە لە بەشی دیکەی کوردستان.

- کام کتێبی لەسەر کورد بە پێنووسی بیانی نووسرابێ بە لاتانەوە پەسەندە؟

ڕاستییەکەی دەمێکە هێندێکم لەو کتێبانە خوێندۆتەوە، ئێستا ناتوانم بڕیاریان لەسەر بدەم چونکە چەند و چۆنیەکانیانم، بایی نرخاندن، لە بیر نەماون.

- چاکترین بەرهەمتان کامەیە، چ پرۆژەیەکتان بۆ داهاتوو لەبەردەمایە؟

پێم بڕوا بکە زەحمەتە وەڵامی ئەم پرسیارەم پێ بدرێتەوە، بەڵام لە نوختەیەکەوە کە بریتییە لە خەستوخۆڵ کردنی کاکڵی بیروڕا، کتێبولکەی «التفسير البشري للتأريخ» بەرانبەر «التفسير المادي للتأريخ» و تا ڕادەیەکیش بەرانبەر تەفسیری غەیبی و هەمدیسان ئینکاری تەفسیری تەئریخ، لە بەرایی نووسینەکانمەوە دێت. لە دیدی بیروڕای ئەو کتێبە جیهان، بەش بە حاڵی مرۆ، سێ تەفسیری هەیە، یەکیان ماددی کە هەر بۆ ماددەی مردوو دەست دەدات. دوەمیان بایۆلۆجی بۆ تێکڕای گیانلەبەر، سێیەمیان تەئریخی کە ماڵی حەڵاڵ و بێشەریکی مرۆیە چونکە کۆمەڵایەتی بە تەئریخەوە مەلۆتکەی هەناوی مرۆیە، چاکتر ئەوەیە بڵێم هەناو مێشک...

- لەم تەمەنەی ژیانتان هەست بە چی دەکەن، چۆن کات بەسەر دەبەن؟

هەستی هەرە زەق و زۆپ و سەرانسەر و هەمەگیرم ئەوەیە کە لەوپەڕی حاڵیی پەژارەیی، بەشی هەرە پان و بەرینی جیهانی مرۆ (کورد لە بەراییانەوە) وێڕای لێکژەنینی دانیشتوانی دنیای عاقڵستان یەک زەماوەندی ساوایانەی خوێناویی هەدەفپووچ لە کاردایە، هێندە خوێڕی و نامەرادنە و شەرمهێن و ماڵوێرانکەرە دەڵێی ساحیرێک خەڵکەکەی لە قەفەسێکی یەکجار گەورە بەند و بەست کردووە، فووی جادووانەیان تێ دەفروسمێ، هار و شێتیان دەکات و

به نەزمی ئەو ساحیرە هەڵدەپەڕن و هەی بەلاری گورگ و هەرسیان پێ دەچڕێ بۆ گەرمترکردنی کۆڕی سەربڕین و دەست شکاندن و ئاگر تێبەردان بە دەم هوتاف و سروودی چینایەتیی و دینایەتی و نەتەوایەتییەوە... سەد ماشەڵڵای لێ بێ!!

بە قەناعەتی من، مرۆ بە تێکڕایی، لە ئەزموونی گەیشتن بە تەمەنی هۆش و گۆش تێنەپەڕیوە، کەمتاکورتێکی مرۆی دڵ و هۆش ڕووناک حەقیقەتی بەرژەوەندی مرۆ دەزانێ لە چیدایە. دەزانێ لەو کەرنەڤاڵە ئێسکقوورس و خوێناوییە بە دوورە، بەڵکوو دژە لێی بەڵام چارەیەکی بە دڵ و هۆشی ئەو دڵ و هۆش ڕووناکانەدا دێت نە ئیمکان هەیە بگاتە بەر گوێی ملیارەها خەڵک و نە ئیمکان هەیە شاییکەری دەست لە خوێن سوور بە بیستنی ئەو چارەیە با بداتەوە سەر بەرماڵی مرۆپەرستیی. دەمێکە گوتوومە و دەیڵێم، هەروەک موشکیلەی منداڵی پێنج ساڵی بە هۆشی منداڵی دەساڵی دەکرێت، موشکیلەی گەلانی ساڵەکانی 1700 یش بە هۆش و گۆشی مرۆی 1850، 1900 دەکرێت، لە هەموو حاڵانیشدا کەمایەتییەکی هۆشیاری و بەرژەوەندناس هەیە لە دەمی موشکیلەکەدا دەزانن چاری چییە بەڵام بەهۆی بێهەستی و کەمزانیی خەڵک، بە تێکڕایی، چارەکە دەبێتە نامومکین. هەرچەند نامەوێ (حەقیشم نییە) ببمە پزیشکی دەردەکانی مرۆ، ئەوەندە ڕێگە بە خۆم دەدەم بڵێم، لەو تاریکییە ئەنگوستەچاوەی مێژووی سەردەم دوو هاندەر هەن لەوانەن کاریگەر بن بۆ لغاونانە زاری ولاغی سەرکێش، یەکیان ترسی چەکی تۆقێنەرە کە ئەگەر کەوتە دەستی جەردە و حکووماتی شێتان چارەنووسی مرۆ بە گەورە و گچکەیەوە دەکەوێتە بەر هەڕەشەی نەمان... دووەمیان، دەوری زانا هەرە زلەکانی زانستی هەرە بنەڕەتی جیهانگیرییە کە بێت و بگەنە بارێک قسەیان یەک بگرێتەوە لە وەستاندنی هەڵپە و پەلە و تەماع و خودپەرستیی سیاسییە زلەکان و ناچارکردنیان بە چارەی ناوەندی کە دەشێ، وەیا دەبێ، هەموو لایەکی پێ ڕازی بێ، ئومێد بەهێزتر دەبێ لە گۆڕینی جۆری مامڵەتی

نێونەتەوان. هەڵبەت ئەمەی دەیڵێم جارێ لە خەونی خۆش دەچێت بەڵام لە سنووری ئیمکاندایە، یان هی تەما پێ بوونە.

چۆنیەتی ڕابواردنم دەپرسیت، وەک گوتم مجێزم چی داوا کرد لە سنووری بەرتەسکی توانامدا خۆمی دەدەمێ و سەرپێچیی تێدا ناکەم، چەند ڕۆژێکە بە حەزی خۆم سێ جەمەی شەووڕۆژانم کردۆتەوە دوو جەم: سبەینان دەوری 9-10 یەک هێلکەی کوڵاو (یان جێگرێکی وەکوو کفتە، شفتە) و یەک تەماتەی مامناوەندی و یەک سەلکە پیازی ئەویش ناوەندی شیرن و نەختێک ماست و کمێک پەنیر بەیەک ئەستوورکی بازاڕییەوە... ئێوارەش لە نێوان 10-8:30 کمێک پڵاوبرنج و ترشییەکی کوردانەی عادەتی و گۆشت نەک بە زۆری و ماست و تەماتە و پیازە باسکراوەکە... دوای هەر جەمە نانیش یەک کووپی چایەی کوردانە، کە دەبێت کێشا بێت... هەموویشی خۆم سازیان دەدەم. پڵاو و ترشی ئەرکی کابانە بەڵام چەندوچۆنی گەرمکردنەوەیان بە دڵی خۆمە چونکە من پڵاو لەسەر ئاگر گەرم ناکەمەوە لە ترسی ڕەقهەڵاتنی، مەنجەڵێکی مناسب نەختێکی ئاو تێدا بێ دەخەمە سەر ئاگرێکی کز و قاپێکی بچووکی تێ دەخەم و قاپی پڵاوەکەی دەخەمە سەر و دایدەپۆشم. بە گەرمایی هەڵمەکە گەرم دەبێتەوە، تەنانەت ئەستوورکەکەش قەد دەکەم، نەختێک دوای برنجەکە، دەیخەمە سەر برنجەکە، بەوەدا لەبارتر دەبێ بۆ پاروو، چونکە من لە تەنیاییدا کوردانە بە دەستی ڕاستەم جەم دەخۆم، لەگەڵ مێوانی ناسیاویشدا تەقییەم نییە دەست بەکاربهێنم، زێوەر گوتەنی، پەروەردەیی خۆراکی هەموو ساوەر و ماشم... لە پژدەر ئەگەر کەسێک عادەتی گۆڕی یان لە خۆی بایی بوو دەڵێن، بە کەچکێ دەڵێ قاشووغ... ئەمما نیسکی کۆڵەکەم پێ خۆشترە لە ماش... چایەش خۆم سەروبەری دەکەم... زۆر ڕۆژان وەها دەبێ قۆریەی چایە بەسەر کتلییەوە بیستوچوار سەعات حازر بە دەستە چونکە بەر لەوەی چایەکە کۆن ببێت (دوای لێ بوونەوەی ئەهلی ماڵەوە لە جەمی عادەتی) تلْپی چایەکە دەگرم و چایەی نوێ دەخەمەوە قۆریە، کە جارێ ئاوەدانە بە چایەی جەمی پێشوو،

ئیتر بەسەر ئاگری کزەوە کۆن نابێ، بەڵام لەوەتەی سێ جەمم کردوە بە دوو، بیستوچوار سەعاتییەکە مومکین نییە.

هەرچونکە بە زۆری و لە هەموو ژیانمدا پتر لەماڵەوە دەبم تا ئەوەی دەچمە دەرەوە، پاڵکەوتنم لە نوێنمدا کاتێکی درێژم پێ بەسەر دەبا، ئیتر چی پێی دەڵێن موتاڵا من بە درێژبوونەوە و لەبەر ڕووناکی نیۆنی پشت سەرم خەریکی دەبم. گرفتێک پەیدا دەبێ لە خوێندنەوەی کتێبی ئینگلیزی کە مانای وشەیەک نازانم و ڕێم نییە لە تەنگەبەرایی نوێندا قامووس بکەمەوە. وا دەبێ هەر بە درێژبوونەوە وشەکە دەنووسم دواتر بۆی دەگەڕێم لە قامووسدا.

چوونە دەرم کەمە، لە زۆر حاڵدا کە داوەتێکم بۆ دێت بچم گوێ بگرم لە موحازەرەی فلان و فلان، داوەتەکە پشتگوێ دەخەم، کە گلەییم لێ کرا ئایەتێکی قورئان دەخوێنمەوە: «یا ایها الذین امنو لا تسألوا عن اشیاء ان تبد لکم تسوءکم» واتە لە شتێک مەپرسن کە بۆتان ڕوون بکرێتەوە پێتان ناخۆش بێت... منیش کەم وا هەیە لەو موحازەرانەدا شتی ئەوتۆ نەبیەم کە لێی ڕازی نیم، ئیتر چوونەکەم بە زەرەری خۆم و کابرای موحازیر تەواو دەبێت... یاخود لە ڕۆژنامەیەکەوە داوا دەکرێت لەسەر فلانە موناسەبەی سەر بە شتی وەک 11 ی ئازار بنووسم، پێیان دەڵێمەوە (پاش خوێندنەوەی ئایەتەکە)، بمبەنەوە بەر لە 11 ی ئازار و بەر لە شۆڕشی تەمووزی 1958، ئازار و مازار موبارەکی خۆتان بێت...

بەغدا 27-8- 1996

1. پرسەک: نیشانەی پرس
2. ئاکامگری: استنتاج
3. جاران بۆ پاراستنی مەڕوماڵاتی تاربوو، کە شەوی بە دوادا دێت و خەتەری خوران و فۆتانی پەیدا دەبێ، سوورەتی «والشمس وضحاها»یان دەخوێندن و فوویان لە دەوروبەر دەکرد. ئیتر لە شێوەی گەپ و شۆخی، فەقێ و موستەعیدی قۆشمە دوای یەک دوو ئایەتی سوورەتەکە کوردانە لێیان زیاد دەکرد و دەیانگوت «چزی دووپشک ڕەقباها، چاوی گورگ کۆرباها... ».
4. وشەی «ساتراپ» کە لە زمانی یۆنانی کۆن هاتووە، گۆڕاوی وشەی «خشەثرەپاون»ە بە واتای «شارەوان» تا ئێستاش «شارەبان»ی پارێزگای دیالە پاشماوەی ئەو کۆنە وشە لێکدراوەیە، لەو ڕۆژگارانەدا مەبەست لێی «پارێزەری سنوور» بووە کە ئێستا لە فارسیدا «مرزبان»ی پێ دەڵێن.
5. ئەمە دەقی ئایەتەکەیە: أو لم یروا الی الطیر فوقهم طافات ویقبضن ما یمسکهن الا الرحمان انه بکل شیء بصیر.
6. لە کتێبێکی یەک لە نووسەرانی ئێرانی سەردەم خوێندوومەتەوە، بەیتێکی لە نیوەدێڕی دووەمدا، وەک لە بیرمە، دەڵێ، «لحن اورامن ونظم پهلوی» ئیستە ناچمەوە بۆ سەرچاوەکە. دڵنیاشم لەوەدا کە لحن اورامن مەبەسی سەرەکیی بەیتەکەیە. دەترسم لە نظم پهلوی سەهووم کردبێ و شتێکی تر بووبێ:
لحن اورامن وبیت پهلوی
زخمەء رود سماع خسروی
د. پرویز خانلری/ بەیتی شمس قیس رازی

7. وشەی تۆقەڵە، تۆقەڵان لەبارترە تا لووتکە، چونکە دەشێ لووتکە سەرەژێر بێ نەک سەرەژوور.
8. خەبتەر: لە کاری خەبتا، دەخەبتێ، ناوی کارای دروست کردوە وەک: بینی، دەبینێ، بینەر.

– لە تەمەنێکی زووەوە دژ بە شەڕ وەستاونەتەوە و نەفرەتتان لێی کردووە، تەنانەت لە یەکێ لە نووسینەکانتدا شەڕت بە «بەچکەی شەیتانی خۆمت کردوو لە دەروونان‌دا» دەچوێنیت. ئیدی ئەم پێناسیە بەرهەمی گیانێکی پاسفیستە یاخود ئەزموون، وا پەراوێزئاساییە و ئارەزووی تەواوی دڵمان دانامرکێنێتەوە، بۆیە دەخوازین لە دیدی قووڵ و بەرفرەوانتری بەرێزتان ئاشناتر بین و بپرسین، شەڕ چییە؟ لە کوێدا شەڕ ڕەوایی و دادپەروەری وەردەگرێت؟

بەو دەقەی کە من گوتبێتم شەڕ، «بەچکەی شەیتانی خۆمت کردوو لە دەرووندا دەچوێنێت» بەسەر هیچەوە ناوەستێ چونکە دەقەکە مەعنای نییە و ناشێ چشتی ئەوتۆ لە قەڵەمی خوێندەواری عادەتیشەوە هەڵڕژێت، نەشتگوتووە لە چ نووسینێکمدا ئەم شەکرەم شکاندبێ تا بگەڕێم بە دوایدا[1]. دەبێ ڕازی بم بە دێڕی کۆتایی پرسیارەکەت کە دەڵێ: شەڕ چییە؟ لە کوێدا شەڕ ڕەوایی و دادپەروەری وەردەگرێت؟

دەبوو وشەی شەڕ خەست بکەیتەوە کە مەبەست لێی ئاشکرا بێت ئایا شەڕەدەنووکێی منداڵان مەبەستە یان هی دوو عەشیرەت... دوو حیزب... دوو دەوڵەت... شەڕی چەکدار یان شەڕی قەڵەم و زمان... شەڕی هێرشبەر یان هی خۆپارێزی!

چارم نییە دەبێ پرسیارەکەت وەرگێڕمە لای شەڕ بە واتای «War، حرب» کە لە نێوان دەوڵەتان هەڵدایسێت. کە دەپرسیت، شەڕ چییە؟ دەڵێم: شەڕ ئەوەیە کە خۆت و خەڵک و منیش لێمان ئاشکرایە چییە، تا ئەوەی ئەگەر پێناسەی بۆ داندرا لەوانەیە سەرپۆش کرابێ و هێندێکی لەو ڕوونییە دۆڕاندبێت وەک کە وەسفی چوێلکەت کرد دەیەکی چوێلکەت ڕوون نەکردۆتەوە.

دواتر دەپرسیت: لە کوێدا شەڕ ڕەوایی و دادپەروەری وەردەگرێت؟

بێ قووڵبوونەوە وەڵام ئاسانە، شەڕ دژی دەسدرێژی، بە هەموو ماناوە و لە هەموو مەیدانێکدا ڕەوا و شەرافەتمەندە بەڵام و بەڵام ئەگەر:

دەسدرێژییەکی زلهێز لە کەمهێزێک کە بکشێتەوە بۆ فۆتانی کەمهێز، چەندێکی بەرهەڵستی کردنی شەرافەتمەند بێت چاکتر ئەوەیە لە ئیمکاندا بە بەرتیل و بە هەر دلڕاگرتنێک بێ پاشگەز بکرێتەوە. لە نموونەدا دەڵێم، هەرچەندە خۆهەڵداشتن لە ترۆپکی چیاوە تا بڵێی ئازایی پێوەیە بەڵام پاداشی لەگەڵدا نییە چونکە مێدالیە بەسەر سینگی مردووەوە بۆ مردووەکە بێسوودە، ڕەنگە میراتگرێکی خوێڕوو خۆی پێ هەڵداتەوە...

زلهێزێک دەسدرێژی دەکات لە کەمهێزێکی دراوسێت، ئەگەر بتوانیت بە ڕاستبوونەوەت لەو زلهێزە پاشگەزی بکەیتەوە کارێکی مەردانەت کردوە دەنا خۆفۆتاندنت کاری عەقڵ نییە، هەر نەبێ مانەوەت بە کەڵکی لێقەوماوەکانی کەمهێز دێت کە پەنایان بدەیت و گیانیان بپارێزیت.

لەم سەردەمەدا مەفتەنی ئەرمەنییەکان، بەشی زۆری، لە ژێر دەست و مڵکایەتیی تورکاندایە، ئایا تۆ چ فەتوایەک دەدەیت بۆ هەڵگرتنەوەی ڕێگەیەکی بە چاکی دەزانیت ئەرمەنی تێیرا بڕۆن؟ شەڕ بکەن بۆ دەردەست کردنەوەی نیشتمانێکی تالانکراو؟ بێدەنگ بن؟ ئاژاوە بنێنەوە؟

ورمێ لە سەرەتاکانی ئەم سەدەیە چەقی بزووتنەوەی سمایلاغای شکاک بوو، ئێستا بە تەواوی لە دەست تورکماندایە! کورد چی بکا؟ شەڕ؟ ئاشتی؟ پاڕانەوە؟ خۆدانوساندن بۆ هەلێک؟ نەختێک پەراوێزی «شەڕ چییە» لێک دەکێشینەوە تا قەتیس نەبێ لە واتای «حرب، War» کە تۆپ و تانک و فڕۆکەمان بە ملدا دەبرێت و جۆرەها کاری بەدی دڕ و کاری بەدی نەرم و نۆڵمان لێ دەشارێتەوە، با بپرسین، شەڕ، حەرب لە چییەوە پەیدا دەبێت؟

ڕەنگە لەم دەقەشدا جۆرەها وەڵامی لێکتر جودا و ڕەنگاوڕەنگ بە پێی مجێز و بەرژەوەند و بۆچوون و وشاری باوەڕ وەرگرینەوە تا ئەوەی ڕووبەڕووی بیروڕای ئەوتۆ دەبین دەمەتەقەی فەلسەفی بەرەو پێویستبوون و حەتمیبوونی شەڕەوە لێدەخورێت، لەوەشدا بەڵگەیەکی هەرە ئاسان و حازر بە دەست ڕەپێش دەکات کە دەڵێ: مادەم حەرب بە درێژایی ڕۆژگار لە نێوان تاکان و تاقمان و عەشیرەتان و شاران و حیزبان و دەوڵەتان ڕووی داوە و ڕووش دەدات. دەبێ بسەلمێنین هەبوونی بەندە بە سروشتی مرۆوە و بەرهەڵستی لێ کردنی دژی بەرژەوەندی مرۆ خۆیەتی. بزووتنەوەی سیاسیش هەیە و هەبووە شەڕ بە پاککەرەوە دادەنێت و هی وەهاش هەیە «باوەڕ بە شەڕ» یەکێکە لە کۆڵەکە فکرییەکانی. سەیریش لەوەدایە کە هێندێ ڕێکخراوی سیاسی بە هەموو سیفەتی «باڵابستەی ڕدێنگەزە»یەوە هەمیشە پێکوڵی شەڕیەتی...

وەک من بۆ پرسیارەکە دەچم، شەڕ خۆی لە خۆیدا مەتەڵ نییە چ لە لایەن سەرچاوەیەوە بێت و چ لە لایەن ئاوڕیژیەوە بێت چونکە لە یەکەم نیگاوە ئاشکرایە کە گیانلەبەر بە تێکڕایی ترس و تەمایەکی لەگەڵدا دەژیت، ترسی مەرگ و تەمای ژین. لایەنی ترس خەریکی خۆپارێزیی دەکات کە یەکێک لە شێوەکانی خۆپاراستنی شەڕکردنە لەگەڵ دوژمن. لایەنی تەمای ژین دوو ئامانجی بە ملدا دەبڕێ یەکیان بژێو پەیدا کردن، دووەمیان بەردەوامبوونی نەسل، قسەش لێرەدا لەگەڵ ئەو گیانلەبەرانەیە بەرچاون و هەڵسوکەوتیان جۆرە هەست و ئیرادەیەکی تێدا دیارە. لزووم نابینم بچمە دنیای میکرۆب و پێشکە و گێرکە کە ئەوانیش کەم و زۆر لە ئاڵقەی پەلەی ژیان جمووجۆڵیانە.

جیهانی جانەوەر بریتییە لە قەسابخانە، بە زۆری هەرە زۆری دەسەڵاتداری بە گۆشتی بێدەسەڵاتان یان کەمتردەسەڵات خۆی و بەچکەکانی دەژیێنێ. گیاخۆرەکەی «گیاش زیندووە» کە نێچیر ناگرێت، زۆربەی، دەبێتە نێچیری گۆشتخۆر. قەسابخانەکەش سادەیە، بەر لە سەدهەزار ساڵ چۆن بووە هەروا ماوەتەوە بێ ئەوەی ئامێزی خۆپارێزیی و نێچیرگرتن موویەک بەرەوپێش چووبێت چونکە غەریزە لێکدانەوەی 2+8\5=2 نازانێت. بەڵی هەڵبەت خوار و

ژوورێک لە نێوان فامی گۆریلا و عەلەشیش هەیە بەڵام موعادەلەکەی پێ ناشێوێت و لە وزەی گۆریلادا نییە ببێتە داهێنەر... گۆڕانی بایۆلۆجی تا بڵێیت تەنبەڵە ئەگەر مرۆی جادووگەر پەلەی لێ نەکات و مجێز و تەبیاتی نەگۆڕێت.

مرۆ بە خۆی و هێزی هۆش و زانینی و نەوسە چڵێسەکەیەوە جیهانی ترس و تەمای خستە بەر دەستووراتی ئەوتۆوە نە لە ئەژمار دێن نە لە بابەت گۆڕی سەرەدەرییان لێ دەکرێت. یەک نیگای نیوە نوستوو خێس بێتەوە لە پانۆرامای جیهانی مرۆ ئاهەنگێکی «ماسکرێد — حفلة تنكرية»ی دێتە بەرچاو بەشێکی بەرجەستی بە عەقڵەوە نانووسێت، ناشێ مرۆکرد بێت... کەچی هەر مرۆ دەتوانێ چشتی وەها خوێڕوو خەڵق بکات... حاڵوباری هەرێمەکەی خۆمان شایەدی قسەمە، لەم خاوەری ناوەڕاستەدا سێ دەوڵەت هەن نەدەبوو مێژوو بە کرێگرتەیان حیساب بکات... !

لایەنی شەڕ لە مەڵبەندی مرۆڤدا کە قیاس بکەیت (کە بەبەریەوە هەیە بەدەم ڕۆژگارەوە بگاتە ملیۆنەها وشە جگە لە ئامرازەکان) لە دەنگی جانەوەران کەوا هەم واتای ڕاستەوخۆی نییە و هەم جۆریشیان لە خانەیی دەیی تێپەڕ ناکات. جانەوەر لە ماددەی شەڕ هەر شەڕی تێکهەڵقژانی هەیە، پەند و فەلسەفە و «ئەی ڕەقیب» و فەند و فێڵ و چشتی ئەوتۆیی لەگەڵدا نییە، دواتریش شەڕەکە سوڵح و پەیمان و پێوەندایەتیی دیپلۆماسی بە دوادا نەیەت کە پێویستی بە لێکدانەوەی پسپۆڕانە هەبێت نەکا تەپکە و خلیسکی تێدا بێت.

مرۆ بە دەوری دائیم لە شەڕدایە دوور لە جەنگی دەوڵەتان و عەشیرەتان کەوا ڕەنگە لە ماوەی دە ساڵ و بیست ساڵدا ڕوو نەدات. ڕۆژانە و شەوانە زۆربەی خەڵقوڵڵا بە دەست چەندین حاڵی نالەبارەوە لە تەنگەتاویدایە کە ئەگەر نەشگاتە شەڕە چەپەڵۆک هێندەی ئازار پێیەوە ڕۆژەکەی لێ ڕەش داگەڕێت و خواردنەکەی لێ ببێتە گوژاڵ. سەیرێکی حاڵی قوتابیی سەرەتایی

له تەمەنی شەش ساڵی تا دوازدە ساڵی بکە و ببینە منداڵی بێدەسەڵات لە چەنگ هی تەنومەن لە چ عەزابێکی ڕۆحکێشاندایە. جیرانێکم لەسەر هەڵوەشانەوەی خوازبێنیی کیژەکەی کە دوای چەند مانگ توانیی نارەزامەندیی خۆی دەربڕێت تووشی چ ناڕاحەتییەک بوون... قائیمەی کارەبا و ئاو و تەلەفۆنت بۆ دەهێنن بە زیادیی دە هێندە و پەنجا هێندەی حەقیقەت داهاتیش لە پلەی خەجاڵەتیدایە... تایەی ئۆتۆمۆبێلت دەدزن... قنینەی گاز دەدزن... هەرچی دەستی دزی بگاتێ دەدزرێت. قائیمەی ئاوم لە 48 دینارەوە بازی دا بۆ 2800 دینار، تەقاعودیشم لە سێ مانگدا 800 دینارە کە دەکاتە سێیەکە نەفەرێکی کەباب... ئەم وردییاتەش لەچاو مەینەتی گەورە هەر خۆ نانوێنن... ئەگەر حاڵەتی خۆم بکەم بە عەیارە، کە من بە ئاسوودە حیساب دەکرێم، ئەو زمانهەراشی و درۆ و بوختانی ڕاماڵم کراوە لە لایەن کەسانی حەیاتکاوەوە چ دەرمانێکی نییە غەیری ئەوەی کە لە ئاست ئەو نامەرادنە نیوەبەیتێکی فارسی دەڵێمەوە: «قحبە بە مسجد افگند طفل حرامزدەرا»- واتە: قەحپە منداڵە بێژووەکەی دەهاوێتە مزگەوت!

ئەگەر دەفتەر بگێڕیتەوە بۆ وردەهەرای نێوان خەڵقی کووچە و بازاڕ و دائیرەکانی حکوومەت و خەستەخانەکان و گەراجەکان و کوێ و کوێیەکان سەیر و سەمەرە دەردەچێت. سەرێک خوار کەیتەوە لە مەحکەمەکانی مەدەنی و جەزایی نیمچە قیامەتێکت دێتە بەرچاو... دەفتەرێک بگرەوە بۆ جنێوی دڕندەی بڕندەی ئابڕووبەر و حەیاتکێن کە پشتاوپشت هەڵدەکشی بەرەو باب و باپیران تا کەشتییەکەی نووح و بەرەژێر دەبێتەوە لە ژنەوە بۆ نەوەی نەوەی دانەهاتوو هەتا ڕۆژەکەی «نەفخی صوور» کە ئیتر پلەی جنێودان بەسەر دەچێت. هەرچی جانەوەر هەیە کۆ ببێتەوە بۆ سازدانی یەک جنێوی عادەتی هەر نازانێ بۆچی کۆبۆتەوە کەچی مرۆی سەروەری جانەوەران لەیەک دەقیقەدا وەک شەستیر جنێو دەردەپەڕێنێ... کیژە عەشیرەتی ناو چیاکان بە بالۆرە جنێو بەیەکتر دەدەن، ئەمەیان یەکێکە لە بژاردەکانی کە بە ڕاستی مەهارەتێکی تێدایە، دەڵێ:

ماینی سەر بێ ڕیشم
له برای خۆمت کێشم

چونکه ماینی سەر بێ ڕیشم ماینی ڕەوە دەگرێتەوە کە ڕەسەن نییە و بێحوورمەتە و بۆ هەموو ئەسپێک حەڵاڵە... ئاخاوتنێکی کە ئاشکراترین و کاریگەرترینی ئامرازەکانی لێهاتوویی مرۆیە بە دەم لایەنی شەڕانیی تاک و کۆمەڵیەوە پتر خەریکی ڕەخنەگرتن و لچکولێوباداان و بێبایەخیکردنی خەڵکە سوودێکی ڕاستەوخۆشی تێدا نادۆزیتەوە ئەوەندە نەبێ کە بە زەدەکردنی خەڵک هەستێکی حەسانەوەی بیژۆک و ناپەسەند دەکات لەوەدا کە نزمکردنەوەی کەڵەگەتەکان بە قازانجی بەژنوباڵا کوڵەبنەکەی خۆی تەواو دەبێ، ئەویش هەر بە وەهم و خەیاڵی تادار.

هۆشی مرۆ بە هەموو لایاندا دەڕوانێت و دەتەنێتەوە بەڵام، بێگومان، لایەنی سوودبەخش و ڕوونکەرەوە ئەرکی قورسترە تا هی لایەنی بەد. تا دیوارێک هەڵدەنێیت ڕەنج و مەسرەفێکی بەرچاوی دەوێت کەچی تێکدانی بە کیلۆیەک دینامێت لە دە دەقیقەدا ئەنجام دەدرێت. نەمام بە دوو سێ ساڵ بەر دەگرێ و لە پێنج دەقیقەدا بنکێش دەکرێت... تەیارەی دوو سەد نەفەری، ڕەنگە، بە دەنکە کفریتێک سەرەژێر بێتەوە بەرەو مەرگستان... هەزاران هەزار منداڵ کە بەئەرکی پشتشکێن لە ماوەی 18 ساڵدا دەگەنە پلەی سەربازی لە تروکەیەکی چاودا هەڵدەوەرێن، بە زۆریش، بۆ کەیفی پاڵەوانپفێک... کەسانێکی بە فکر و بە کۆشەش ڕێگەی بەختیاری و داد ڕوون دەکەنەوە و نهێنییەکانی سروشت دەکەنە خزمەتکاری کۆمەڵی ئادەمیزاد ژمارەیان لە هەزاریەکی تێکڕای ئادەمیزاد تێپەڕ ناکات... کەسانێکی چرای زانست و کەرامەتی مرۆ دەکوژێننەوە دەیان جار پترن لەو فرشتانە. کاریگەرێکی زێدە مەلعوون ڕۆڵێکی سەرەکیی هەیە لەو لەنگەری وەها بەزیو، ئەویش لە دوو چاویلەی بنەڕەتییەوە زەنە دەکات. یەکەمیان سروشتی گیانلەبەرە کە لە

نوختەنیگای ژین و مانەوەوە، بە ناچاری و بێ دەمەتەقە، هاندەری خۆویستی و گومانی زەبری ناحەز و دوژمن هەم پتر بە خۆیەوە خەریک دەکات و هەم کەمتر دەربەستی حاڵ و باری غەیر دەبێت. چاویلەی دووەم ئەوەیە کە خەریکبوون بە بەرژەوەندی غەیر هەم لە بەرژەوەندی بەخشندە کەم دەکاتەوە هەم ڕێی کێبەرکێی وەدەستهێنانی بژێو سەختتر دەکات.

ئەم دەفتەرەی دەهەزار لاپەڕەیی لە وردەشەڕ و نیوەشەڕ و سووککردن و توانجگرتن و بوختانهەڵبەستن و کاری وەها نامەردانە بە بەریەوە هەبوو بێ شەڕی دەوڵەتان و عەشیرەتان شیرازەی کۆمەڵایەتی هەڵوەشێنیت ئەگەر پارسەنگ دەرەوەیەکی یەکجار بنەڕەتی لە پێوەندیی کۆمەڵایەتی لەنگەری «پێکەوە ژیان» ی مرۆڤایەتیی ڕانەگرتبایە. هەزاران هۆی لێکتر جودابوونەوەی خەڵک کە لە گەلێک حاڵدا دەگاتە سنووری کوشتن و تاڵانکردن و حەیاتکاندن نەدەشیا بیهێڵێ مرۆڤایەتی لە شێوەی «کۆمەڵایەتی» دا ژیان بباتە سەر ئەگەر مومکین بایە هەر جووتە نێر و مێیەک لە کونجێک و ئەشکەفتێکدا خۆیان و بەچکەکانیان بژێنن. هەستی زێدە بەهێزی خۆپەرستی کە تیژترین هەستە لە مرۆڤدا بە تەواوی دەفشێتەوە لە ئاست ئاکامی زراوتۆقێنی هەڵوەشانەوەی شیرازەی کۆمەڵایەتی چونکە ئیمکان نییە جووتێک بنیادەمی نێر و مێ وەکوو جووتێک چوێلکە و ڕێوی و ژیشک و هەرس ژیانی سەربەخۆ و دابڕاو لە کۆمەڵایەتی بەسەر ببەن، خۆ ئەگەر بە پاڵەوانیفیش ژیانی «تاکخێزان» ڕابوێرن هەنگاوێک لە فراژووتنی ژیاری — حضاری — بەرەوپێش نابەنەوە... ڕەنگە لەو تەرزە بارەدا فەرهەنگی ئاخاوتنیان لە سەد وشە تێپەڕ نەکات. دوای ئەو ڕوونکردنەوەی پچڕ پچڕ و نیوداشت لە خۆمان دەپرسین، شەڕ چییە؟ ڕاستییەکەی باشتر ئەوەیە بپرسین، شەڕ لە چییەوە پەیدا دەبێت؟ چونکە شەڕ چییە؟ بە دوو ڕستەی کورتیلە لێی دەبینەوە و دەڵێین، شەڕ تێکهەڵقژانی لەشکری دوو دەوڵەتە[2] بە چەکی سەردەم. وەڵامدانەوەی لە چی پەیدا دەبێ؟ وەها سادە نییە!

له ڕۆژگاری کۆندا که گەل دەورێکی بەرچاوی نەبووە له ڕەنگرێژکردنی کاروباری سیاسەت و شەڕ و ئاشتی و ئابووری و تیجارەت، مجێزی سەرۆک و دەستەودایەرەی حوکم بڕیاری داوە لەسەر شەڕ، ڕەنگە لەو بڕیارەشدا لایەنی پەسەند هەبووبێت وەک دەستخستنەوەی مافێکی دۆڕاو وەیا پەکخستنی جیرانەکەی که خەریکی هێرش بێت، بەزۆریش بڕیارەکه له زەمینەی بەخۆدا ڕاپەرموونی لایەنی هێرشبەر له زاڵبوون بەسەر ناحەزدا دەرچووە چونکه خێرات و بەرەکاتی تاڵان و گرتن و بەستن و دیلکردن لەوانەیە مرۆی مام سەلامەتۆکەش داڵدە بدات.

بێ ئەوەی ناچار بین دەفتەر بگرینەوە بۆ دەورکردنەوەی ئەو هاندەرانەی له کۆن و نوێدا دەوڵەتێکی خستۆتە سەر باری دەسدرێژی له دەوڵەتێک یان وڵاتێکی بێخاوەنی وەک جەزیرەیەکی دوورەدەستی ناو دەریاکان، دەتوانین بە قیاس له هێرشی منداڵێکی تەنومەن بۆ سەر منداڵێکی بێهێز یان ناچار کردنی وەرزێرێک له لایەن ئاغایەکی زۆردارەوە تێبگەین فلانە زلهێز وڵاتێکی بێهیزی داگیر کرد یان شەڕی فرۆشت بە دەوڵەتێکی مامناوەنجی بۆ هەر ئامانج و تەمایەک بێت. هەڵبەت ناشێ خەیاڵ بکەین که هەموو جاران مەسەلەی شەڕفرۆشتن بە غەیر ئەو سادەیەیە که لەو چەند دێڕەدا باس کرا، چونکه گەلێک لایەنی ئەندێشە بەخەبەر دێت له ئاست تەمای دەستدرێژیکردن بۆ سەر دەوڵەتێک هەرچەند له کۆندا مەسەلەکه هێندە گرێیاوی نەبووە لەچاو حاڵەتی ئەم ڕۆژگارەدا (نامەوێ حاڵەتی کۆن و سەردەم شیتەڵ بکەم، تەنها هەبوونی «عصبة الامم» و مەحکەمەی لاهای و دواتر نەتەوەیەکگرتووەکان و مەجلیسی ئەمن بەسە بۆ ڕوونکردنەوەی ئەم لایەنە).

کاریگەرەکان و هاندەرەکان له نوختەنەزەری هەڵایسانی شەڕەوە، له کۆنەوە بۆ نوێ، گۆڕانی زۆر و بنەڕەتییان بەسەردا هاتووە: 1- بەیەکتر بەسترانەوەی پێوەندییەکانی نێوان دەوڵەتان و 2- وشاری ئابووری بۆ سەر سیاسەتی دەوڵەت و 3- دەنگی میللەتە پێشکەوتووەکان له سەروبەری کاری دەوڵەت و

4- هەستیاریی بیروڕای جیهانی لە ئاست هێرشی ناڕەوا و 5- تەجرەبەی تێشکانی بەشێک لەو هێرشانەی دوای سەرکەوتن ڕوویان دا. بەراوردێکی هێرشی ئیتالیا لە سییەکاندا بۆ سەر حەبەشە بکەیت لەگەڵ هەرای کوێت کە شەرعیەتیی دەوڵەتە یەکگرتووەکان و بڕیاری مەجلیسی ئەمنی لەگەڵدا بوو لێت مەعیەن دەبێ کە حاڵوباری سیاسەتی نێودەوڵەتان زۆر گۆڕاوە.

لەگەڵ ئەمەشدا، جارێ، ئاهـ و نزای میللەتی ژێردەست زۆری ماوە بگاتە بەر گوێی جیهانێکی لە دەستی بێت مافی ڕاستەقینە بدۆزێتەوە و داڵدەشی بدات. لێرەشدا دەبێ بزانین میللەتی کەمهێز و ژێردەست لەم جیهانەی دواکەوتوو خۆی سەبەبێکی بنەڕەتییە لە تراجیدیای پێشێلبوونی چونکە، بەزۆری، قەسابخانەی داخیلی لە وڵاتەکەی خۆی دەڕەخسێنێ یان لەگەڵ جیرانێکی دواکەوتووی وەک خۆی دەکەوێتە خوێنڕێژیی. بەشێکی زەق و زۆپی وڵاتی دواکەوتوو بەجۆرێکی وەها کەودەنانە و بێ عەقڵانە ڕێی تێری و هێمنی لە ڕووی خۆی دەبەستێت لزووم بە شەڕی ناوخۆیی و بە هێرشی دوژمنی تاوانبار ناهێڵێت. دەوڵەت هەن دانیشتوانیان خەریکی لە برسان مردنن کەچی سەرۆکەکانیان لەبەر زێدە تێری و کەیف و سەفا خەریکن شەق دەبەن... دەک هەزاران جار شەق بەرن، لە پرۆپاگەندەش دەبردرێنە ڕیزی فرشتە و پێغەمبەران. خوێنمژە زلەکانیان بە زەبری قەمچی و تۆقاندن، بە درێژایی ڕۆژگار، هەڵیاندەپەڕێنن لە نوێژی منەتباری و سپاسگوزاری تا هەر جۆرە زەلیلکردنێکی بەسەریاندا بسەپێ دەخرێتە قاڵبی وەفا و ئەمەکداری بۆ سەرۆکە نامەرد و ستەمکار و بێشەرەفەکانیان... هەڵبەت ئاکامی سڕی و بێهۆشی و دواکەوتویی هەمیشە بریتی دەبێ لە قەسابخانە و بەندیخانەی خەڵکی ڕەشوڕووت «کامی کچ و هەتیوی شیرین بێ ڕایدەکێشن». بە کورتی، گیان و شەرەف و ماڵی ئەو جۆرە نەتەوانە هەمیشە لە تاپۆخانەی مێژوو بە ناوی سەرۆکەکانیان تۆمار دەکرێت...

لە کۆندا بڕیاری شەڕ و ئاشتی لە دەست سەرۆکایەتیی دەوڵەتدا بوو. لەم ڕۆژگارەدا دوو کاریگەر لە پێنج کاریگەرە باسکراوەکان دەوری سەرەکی

دەبینن، یەکیان حاڵەتی دەوڵەتە دەسەڵاتدارەکانە لە سەلماندن و نەسەلماندنی هێرش بۆ سەر غەیر. ئەوی دیکەیان، بەرژەوەندی ئابووری دەوڵەتێکی تەمای هێرشبردنی لە دڵدا بێت، لە ئابووریش مەبەست خاوەن سەرمایە و فابریقە و هۆی گوێزانەوە و نەوت و... چی و چی... یە نەک وردە سەرمایەی بازاڕ و شەقامەکان. لزوم نابینم درێژەی بدەمێ، چی گوترا زیادە لە پرسیارەکە.

کە دیققەت دەگرم لە دەقی سوئالەکە بەو خەتەی خۆت وا دەزانم، ڕەنگە من بەم شێوەیەم نووسیبێت «... بەچکەی شەیتانی خزمەت کردوو لە دەروونانداا... »

- لابردن و گۆڕینی ڕێژیمێک لەسەر حوکم بێ خوێن ڕشتن بە لای کارل پۆپەر، کەڵەفەیلەسووف و زانای سەردەمەوە، گرنگترین و گەورەترین خەسڵەتی دیمۆکراسییە!!. بە بیروباوەڕی ئێوە دیمۆکراسی لە چ پنتێکی دیکەدا بایەخ و سەنگ و بەهای خۆی دەنوێنێت؟

ڕاستییەکەی ئەگەر شتێک لە قسەی پۆپەر نەپەڕیبێت نازانم بۆچی هەناسەی خۆی سوار کردوە بۆ گۆڕینی ڕێژیم بە بێ خوێن ڕشتن چونکە ئەگەر بشێ ڕێژیم بێ خوێن لاچێت موشکیلە لەبەیندا نامێنێت. لە هەڵبژاردنی نوێنەران بە ئاسایی و بە فەرمانی قانوون گرووپێک دەبن بە نوێنەر و حکوومەتێکی تازە دادەنێن، هەر وەک دەشێ خەڵک دەنگی خۆی بدات بە هەمان حکوومەت...

لە ئاست پرسیارەکەت دەربارەی بایەخ و سەنگ و بەهای دیمۆکراسی... بایەخی هەرە زلی دیمۆکراسی لەو هەڵبژاردنەی نوێنەراندایە کە بە ئازادی دەنگی زۆرینەی خەڵکیان بۆ هاتووە و حکوومەتی نوێ دادەمەزرێنن یان ڕازی دەبن بە حکوومەتی کۆن... ڕەنگە کەسانێک هەبن بە بۆرە تەئویل بایەخی ئازادیی هەڵبژاردن بدزنەوە لە ناوەڕۆکی دیمۆکراسی، لەوەشدا لایەنگری دیکتاتۆرایەتی دەبن بە با هەڵدانی تەعبیر تا دەشێ سپی ڕەش بێت یان بە

پێچەوانەوە کە دەڵێن: دیکتاتۆرایەتی دیموکراتانەی گەل. هەڵبەت ئەم فاکوفیکە گاڵتەکردنە بە ئاپۆرەی میللەت و بەهەشتی کەمایەتیی حوکمدارانە. ئەو خۆهەڵخەڵەتێنانە «کە زیرەکانە دەیگۆڕن بە خەڵکهەڵخەڵەتێن» دوژمنی بابە کوشتەی ئادەمیزادن... لە ئازادیی خەڵکدا خۆیان دەبن بە ماسیی وشکایی...

من کە هەڵبژاردنی ئازاد دادەنێم بە بەردی بناخەی کامەرانی و داد دەزانم هەرچی ژێرخان و ژوورخان هەیە لەو ئازادییەدا دەکەوێتە جغزی خواهیشتی میللەت... پۆلیس پێم ناوێرێ... مەحکەمە بەرتیل وەرناگرێ... وەزیر حەیای خۆی دەپارێزێ... عورفی و مورفی دەتۆپن... خولاسە حکوومەتی ژێر سێبەری هەڵبژاردنی ئازاد خۆی لە زاکەزاکدایە بە دەست میللەتەوە...

نەکا قسەکانم سەراوی خۆ بنوێنن، بە عەرزی خوێنەر ڕادەگەیەنم کە دیموکراسی ئەو کارە ئاسانە نییە کە لەسەر ڕووی کاغەز و لە لالغاوەی زاراندا سووک خۆ دەنوێنێ. ئەششەدوبیللا ئەگەر میللەت ژیر و هۆشیار و خوێندەوار و تێگەیشتوو نەبێ هەر بە خەیاڵیدا نایەت چۆناوچۆنی دەنگان دەبێتە بریانی و پەقلاوە یان گۆژاڵ و قرژاڵ... لێرەشدا دەرفەت نییە بەبەر شەرحەوە بنیشم.

- گوتراوە، دەسەڵات ناهەقی دروست دەکات و ناهەقیش دەسەڵات دەخوڵقێنێ. بەلای باوەڕی ئێوەوە دەسەڵات چییە؟ دەسەڵاتی هەق و یەکسانپەرست چۆن دروست دەکرێت؟

ئەو گوتەیە وەکوو پەندێک زیلی هۆشیاربوونەوە لێ بدات بۆ لغاوکردنی دەسەڵات نەوەک نەفسی حەزۆک ڕوو لە ستەم بکات نرخێکی مەعنەویی پێوەیە، کەمیش نییە نرخەکە، بەڵام هەر چونکە سنووری دانەناوە بە دەوری دەسەڵاتەوە ئایا چ دەسەڵاتێک و چەند دەسەڵات و لە چ حاڵ و چ باردا، بە حەتمی، ناهەقی دروست دەکات بەشێکی زۆری بایەخەکەی لە دەست داوە!

وەک کە پەندیارێک بڵێ: چاکە بکەن خراپە مەکەن بێ ئەوەی چاکە و خراپە دەستنیشان بکات بە خۆڕایی خۆی ماندوو کردووە...

دەسەڵات خۆی لە خۆیدا هاندەرە بۆ دەسدرێژی بەڵام لە هەمان کاتدا پێداویستێکی هەرە هەرە بنجی و بنەڕەتییە بۆ ئاسوودەیی و داد و ژیار و زانست و پێشکەوتن لە قاڵبی دەسەڵاتی حکوومەتدا. بەڵێ، حکوومەت فرشتە نییە بەڵام بە هەمەحاڵ بێ حکوومەت کۆمەڵگەی ئادەمیزاد تروسکەی خێر و خۆشی بە خۆیەوە نابینێت... دەسەڵاتداری ستەمکار لە بێهێزیی حکوومەت هەل وەردەگرێ بۆ هێنانەدیی نیازە بەدەکانی. لە نموونەدا دەڵێم، زۆردار کە بەرتیل دەدا بە مەئمووری حکوومەت تا ڕادەیەک سەری دانەواندووە، هەموو جارانیش بەرتیل نابێتە نرخی سوودی نارەوا. هەڵبەت دەزانم و دەزانیت لە وڵاتی دواکەوتوو حکوومەت پتر بە لای دەسەڵاتدار دەشکێتەوە، زۆر جاریش زوڵم بێباکانە و ئاشکرا ڕوودەدات بەڵام بێ هێزی حکوومەت هەژار و بێ دەسەڵات دەبن بە گێرەی خەرمان...
پارسەنگدانەوەیەک لە زوڵمی دەسەڵاتداردا ئەوەیە کەوا بە زۆری خاوەندەسەڵاتەکان لەسەر تەماع و فیزوناز دەبن بە ناحەزی یەکتر لەوەشدا بێدەسەڵات نەختێک باری سووک دەبێت... مەشوورە لە کۆیێ دەگوترا کە ئاغاکان نیزاعیان دەبوو شێخ غەفووری تاڵەبانی دەیگوت، کوڕینە، هەر نەوت، نەوت! مەبەسی ئەوە بوو نەوت بخەنە سەر ئاگری نیزاعەکە... بۆ خاتری خەریکبوون بە نیزاعی خۆیان.

هەتا لە بیرم نەچووە با بڵێم، دەسەڵاتی زانست و تەکنیک و ئیبداع و وزەی ژیار «حضارة» ناشێ بۆ لای بەدایەتی ببردرێتەوە، بگرە ئومێدی دوارۆژی مرۆڤایەتی بەندە بەو ماکە گەشانەوە. لە نموونەدا دەڵێم تۆ کە سواری فڕۆکە دەبیت ڕەفتارت زۆر جودایە لەگەڵ دەمی سەفەرت بە وڵاغ. بەرهەمی زانست و ئیبداع مرۆ ڕادەهێنێت بە جۆرێک پیشە و سلووک کە شایانی ئەو بەرهەمانە بێت. کاروانچی کە لە وڵاغەکەی قەلس دەبوو تێی بەردەبوو بە تێڵایان ئەمما کەس دڵی نایەت بە تێلا وەرگەڕێتە ڕادیۆ و تەلەڤیزیۆن و

ئۆتۆمۆبێلەکەی لە حاڵی سەکەتبوونیدا... ڕۆیشتنت بەسەر شەقامی قیرتاودا زۆر جودایە لەگەڵ قوڕشیلانی کۆنە کۆلانەندا... دەسا دیتوومە کەسانێک میزیان کردۆتە ناو ئاوی جۆگەی حەمامۆک کە ئەوسا پرۆژەی ئاوی لوولە نەبوو، لە خوارتر خەڵکەکە ئاوی لە جۆگەکە دەخواردەوە و بە جەڕە و گۆزەش دەیانبردەوە بۆ ماڵەکانیان، تۆ بڵێی هەمان کەسەکان خەیاڵ بکەنەوە هەمان دەستوور لەگەڵ تانکیی ئاوی لوولە ڕەفتار بکەن؟

لەبارەی پرسیارت «دەسەڵات چییە؟» و دەشێ پێناسەی جودا جودای بۆ هەڵنرێت لە لایەن خەڵکەوە، من دەڵێم، دەسەڵات بریتییە لە وزەی هێنانەدیی ئارەزۆ (ئارەزۆ هەموو ئامانجێک دەگرێتەوە) ئیتر ڕەوا بێت یان ناڕەوا. وزەش لەمیان بۆ ئەویان خوار و ژووری هەیە، وزەی تاکەکەسیش هەموو نیازێکی پێ دەردەست ناکرێت وەک کە تاکێکی دەسەڵاتدار نەتوانێ دێیەک ملزەم بکات پێی دەکرێ هێندێکیان بهێنێتە ئاڵقەی دەسەڵاتی خۆی.

دەسەڵاتی هەق و یەکسانپەرست چۆن دروست دەکرێت؟

زۆر بە ئاسایی و بێ هەناسەسواری پێت دەڵێم، هەق و داد و یەکسانی بەو جۆرە دروست دەبێ کە گەلی سوێد و نەرویج و کوێ و کوێ دروستیان کرد. جیهانی پەنجاوسێیەم ئەگەر کیفی چەندهەزار ساڵەی شەختەکردن دانەماڵێ، وەک کە مار بەهاران کیفە کۆنەکەی دادەماڵی، و بە حاڵەتی Metamorphosis دا تێنەپەڕێت ڕۆژگارەها بەسەر دەبات لەو قوڕەی تێی چەقیوە. تەنها یەک چارە هەیە فریای بکەوێت ئەویش جیهانی پێشکەوتوو (جیهانی مرۆی ڕاستەقینە) بە هەموو هێزی خۆیەوە تێی بنووسێت و سەرکەلی بکاتەوە بۆ هەرێمی دنیای ڕوون... مامەگێلەی دنیای شەپڵتەخۆران و مەیموونپەرستان پرخەی خەوی چل ساڵەی دێو و درنجانی لێوە دێت و هەر بە تەمایە نوێشی بکاتەوە بۆ خەوێکی، ئینشاڵڵا، سەد ساڵەیی!! براکەم، کاکە گیان، کوڕی خاس!! مەسەلەی دروستکردنی هەق و یەکسانی بەندە بەو مەرجانەی ئامانجی وەها دوورەدەست و ئەریستۆکرات و بەفیزوناز داوای

دەکات. کە قسە بهێنیتە سەر حاڵەتی کورد دوو ئیحتیمالی لە پێشە، یەکیان ئەوەیە بۆی بلوێ حکوومەتێکی کوردیی سەرلەبەری کوردستان دروست بکات. دووەمیان ئەوەیە بە کەرتوپەرتی بمێنێتەوە بۆ ماوەی عەقڵ تێبرنەکردوو. بە خێر و سەلامەت کە حکوومەتی دامەزراند، لە تەپڵی بنی گۆمی چەند هەزار مەترییەوە لەوژەکە لەوژەکە بە پێپلکەی هەزاران پلەییدا هەڵکشیت، حاڵوباریش لەبار بێت و یاریدەدەریشی هەبێت و خۆیشی هۆشێکی هاتبێتەوە کەللەیەوە، ئەمجا بزن شیردا لۆ داپیردا داپیر کلکەقوڵێی وێدا زەنگۆڵەیەکیشی بەسەری کلکیەوە خرابێت... لێمان پیرۆز بێ!

ئیحتیمالی دووەم کە کورد بە کەرتکراوی بمێنێتەوە، لە هەموو ئەو ڕۆژگارانەدا کە کورد دیلی بێگانە بێت پشکی بەدبەختی و هەقخوراوی و بێڕووەتیی ئەوە دەبێ کە پلەی درِندەیی و ستەمکاریی باڵادەست لێی خۆش دێت. هەڵبەت باڵادەست بەسەر کورد و غەیری کوردەوە چاوەدێرییەکی سیاسەتی جیهانی دەکات کە، وا پێ دەچێ، لەگەڵ درِندەیی زەق دانووی ناکوڵێت. لەوە بەولاوە قسەکردن لە چارەنووسی کوردی قالوبەلایێ دەبێتە کاری ڕەملگرەوە.

دڵی خۆت مەدە خولیای دروسکردنی هەق و ماف و یەکسانی لە حاڵێکدا ناتوانین دەست لە براکوژی هەڵگرین. ئەمە دەڵێم لەو ڕووەوە کە ئەگەر مەبەستت لە پرسیارەکە وەڵامێک بێ لە منەوە بۆ هەموو مرۆڤایەتی، من هەر ناچارم ڕووی پرسیارەکەت بەلای کورد و ئەمسالی کورددا بشکێنمەوە!

کە من نەخلی مرادم بێ سەمەر بێ<br>
بە من چی باغی حالەم جوملەبەر بێ.

ئێمە و میللەتانی وەک ئێمە لەچاو دەیان میللەتی ئەم جیهانە لە سواڵکەرێک تێپەڕ ناکەین، قسەمان ئەگەر ئەڵماسیش بێ کەس نیوە پیازێکی پێ نادات هەر نەبێ چونکە زمانمان کەسی بێگانە تێی ناگات چ جایی ئەوەی

نووسراومان بکرن... سوئالێکی تۆ دەیکەیت و جەوابێکی من بۆتی دەنووسم وەک «بانگی ناو کدووله»[3] له بانگدەر بەولاوه «که کوردەکەیه» کەس نایبیستێت. ئەوەی ڕاستی بێت هەر پرسیارێکی بەتەمای وەڵامی پێوراو و کێشراو و ئەزموووراو بێ، جێی نابێتەوە له دەفتەرخانەی میللەتی بێسەودا و شەپڵتەخۆر، کەمتاکورتێکی خوێندەواریان تێی دەگەن بەڵام یەک مەیدانە ئەسپ له هەموو کوردستانی خۆمان پەیدا نییه بیروڕای مرۆڤانە به مێوان قبوڵ بکات. له دەستەواژەی «میللەتی بێسەواد» مەبەستم تەنها نەخوێندەواری نییه، خوێندەواری کورد زۆرن لەوانەی خەیاڵی بێ بنەما دەکەن به زەمینەی فەلسەفە و پرۆژەی خەبات. دوور مەڕۆ، خەباتگێڕە خوێندەوارەکانمان دەماری خۆیان و میللەتیان هەڵدەبڕنەوە. چ تاکەکەس بێت، چ گرووپ و حیزب و حکوومەتیش بێ ئەگەر ژێرخان و ژوورخانی 200 ساڵەیی نەبێت. به ئەهلی سەدەی بیستەم حیساب ناکرێت چ جایی بیستویەکەم... که دەڵێم «تاکەکەس» بێ ژوورخان و ژێرخان... قبوڵ ناکرێت، مەبەس ئەوەیە میراتگری کەلەپوورێکی دووسەد ساڵی بێت نەک دووسەد ساڵ تەمەنی بێت به ژوورخان و ژێرخانەوە، کەلەپووریش بالۆرە و کەوشەک و «بابی بابی عەولای ڕابی تەقڵەی له چەندان دابی» نییه!! میللەتێک شیرمژی ڕێنێسانس نەبێت هەر ئەوە دەبێت که لەبەر چاوتدایە و تازە به تازە ئافرەت له ئەفغانستان دەرگەی لەسەر دادەخرێت... وا لێرەشدا دەڵێمەوە: بۆچی ئافرەتی جیهانی هەزاروسێیەم هەڵناگەڕێتەوە لەو دیلییەی بەسەریدا سەپاوە؟ چ دەدۆڕێنی له هەڵگەڕانەوە...؟ ئەمما چ بڵێین لەگەڵ بیروڕایەکی که ئافرەتی به «عورة – عەورەت» داناوە ئافرەتەکەش سەلماندوویەتی...؟

یەک تێبینی بچووکم هەیە له «دەسەڵات و ناهەقی» و «ناهەقی و دەسەڵات» که یەکتر بخوڵقێنن. من دەڵێم: دەسەڵات به بەریەوە هەیە ناهەقی بخوڵقێنیت ناهەقیش لێی دەوەشێتەوە ناهەقییەک بخوڵقێنێ که دەسەڵاتی ستەمکارە. هەویری ئەم پرسیارە زۆر ئاوخوازە بەڵام ئەو هەقەی

بەسەرمانەوە نییە پشووی بۆ درێژ کەینەوە و پرسیار هەڵستێنین و بڵێین: قانوون بۆ سوودی گشتی و ئاسوودەیی گشتی ڕێک دەخرێت و لە ئەنجامی لێکدانەوەی پسپۆڕانە دەق دەگرێت کەچی وەها دەبێ ماددەیەکی قانوون یان قانوونێک سەرلەبەری زیانبەخشە، قسەشمان لە قانوونێک نییە دوژمن ڕێکی خستبێت؟ یەک لەوانە قانوونی «إصلاح زراعی» تا بڵێی بەدفەڕ بوو! لێرەدا دەسەڵات و ڕەوایبەکی شۆڕشی 14ی تەمووز کە خەونی پێوە دەدیترا بوو بە هۆی ناهەقی... بێوەژن هەبوو پێنج دۆنم زەویی بە میرات بۆ مابۆوە قانوون لە دەستانی دەرهێنا گۆیا «اقطاعی»یە کەچی هەندێ کەس ملیۆنەها دیناری 1970ی وەرگرت لە بری ئەرزێکی داخیلی «امانة العاصمة»یە گۆیا ئەمیان بۆرجوازیی وەتەنی حیساب دەکرێت... دواتر کەسانێک پینە ئەرزێک نەبوو لەسەری بخەون بوون بە خاوەن سەدان هەزار دۆنم... لێیان پیرۆز بێ!

- بەشی هەرە زۆری ڕاپەڕین و بزووتنەوەکانی کورد دەچنە خانەی بەرگری لە خۆکردن و ملدرێژکردن بۆ بەر کوتەکی داگیرکەر، نەک دەرچوون و هەڵمەتبردن و بەرپاکردنی شۆڕش، یا وەک دەڵێن تۆپەکە هەمیشە لە گۆڕەپان و گۆڵی کورد خۆیدا بووە! ئەمە هۆی چییە؟ لە فەرهەنگی فکری و سیاسیی ئێوەدا شۆڕش چ پێناسەیەکی بۆ دانراوە؟ بە کێ دەگوترێ شۆڕشگێڕ؟ شۆڕشگێڕی ڕەسەن دەبێ چۆن بێت؟

من لە نووسینی کۆنترم گوتوومە: لە پاش تێکچوونی دەوڵەتی ماد، کە باپیری کوردانن، تێکرای کورد و کوردستان کەوتە نێو ئاڵقەی سێ بنگەی ژیاری «حضاری» و ئابووری و سیاسییەوە کە بریتی بوو لە

1- ئیخمینی
2- چی پێی دەگوترێ ڕۆمان و گریک
3- بابل...

بە درێژایی مێژووی پتر لە 900 ساڵ (واتە لە نێوان 559 پ. ز و 660 د.ز. یەکەمیان تێکچوونی میدیایە، دووەمیان هاتنی ئیسلامە بۆ سەر ساسانییەکان) کورد لە کۆیلەیی بەولاوەی بەخۆیەوە نەدیتووە. لەوساوە هەتا ئێستاش کورد «سەرمایە»ی نەبووە بیکاتە بژێوی ڕاپەڕینێک چونکە داهاتی ساڵانەی وەک ئاوڕێژی چیاکانی، ڕژاوەتە ئەو سێ مەڵبەندە تا ئەوەی «صراف»ێکی کورد لە ماوەی 1800 ساڵ پەیدا نەبووە چ جایی بانکێکی کورد. ئیسلامەتی کە حکوومەتی ساسانیانی تێک دا بەشێک لەو گەلانەی شیمالی سنووری ئێران بوون بە خاوەن حکوومەت چونکە وڵاتیان دوور بوون لە هێزی عەرەب، هەرچی فارس و کورد بوو نزیک بوون لە ناوچەی حوکمی ئیسلام بە تایبەتی کوردەکە کە جیرانی دەرک بە دەرکی عەرەب بوو، سەرلەنوێ کەوتەوە نێوان چەند دەوڵەتێکی وەک فارس و تورک، کە تورکەکە دوو پارچەی کوردستانی لە دەستدا بوو (بگرە سێ پارچە، بە هی سووریەوە). بێ ئەوەی دەفتەری سپی بخوێنمەوە دەڵێم ئەگەر هاتبایە کوردەکە سەرلەبەری بەردەستی یەک حکوومەت بووایە لە دوو ڕووەوە بە قازانج دەگەڕا. یەکیان ئەوەیە لە دەرفەتدا یەخەگیری یەک دوژمن دەبوو نەک دوو و سێ. دووەمیان ئەوەیە (دیسانەوە دەڵێم لە دەرفەتدا) هەموو کوردەکە نەک سێیەکی و چواریەکی پەلاماری تاکە دوژمنەکەی دەدا. ئەمە دەڵێم بە پشت ئەستووریی ڕاستییەکی بەدیهی کە ئەگەر هەموو کوردەکە بەردەستی توورک بوایە ژمارەی پتر دەبوو لە تورک هەروەها بنگەی ئابووری و حوکم و زانستیی پتر دەبوو لە کوردستانێکی سێ لەت کراو.

دەبێ بزانین کە کورد یەکیەتی «وڵات»ی بۆ ڕێک نەکەوت و ڕووبەڕووی واقیعێکی دژواری نەفسبڕ بوو، لە لایەن ئابوورییەوە هەمیشە لە ژێر سفرەوە بووە بە پێی قیاسی تفاقی شۆڕش (چاکترە بڵێین هەڵگەڕانەوە، چونکە بەر لە صەدان ساڵ وشەی شۆڕش جارێ پەیدا نەبووبوو) کە یەخەگیری دەوڵەتێک دەبێت. ناوناوە عەشیرەتێک بە ناچاری و لەبەر زێدە ستەم یاخی بووە لە حکوومەت، هەموو جارانیش عەشیرەت تێکشکاوە...

یەکپارچەبوونی وڵاتێک لە جیاتی سێ پارچەیی و چوار پارچەیی نیعمەتێکی بێ مزە و ئەرکە چونکە لە هەموو حاڵاندا «یەکبوون» ئامانجێکی زێدە گرنگ و بنەڕەتیی نەتەوانە، تا ڕادەیەک، ئێستاش نەتەوە لەباری تایبەتیدا کە بۆی ڕێک کەوت بەشێک لە وڵاتی جیرانەکەی دادەبڕێت بۆ خۆی جا ئەگەر جیران تێروتەسەل بوو کەس تەمای لێ نانێت...

لەم سەردەمەدا حاڵی کورد و دراوسێکان و هاوپشکەکانی هێندەی ڕۆژی نیوەڕۆ ئاشکرایە. پرسیارەکەی خۆت بخەرە بەر تیشکی ئاخەلێوەی صەدەی بیستەم و فەجری بیستویەکەمەوە، کە زانیت کوردی ڕۆژگاری زانست و تەکنیک لەگەڵ هەموو هەڕەشەی کوشندەی تێیدایە و بەدەورییەوەیە ئەمجا لە نێوان سێ ڕێی حیکایەتان کە یەکیان ڕێی هاتە و یەکیان هی نەهاتە و یەکیان هی هات و نەهاتە مامە کوردە بی دوودڵی مل لە ڕێی نەهات دەنێ ئیتر بۆچی سەرت سووڕبمێنێ لە کوردی کۆچەری لەتکراوی بەر لە 500 – 1000 ساڵ نەزانێ و نەتوانێ عەقڵ و هێزی پاش 1500 ساڵی هەبێ بۆ دروستکردنی دەوڵەت؟ کە نەخوێندەواریش بوو... نانیش کەم بوو... دوژمنی زۆر بوو... بە دووی کلکی مەڕ و مانگاوە خەریکی کولەمەرگی بوو... نەیدەزانی حکوومەت چۆن دادەنرێ... بە خۆی ڕەوا دەدیت... پەندی «مریشک هێلکەی قاز بکات پاشەڵی دەدڕێت» حیکمەتی هەموو عومری بوو! من تێ ناگەم، کە ئەم پرسیارە هەڵبستێت بۆچی پرسیارێکی دیکە هەڵنەستێت کە بڵێ: ئایا لەبەر کام هۆی بەرهەڵست ئوتێلی 20 نهۆمی بەر لە 200 ساڵ لە عەبابەیلێ دروست نەکرا؟ مانای چی بێ فابریقەی لۆکەڕێسی لە بیتوێن پەیدا نەبووبێ لەو ڕۆژانەدا کە شێخ مەحموود حوکمداری سلێمانی بوو... کوا خەتی شەمەندەفەری نێوان قەڵادزە و ڕەواندز؟ سپاس بۆ خوا کەرتی «دز» لە هەردوو ناودا بە واتای «دژ- قەڵا» هاتووە نەک دزی شەو!

تۆ چاوپۆشی بکە لە دانەمەزراندی حکوومەت، شۆڕش... نازانم چی و بادەوە سەر ئەلفوبێ کە ئەرکی نییە، تاکە یەک کتێبی کوردیت نییە لە هەموو کوردستانی پان و بەرینی دوو، سێ صەد ساڵ لەمەوبەر، خۆ ئەوەی ڕاستی

بێ کەمتاکورتێکی شیعر و عەقیدە نەبێ هەر هیچت نییە لە نووسینی کۆندا... باوەڕ دەکەم ئەگەر یاخیگەرێکی کورد توانیبێتی بەر لە 500 ساڵ حکوومەتێکی ناوچەیی تێک بدات، گورج ڕەجای دەبردە بەر ناسیاوێکی غەیری کورد لە ڕووی مەرحەمەتەوە ڕازی بێت بە سەرۆکایەتیی دەوڵەت یان ئیمارەتەکەی؟ لەمەدا نەختێک بەلای نوکتەدا چووم بمبوورن هەرچەند لەسەر هەقیشم!!

چی تر لەسەر ئەم خاڵە ناڕۆم، چ پێناسەیەک بۆ شۆڕش دادەنێم؟ بەر لەوەی من یا غەیری من پێناسەی بۆ شۆڕش دیاری کردبێت شۆڕش لێرە و لەوێ ڕووی داوە. بەلای تەبیاتی منەوە یەکەم شۆڕشی پڕ بە پێستی پێناسەکەی خۆی شۆڕشی فرەنسە بووە هەرچەند لە ئاکامدا خۆی فشاندەوە، بەمەشدا کۆتایی بە گەپێکی خوێناوی و مردەزاد هێنا... ڕاستییەکەی، هەروەک ڕەمزی $H_2O$ دەلالەتی ئاوی هەیە و پێش دۆزینەوەی ڕەمزەکە ئاو هەر ئاو بوو، شۆڕشیش بێ پێناسە ڕووی دەدا. لینین لە نووسینێکی گوتوویەتی شۆڕش بەندە بە دوو مەرجەوە

1. نەمانی ئیمکانی ڕازیبوونی خەڵک بە دەوامەی حاڵەتی واقیع.
2. بێدەسەڵاتی حکوومەت لە بەردەوامیکردنی خۆی...

من پێشتر ڕەخنەم لەم بۆچوونەی لینین نەگرتووە، با بڵێین لێی بێدەنگ نەبووم، سەبارەت بەو ڕاستییە کە ڕەخنەگرتنەکە فەرقێکی ئەوتۆی بە بابەتەکەی نووسین نەدەکرد. وا لێرەدا دەڵێم مومکینە شۆڕشێک سەرکەوێت هەرچەند ڕێژیمیش گەندەڵ نەبووبێت وەک کە شۆڕشی 14ی تەمووزی 1958 کە ڕێژیمێکی زێدە ڕەگداکوتای هەڵکەند، ئەوجا ئەگەر لیوای بیست ڕێگەی بەسەر بەغداوە نەبووایە شۆڕش هی ڕوودان نەبوو.

کە بتەوێ لێم، پێناسە بۆ شۆڕش هەڵنێم دەڵێم و زۆر بە سادەییش دەڵێم، شۆڕش بریتییە لە هەڵگەڕانەوەی بەشێکی زۆری میللەت دژی ڕێژیم بە

نیازی لادانی. لەمەدا سەرکەوتن مەرج نییە چونکە دەشێ شۆڕش سەرنەکەوێت، مەرجیش نییە لایەنی بنەڕەتی لە شۆڕشدا ببێتە حاکم وەک کە لە شۆڕشی 14ی تەمووز لایەنی قەومیی عەرەبی جێگەی پێ چۆڵ کرا بۆ لایەنی هەرە چەپ... چەپەکەش لە مامڵەتی سیاسیدا خۆی دۆڕاند...

من کە لە پێناسەکەمدا مەرجی «بە نیازی لادانی – ڕیژیم»م بەهەند هەڵگرت ویستم شۆڕش جودا بکەمەوە لەوەی پێی دەڵێن ئاژاوەی بێنیاز، بێئامانج کە بە «فتنة»ی پێ دەڵێن...

ئەوجا بە کێ دەگوترێت شۆڕشگێڕ؟ لە وەڵامدا دەڵێم: شۆڕشگێڕ کەسێکە بەشداری بکا لە شۆڕش!

شۆڕشگێڕی ڕەسەن پێویستە چۆن بێت؟ باوترین پێناسە ئەمەیە، کەسێکە فەرمانبەرداری سەرۆکایەتیی شۆرش بێت بێ ئەوەی بپرسێتەوە لە چەندوچۆنی فەرمانەکە.

ئەوەیە پێناسەی تەقلیدی و ڕەسمی، بەڵام تۆ بەدوا پێناسەی شۆڕشگێڕایەتیەکدا خەریکی کە لەگەڵ تریفەی قودسیەت و شەرەفی جانفیدایی جووت بڕوات. ئا لێرەدا کارەکە ڕوو لە سەختی دەکات. کە هانا ببەینە بەر گیانی شۆڕشگێڕیی سەردەم و کۆنتر لە کردەوەدا، ماڵم هەقە، شۆڕشگێڕانی دوو نەتەوەی دوژمن بە یەکتر و شۆڕشگێڕانی یەک نەتەوەی دەمی نیزاع (وەک کوردی خۆمان) بە جۆرێک یەکتر خائین و خوێنمژ و دڕندە دادەنێن هەرگیز دوو ناحەزی ناشۆڕشگێڕ هەتکی ئەوتۆ بەیەکتر ناکەن، بە بیریشیاندا نایەت تۆمەتی خیانەت وەپاڵ یەکتر بدەن هەر نەبێ لەبەر ئەوەی کەسێکی شۆڕشگێڕ نەبێ و نیزاعی لەگەڵ خەڵکدا هەبێت مەسەلەی خیانەت لەو نیزاعەدا جێی نابێتەوە. کە تۆ نیزاعت لەسەر مڵکایەتیی دوکانێک هەبوو لەگەڵ برات یان جیرانت نە ئیستیعمار و نە دەرەبەگ و نە حیزبایەتی بە دەنگ نایەن لەو نیزاعە تا خەیاڵی خیانەتی لێ بکرێت.

بێ ئەوەی ڕێم هەبێ حوکم بەسەر فکرەی «شۆڕش»دا بدەم، بە دڵی ئارامەوە دەڵێم شۆڕشێکم نەدیت و نەبیست دروشمەکانی خۆی نەپێچابێتەوە پاش گەیشتنی بە حوکم وەیا لە هەوڵدانی دەمی نزیکبوونەوەی لە حوکم، خۆ هەر شۆڕشێک ناکام و بێ سەروبەر و دوورەئاوات بووە بارتەقای جەنگی دۆڕاو زیانی لە خۆی و خەڵک داوە. نیگایەکی بە پەلە بۆت ڕوون دەکاتەوە کە زۆربەی هەرە زۆری شۆڕشگێڕان کەسانێکن بێ ژن و ماڵ یان ژن و ماڵیان بە مل خەڵکەوەیە. خۆیشت دەزانی تاکە یەک شۆڕش بە ئارەزۆ و داخوازیی زۆربەی میللەت نەبووە. لەم ڕاستییەشدا دوو هەڵوەست خۆی نیشان دەدات، یەکێکیان ئەوەیە، ئەگەر شۆڕش بەند بێ بە بڕیاری زۆرینەی میللەتەوە ڕەنگە بە دەگمەن نەبێ شۆڕش ڕوو نەدات چونکە زۆرینە ڕێی نییە دەستی چیا و چۆڵ بگرێت جگە لەوە کە شۆڕشگێڕی و خەباتی ئازادیی گەل و چین نەبێتە باوەڕ و مەراق و خولیا، ئەو بابەتە خۆشکەڵەیە نین وەکوو سەیرانی بەهاران خەڵک بۆی بجمێت.

هەڵوەستی دووەم ئەوەیە، کەمایەتییەکی گەل کە بریتییە لە خوێندەوار و گەنجی ئاشقە پاڵەوانەتی و بێ ئەرکی خێزان و هەمیشە گوێدێری ڕابەری خوێنگەرم و هاندەر هەستی نارەزاییان بە کوڵ دێت و دەماری ئازایەتییان هەڵداوێت، لە بەرانبەردا هاندەرێکی تەوژمدار بۆ سەرپێچی و یاخیگەری تەرازووی لەنگەربەزیوی گەلە، کە بەشی زۆری ڕەنجدەر و کەمدەرامەدە و کەمایەتییەکی تێروتەسەلی لە کامەرانیدایە، حکوومەتیش لەو وڵاتانەی خۆمان لێیان شارەزاین پتر خۆ تێرکەرە تا ئەوەی برسی تێر بکات. چیترت بەم لێکدانەوەیە ماندوو ناکەم و پێناسەیەکت بۆ ڕەنگرێژ دەکەم بتوانێ «شۆڕشگێڕی نموونەیی – ڕەسەن» بە خۆیەوە بگرێت. کەسێک ئەو وەسفەی پێ ڕەوا دەدیترێت کە:

1. ڕۆشنبیرێکی فرەلانەیە بێت.
2. واقیعبین بێت.
3. مومکینخواز بێت.

4. درەنگتر لە خەڵک خۆی بە بیردا بێت.

لزووم نابینم لەمە زیاتر باری قورس بکەم، لەمەش کەمتر بە کەڵکی نموونەیی نایەت. کە بمانەوێ ڕابەری بزووتنەوەش بێت مەرجی تر هەن بخرێنە سەر ئەم مەرجانە...

- دروشمی ئازادی و یەکسانی، لە دروشمە زیندوو و گرنگەکانی مێژووی مرۆڤایەتی دەژمێردرێت و تا ئەمرِۆکەش خەبات لە پێناویدا هەر بەردەوامە. دڵسۆزان و کوردپەرستانی خۆشمان هەوڵ و قوربانییان بۆ داوە و دەدەن، کەواتە ئایا:

1) ئازادی چییە و بۆ مرۆڤ چ بەهایەکی هەیە؟ ئازادیی بیروباوەڕ بۆ ئێوە چ دەگەیەنێ؟
2) سەرمایەیەکی لە ئازادی بەنرختر بۆ مرۆڤ هەیە؟
3) مرۆڤی ئازاد کامانەن...؟
4) دوا سنووری شیاوی ئازادیی مرۆڤ کوێیە؟ مرۆڤایەتی بە کام سنووری ئامانجی ئازادی گەیشتووە؟
5) لە یەکسانی چۆن دەڕوانن؟
6) باشترین ڕێباز و بەرنامە بۆ یەکسانکردنی کۆمەڵ چۆنە و چییە؟
7) دەکرێت ئامانجی یەکسانکردنی کۆمەڵ لە ماف و بەکارهێنانیدا وەک ڕێبازێکی فکری و سیاسی تێ بڕوانین؟ خەبات و قوربانی هەڵدەگرێت؟
8) گەر کۆمەڵگە یەکسان بکرێت، چ هەل و دەرفەتێک باشە بخرێتە بەردەم تاکی هەڵکەوتوو؟ یاخود لە کۆمەڵگەی یەکساندا چ هەل و دەرفەتێک بۆ تاکی هەڵکەوتوو دەمێنێتەوە؟

خاڵی یەکەم: ئازادی چییە و بۆ مرۆڤ چ بەهایەکی هەیە؟ ئازادیی بیروباوەڕ بۆ ئێوە چ دەگەیەنێ؟

خۆزی چشتێکت دەگوت لە لای خۆتەوە هێمای تێدا بێت بۆ واتای «ئازادی» بەو پێیەی تێی گەییشتووی چونکە «ئازادی» وەک بەهار و ئاو و پەنیر و دامە... ئاشکرایە. تەنانەت خاڵی دووەمی پرسیارەکەت کە دەڵێ: سەرمایەیەکی لە ئازادی بەنرختر بۆ مرۆڤ هەیە؟ تێماندەگەیەنێ کە خۆت ئازادیت نرخاندووە...

ئازادی بە مەفهوومی قامووسی بریتییە لە نەبوونی قەید و زنجیر بە دەست و پێی مرۆوە. دواتر نەبوونی قەید و زنجیریی مەعنەوی خرایە سەر هی ماددی. لەو قەیدە مەعنەوییانەش چەندین جۆر و پلەیان لێ کەوتەوە... وا دەبێ تاوانێکی عەیبدار، لە هەندێ قانووندا، دەبێتە هۆی کەمبوونەوەی مافی مەدەنی و سیاسی... هەر هەمان تاوان لە نەتەوەیەکی دواکەوتوودا دەبێتە هۆی پاڵەوانەتی... لە سێبەری قانوونی کۆیلەسەلمێندا دەشێ منداڵ لە پزدانی دایکیدا کۆیلە بێت و بە دایکەوە بفرۆشێت... خولاسە بەبەرەوەنیشتنی باسی «ئازادی» لە هەموو ڕووییێکەوە و بە پێی چەندوچۆنی واتای وشەکە لە ڕۆژگارێکەوە بۆ ڕۆژگارێک و لە گەلێکەوە بۆ گەلێک، تا بڵێی درێژخایێنە و بەشی زۆریشی بەکەڵکی ڕاوێژی پرسیارەکەت نایێ. بە ناچاری وەڵامت دەدەمەوە بە پێی تێفکرینی خۆم و بەجۆرێک و تاڕادەیەک تامەزرۆشکێنی پرسیارەکەت بێت:

1. ئازادی دژی کۆیلەیی، عەبدایەتی.
2. ئازادیی گەل لە حوکمی بێگانەدا.
3. ئازادیی تاکی گەل لە سێبەری ڕێژیمەکەیدا.

بەندیکردنی تاک بە پێی حوکمی قانوون دەخلی نییە بەسەر بابەتی نووسینەوە.

هەرچی مەسەلەی کۆیلەیی، عەبدایەتییە لەوانەیە لە حیساباندا دوور خرێتەوە چونکە خەریکە دەوری بەسەردەچێت یاخود بەسەر چووە. ئێستا لە بری عەبدایەتی، دەستبەسەرییەکی هەمەگیرتر هەیە پێی دەڵێن چەوساندنەوەی نەتەوەیەک لەلایەن نەتەوەیەکی زاڵترەوە. ئەم دەستبەسەرییە لە سێ سەرچاوە ئاو دەخواتەوە. یەکەمیان بێ دەسەڵاتی ژێردەستەکە. دووەمیان چی پێی دەڵێن شەرعییەتی نێودەوڵەتان وەک کە میللەتێک بە ژێر دەستی ماوەتەوە تا ئەم ڕۆژگارە ئیتر سنووری نێوان دەوڵەتان دەبێتە مانیعی دەست تێوەردان لە گۆڕینی حاڵەتێکی سەلمێنراو لە لایەن جیهانەوە. نموونەی هەرەنزیک کورد و بەلووچە. سێیەمیان بەرژەوەندی زلهێزەکان کە دەتوانێ حاڵەت دروست بکات بۆ قیلەشەرعیی پسپۆڕانە بە پێی ئیمکان و لوان. ڤیتۆی مەجلیسی ئەمن کە وەکوو شیری بڕندەیە لەوانەیە بە مشتوماڵدانی چەورولووس و نەختێک هەنگوین هەڵسوون لە مەلاشووی تامەزرۆیان بەلای نەرمی و نیانیدا بێتەوە بۆ بەر مجێز و سوودی زلهێزان.

ئازادیی تاکی گەل بە دەست حکوومەت و دەسەڵاتداری ڕێژیمەوە لەم ڕۆژگارەدا موشکیلەی ملیارەها هاونیشتمانییەکانی جیهانی دواکەوتووە و هێندەی سەفەرەکانی سەندباد درێژخایێنە و ترووسکەی ئومێدێکی نزیکیش نییە موژدەی ڕەهابوونی لەگەڵدا بێت. چەندی سەر دەهێنم و دەبەم تارمایی زرەخەونیش نابینم بە بۆرە تەئویلان سەر بکێشێتەوە بۆ ڕەهابوونی ئاپۆرەی ملیارەهای جیهانی سێیەم و بیستەم و شەستەمین لە تەپک و داو و زیندانی خەفەبوون، بە هەوڵ و کۆشەش و خەباتی چاوساغانەی خودی نەتەوەکان. لە جیاتی چاوکرانەوە و هۆشپژان و هەست بە ستەم کردن تازە بە تازە کاکی ئاخەلێوەی سەدەی بیستەم دەچێتەوە بۆ جێوانەوەی فکری ئەو سەردەمانەی بەهەشتی تێدا دەفرۆشرا. خۆتەفرەدان بە گەشبینی و نەڕەنەڕی چەند قۆڕەدەماغێکی نیمچەشێتی نیمچەبەنگکێش و بەخۆوەگلاو و شەکەشەکی دروشمی خەیاڵی و هوتافی هەرزەکارانەی نەکوڵاو و نەگەیشتوو بریتی دەبێ لە پتر ڕۆچوون لە کەودەنی و ئیفلاس... دوورتر کەوتنەوە لە هەموو ئومێد و

ئاواتێک... کشانەوە بەرەو تاریکایی سەدان ساڵ... لەم دەمەدا کە جیهانی پێشکەوتوو خەریکە هەندەسەکەی «مرۆی ئایدیەل»ت بۆ بنیات دەنێت، مرۆی جیهانی تاریکمان خەریکی شەڕێکی خاچپەرستانەیە دژی خۆی... دژی هۆش... دژی کامەرانی، داد، ئازادی، پێشکەوتن، مافی مرۆڤ... ڕۆشنبیرەکەی ئەورووپانشین لەتلەتە و هەر یەکە لە خەیاڵێکی موستەحیلدا دەژیت و دەرگەی «یەکبوون»یشی لەسەر خۆی داخستووە... حاڵەتێکی شکڵ مزاشی تێکەڵبوونی خورافاتی هەزاران ساڵ لەمەوبەر لەگەڵ ژیارێکی ئاسمانپشکن و زرڕەقڵاش جیهانی ڕەشداگەڕاوی سیوسێیەمی لە خۆیدا گرتووە. سەد خۆزیی بە سادەیی جەهالەتی سەرەتای سەدەی بیستەم و ناوەندەکانی سەدەی نۆزدەم. قوڕ بەسەر ئازادی و دیلی و ژێردەستی. هیچ کامێکیان خۆی ناناسێتەوە لەو تێکەڵپێکەڵییەی سەرێکی دەگاتەوە مەیموون و سەرێکیشی گەشتی ناو ئەستێران دەکات... بەڵام دەبێ بزانین مەیموونەکە ئاشناترە لەگەڵ مجێز و لێهاتوویی زۆربەی ئەو ملیارەهای بەشەری هەشلەبەری جیهانەکەی خۆمان!

ئازادی...؟ یەکسانی...؟ ئەم فکر و فەلسەفەیە بەو شێوەیەی تۆ پرسیاری لەسەر هەڵدەستێنیت لە ئاپۆرەی ملیارەها مرۆی دواکەوتوو، جارێ، بێگانەیە. ئازادیی بیروباوەڕ و حیزبایەتیی و دەنگدان و هەڵنانی ڕێژیمی سیاسی و دانانی یاسا و ڕەنگرێژکردنی بناخەی ئابووری و ئەو جۆرە بابەتەی سەر بە هەیکەلی «دەوڵەت»، بە حکوومەت و میللەتیەوە، لە وەهم و خەیاڵی وەرزێر و ڕەنجدەر و مرۆی کووچە و بازاڕدا ڕەگێکی نییە نەک بنجی دانەکوتاوە. نەک ئەمەندە و بەس، بگرە نوێنەری میللەتەکە لە مەجلیسی نائیبان بەشێکی بەرچاوی نازانێ قانوون چۆن بەوەلەد دەبێت هەرچەند دەنگیشی داوەتێ. لێرەدا نوکتەیەکی واقیعیم بە بیردا دێت خزمی مەسەلەی بەردەستمانە. مامۆستایەکی مزگەوت لە سەرەتای بیستەکاندا بوو بە موعەللیمی مەکتەب لە کۆیێ. کاتی ئیمتیحان هات... مودیر چووە ژوورەکەی ئەو مامۆستایە، دیتی دەرس بە منداڵان دەڵێتەوە. کە پێی گوت دەبێ ئیمتیحان بکات، پێی گوتەوە،

توخوا دەرس چاکتر نییە لە ئیمتیحان؟ خولاسە ناچاری ئیمتیحان بوو، فێر کرا نومرەش بە قوتابی بدات ئیتر چۆنی ڕێک کەوتبایە - یەکێکی (9)ی درابێتێ دەچووە لای و گلەیی دەکرد لەسەر کەمیی نومرەکەی ئەویش دەیگوت، مردووت مرێ چ لە نومرە دەکەیت فەرموو ئەوا کردمە 12 نومرە... نوێنەری مەجلیسی نائیبانیش هەروەها بوون.

بابای جیهانی سەدوسێیەم چ مەبەستێکی نییە هەقی دەنگدانی هەبێت، ئەوەندەی بەسە بە خۆڕایی بەندی نەکرێت... پیتاکی لێ نەسەندرێ... ملکی لێ داگیر نەکرێت... ڕەهەندەی ولاتان نەکرێت... لەسەر ڕەنگی زەرد و سەوز مندالی لە مەکتەب دەرنەکرێ... لەمەشیان خالەبەخش بە کاکە هەلۆ، با کوڕی دەرکەن، ژیانەکەی، ڕۆحەکەی مسۆگەر بکە بۆی!! دەبینیت، برای ئازیز واقیع چەند دوورە لە تەما و خەیاڵ و فەلسەفە. لەم ڕۆژگارەدا چەندین نەتەوە هەن ئاواتیان ئەمەیە، مەمانکوژن... دەرمانمەکەن... لە برسانمان مەمرێنن... کیژەکەم بە مارەبڕاوی لێ بستێنن!!

جارێ ڕووپەڕەیەکی خۆشکەلانە ماوە هەڵیدەینەوە. ئەگەر ڕێکخراوە سیاسییەکان هەموویان دەسەلاتدار بوونایە چۆناوچۆنی یەکتریان قبووڵ دەکرد؟ گومان نییە لەوەدا کە تاکێکی دەسەلاتداری ڕێکخراوەکان نایەتە ڕەدایێ لەگەڵ هیچ یەکێکیان مەگەر لە دوو حاڵەتدا:

1- حاڵەتی ناچاری.
2- ئومێدی سوودێکی خۆی و بێسوودیی لایەنەکەی تر یاخود کەمسوودێکی ئەو لایەنە...

ئەوجا کە حاڵ گەییشتە سەر و حەدی دەسەلات گرتنە دەست، لایەنێک ئەوانی دیکە دەپێچیتەوە بە تۆمەتی خیانەت و تەماع و ڕەجعیەت و بێدینی و بێمەبدەئی، وەیا تۆمەتی دینداری و مەبدەئی پەڕگیر و ڕەوتی چەپخوازی... ڕاستخوازی... ناوەندخوازی... هیچخوازی... بێخوازی... زۆرخوازی. خولاسە ئەوە دەکرێ کە خومەینی کردی لەگەڵ دۆستەکانی، یان عەبدولکەریم

كردی لەگەڵ عەبدوسسەلام... عەبدوسسەلام لەگەڵ بەعس... بەعس لەگەڵ غەیر... ناصر لەگەڵ بەرەی ئیسلامی... هتد!! تاكە هێزیش كە دنیای بۆ تەخت بوو با دەداتەوە سەر خۆی، لووتكی سەرەوە بە ناوی پاك و قاڵبوونەوە قەسابخانە دادەنێت بۆ هەر كەسێكی و لایەنێكی تەبیاتێكی مەڕەمێشەی نەبێ، پاڵەوانی دەمی خەباتی ئازادی دەبێتە یەكەم خائین و چاوی دەكۆڵرێت و دەپلیشێتەوە...

سەرت نەیەشێنم پرسیارت لە بارەی ئازادی چییە...؟ سەرمایەی بە نرختر هەیە؟ مرۆڤی ئازاد كامانەن؟ لە وەهم و خەیاڵیشدا خەباتگێڕانی جیهانی سێیەم ناگرێتەوە چونكە لە سەربڕین و زگدڕین و هەلاهەلاكردن خەڵاتی دیكە نییە بە خەباتگێڕی ڕاستەقینە و بەشەرەف ڕەوا بدیترێ! لەمەشدا سەرەڕای نزمیی ڕێكاری شارستانەتی لە جیهانی سێیەم و نەبوونی تەجرەبەی دیمۆكراسی لە هەموو مێژووی هەزارانساڵیدا، ڕاهاتنی خەباتگێڕان بە كوشتن و سووتاندن و كوژران و سووتان لە هەر هەنگاوێكی فیداكاری هەڵیاننابێ بە ناچاری لە ڕوانگەی دڕی و توندی و تیژییەوە سەیری هەڵوەست دەكات و كردوویەتی، لە فەرزی هاوڕێكەی بە دڵی پاكەوە ڕەخنەیەكی گرتبێ، باڵادەستی خەباتەكە هەم لە ترسی نزمبوونەوەی خۆی كە بە زۆری دەكشێتەوە بۆ ڕمان و هەم بە داخوازیی پتەوایەتیی ڕیزی خەبات لە ڕێی سڕینەوەی هەر پنۆكێكی لە قسە و ڕەخنەی ئەم و ئەوەوە بە خەباتەكە هەڵپڕژابێ، ئا ئەو باڵادەستە بە فەرمانی سەرشانی خۆی دەزانێ كەلێنی ڕەخنەكە لەگەڵ دروستكەرەكەی پێكەوە داپۆشرێن... نەمێنن! ئەمجا ئەگەر مومكین نەبوو ڕەخنەگرەكە تێبچێ ئەوسا گرووپەكە كەرت دەبێت و دەكەونە گیانی یەكتر هەتا خوا بەرەحمی خۆی لایەكیان تەفرووتونا دەكات، لەویش بەولاوە بۆ دوارۆژ، دیسانەوە، خوا كەریمە!!

من لە گەڵتدا دەسبەتاڵ بووم لە وەڵامی پرسیارت، ئازادی چییە؟ چی بەنرختر هەیە لە ئازادی؟ مرۆڤی ئازاد كامانەن...؟... چی؟ و... چی؟ دەمێنێتەوە وەرچەرخێی سەر یەك لە دوو ڕێگایان:

1. ڕێی گرتنەبەری لێکدانەوەی تەجریدیی واتای وشەکان،
2. واتای وشەکان لە کردار و گفتار و ڕەفتاری نەتەوە پێشکەوتووەکانەوە هەڵێنجم کە بە هیچ جۆرێک لەگەڵ واقیعی جیهانی سێیەم ئاشنا نین، ناشیەنە بەر هەنگاوی خەباتکەری خۆماڵی و وەک ئێمەمانان.

لەو هەشت خاڵانەی پرسیاری پێنجەمت سێ خاڵی سەروو واز لێ دەهێنم هەرچەند نەختێکیشم دەست تێوەرداون بەڵام بە جۆرێکی نیوداشت کەوا نە خەریکی واتای تەجریدییان بووم و نە لە گۆشەنیگای واقیعی حاڵی خۆمانەوە هەڵسەنگاندوون. چی دەمێنێتەوە لەو پێنج خاڵانەی دواتر، پێیاندا دێم بە پێی لزوومێکی وەڕسم نەکات چونکە پێوەندییەکی زیندووی بە جیهانە وێرانەکەمانەوە نییە و پتر بەلای باسی ئەکادێمی تێدەڕوانێ هەرچەند لە وڵاتی پێشکەوتوودا فکرەی ئەکادیمی و لایەنی عەمەلییان خزمن لەگەڵ یەکتردا.

خاڵی چوارەم دەپرسیت، دوا سنووری شیاوی ئازادیی مرۆڤ کوێیە؟ مرۆڤایەتی بە کام سنووری ئامانجی ئازادی گەیشتووە؟

دوا سنووری شیاو بە ئازادیی مرۆڤ ئەوەیە کە لە دوا پلەی کۆمیونیزمدا دێت و بەر مەفهوومی ئەنارکیزم – بێحکوومەتی دەکەوێت. چاوسوورکەرەوە کۆمپیوتەر دەبێت نەک حاکم و پۆلیس و زابت...

سنوورێکی ئازادی کە مرۆڤ لەم سەردەمەدا پێی گەییشتبێ ئەو نموونەی زێدە پێشکەوتووی جیهانی ڕووناکە وەک سوێد و نەرویج و دانمارک و سویسرە و بەشێکی تری ئەورووپا و ئەمەریکا و تاک و تەرای ئاسیایە وێرای ئوسترالیا و نیوزیلەند...

خاڵی پێنجەم دەپرسیت، لە یەکسانی چۆن دەڕوانن؟

من لە ڕەفتاری مومکیندا بە یەک چاو سەیری ئادەمیزاد دەکەم. ڕقی گەورەم لە هەڵاواردن و پێشخستن و پاشخستن هەیە. کەسێک تامەزرۆی بەرچاوی و سەرامەدیی بێت حەقارەتی نەفسی خۆی تێدا دەشارێتەوە… یەکسانیش دوو مەفهوومی هەیە،

1. یەکسانیی مافی مرۆڤایەتی لە ئاست یاسادا.
2. یەکسانیی دەرامەد.

لە لایەن مافەوە ناشێ زبڵکێش و سەرۆکی دەوڵەت فەرقیان هەبێ. لە لایەن دەرامەد و داهاتەوە، پشکی هەموو هاونیشتیمانییان لە داهاتی وڵات، تا مومکین بێ، پێویستە چون یەک بێت لەگەڵ تێبینیکردنی ئەرکی بەرپرسیارەتیی لەو فەرمانەی بە ملەوەیە کە ناشێ سەرۆک دەوڵەت بە پاسکیل بۆ دائیرە بچێت. پاش ئەو یەکسانییە کەسێکی زێدە خزمەت وەیا ئیبداعێکی پێشکەش کردبێت دەبێ پاداش وەرگرێت چ لە وەزیفەدا بێت (بە زیادیی مەعاش) و چ لە کاری ئازاددا بێت لە بازاڕی کڕین و فرۆشتن. کە ژین و گوزەران مسۆگەر بوو هەتا مومکین بێ دەبێ ڕێی ئازادیی هەڵبژاردنی کار لە دەست تاکدا بێت یان کۆمەڵێکی یەک کار بگرنە بەر.

خاڵی شەشەم دەپرسیت، باشترین ڕێباز و بەرنامە بۆ یەکسانکردنی کۆمەڵ چۆنە و چییە؟

هەتا ئێستا دیمۆکراسی بەرینترین و ڕاستترین شەقامە بۆ ئازادی و یەکسانی لەگەڵ دوو تێبینی هەرە گرنگ

1. دیمۆکراسی لە تەتبیقدا بەندە بە پلەی هۆشیاری و ژیاریی خەڵک.
2. دیمۆکراسی لایەنی مافی سیاسی یەکسەر نابێتە چارەسەرکردنی لایەنی بژێو و گوزەران و پیشەسازی و لەشسازی و ڕێ و بان و فرۆکەی تازەمۆدێل. تەنانەت عێراقی پێش 14ی تەمووز بەرنامەی

ئاوەدانکردنەوە «اعمار»ی عێراقی بە چاکی و ڕێکی خستبووە کار هەرچەند لایەنی دیمۆکراسییەکەی لەنگ بوو.

گەییشتنە پلەیەک لە خۆبەستنەوە بە لایەنی پرۆپاگەندە تا ئەوەی پرۆژەی بێکەڵک ملیارەهای لێ سەرف دەکرا هەر بە نیازی نیشاندانی کاریگەرایەتیی و چالاکیی حکوومەتی سەرتەخت لە ڕادیۆ و تەلەڤیزیۆن و ڕۆژنامەدا. هەرچی حکوومەتی پێش 14ی تەمووز بوو گوێی نەدەدایە لایەنی دیعایە، خۆ هەر شتێکی بیکردایە بۆ ڕەزامەندیی خەڵک کەس پێی باوەڕ نەدەکرد...

خاڵی حەفتەم دەپرسیت، دەکرێت ئامانجی یەکسانکردنی کۆمەڵ لە ماف و بەکارهێنانی مافدا وەک ڕێبازێکی فکری و سیاسی تێی بڕوانین؟ خەبات و قوربانی هەڵدەگرێت؟

پرسیارەکەت باز دەهاوێت بۆ زەمانێکی کورد بە مافی پێکهێنانی دەوڵەت گەیشتبێت. شیوعییەکان بەر لە چل ساڵێک، لەسەر کاغەز و بە کردەوە لە خەباتی سەخت و نەزۆک، ئەو یەکسانکردنەی مافی کۆمەڵ و بەکارهێنانیشیان کرد بە دروشم بەڵام ئەوان کوردیان دادەنا بەشێکی عێراق بن وەک عەرەب، گۆیا فەرق نەبوو لە نێوان کورد و عەرەب... !

کاکی بەڕێز و خۆشەویست، ئەگەر مومکینە با جارێ خەریک بین کوردەکە خۆی واز لە براکوژی بهێنێت... چاوپشکووتوەکانی ئەورووپامان بێنە سەر ڕێبازێکی برایانە...

خاڵی هەشتەم بە کورتی، لە کۆمەڵگەی یەکساندا چ هەل و دەرفەتێک بۆ تاکی هەڵکەوتوو دەمێنێتەوە؟

ئەگەر من خاوەن پرسیار بامایە دەمگوت، تاکی هەڵکەوتوو لە کۆمەڵگەی یەکساندا چ هەل و دەرفەت دەمێنێ بە ڕوویدا نەکرابێتەوە؟ لە هیچ

حاڵوبارێکدا دەشێ دەرگە لە ڕوویدا دابخرێت؟ یەکسانی شتێک نییە هەڵکەوتووی پێ نزم بکرێتەوە بۆ ڕێکاری هەڵنەکەوتوو.

یەکسانی خۆی لە خۆیدا ئەوپەڕی ئازادیی مرۆ دەگەیەنێت، ئەوجا ئەگەر مرۆی عادەتی بەبەریەوە نەبوو سەر بە هەموو شوێنێکی زانست تێگەڕاو داگرێت سووچی خۆیەتی کە تەیار نەبووە بە تێگەیشتن. بابای هەڵکەوتوو ڕێی نابێ بە کووچە و کۆڵانە و بازاڕدا بگەڕێت و کاتی خۆی بێهوودە بە فیڕۆ بدات، هەڵبەت لەگەڵ کاڵای لایەق بە هۆش و گۆشی مرۆی بلیمەت مەمڵەت دەکات... بە پێی ڕوایەتی «محمد حسنين هيكل» وا دەردەکەوێت کە ئاینشتاین ناوی جمال عبدالناصری نەزانیوە، یان فێری نەبووە هەر بیکباشی ناوی دەبات... لە کۆمەڵگەی یەکساندا ڕەسسام بە دڵیدا نایەت سەرۆکوەزیران هی ئەوە بێت خەیاڵ بکاتەوە لە دیتنی یان پێگەیشتنی مەگەر سەرۆک خۆی بێتە دیدەنیی ڕەسسامەکە. کۆمەڵگەی یەکسان بەهەشتی مرۆی هەڵکەوتووە... !

- وەک دەزانین مێژوو یەکێکە لەو بوارانەی کە نەتانتوانیوە یان دەرفەت نەبووە ئەسپی خۆتانی بە ڕەهایی تێدا تاو بدەن! دەی وا ئەم دەرفەت و هەلە دەقۆزینەوە و دەپرسین:

1. مێژوو چییە و پێویستە مرۆڤ چ وانەیەکی لێوە فێر بێت؟
2. مێژووی کورد بە کام ئاقاردا ڕەوتی کردوە؟
3. چ هێز و هۆکارێک زیاتر حوکمی لەسەر عەقڵی کوردی کردوە؟
4. کورد مێژووی ڕاستەقینەی خۆی هەیە؟ یاخود مێژووی نووسراوەتەوە؟
5. توخمە پێکهێنەرەکانی مێژووی کورد چین؟ ئەقڵ یاخود قەزاوقەدەر حوکمی تێدا کردوە؟
6. ناسنامەی بیرکردنەوەی ئەقڵی کوردی کامەیە؟
7. عەقڵانییەت لە بیرکردنەوەی کوردیدا هەبووە و هەیە؟

8. سیاسەتمەداری کورد واقیعبین بووە یاخود کتوپڕی زاڵ بووە بەسەریدا و بڕیاری پێ داوە؟
9. نەتەوەی کورد لەبەردەم عەقڵی سیاسی کوردیدا چ چارەنووسێکی دەبێت؟ کورد پەندێکی هەیە دەڵێت: مانگەشەو سەر لە ئێوارەوە دیارە.
10. ئەقڵی کوردی ئەگەر هەیە لە چ پلەیەکی بیرکردنەوەیەدایە و گەر نییە بۆچی؟
11. پێویستە کورد چی لە مێژوویەکەی خۆیەوە فێر بێت؟

1) مێژوو چییە و پێویستە مرۆڤ چ وانەیەکی لێوە فێر بێت؟

زاراوەی مێژوو، بێ ئەوەی کەس مەبەستی بێت، بە زەحمەت پێناسەی بۆ دادەنرێت و مومکین نییە دایبڕیت لەو زەمانەی کە بە مێژوو دانانرێت و دیسان مومکینیش نییە ئەو ڕووداوانەی بە مێژوو حیساب ناکرێت لە دەفتەران بسڕێتەوە و مومکینیش نییە سەرلەبەری ڕووداوان بزاندرێت و ئەوی دەزانرێت هەمووی تۆمار بکرێت. ئایا دوێنێ کە پێنجشەموو بوو ئیمڕۆکە لێمان بوو بە مێژوو؟ ئەدی بەیانییەکەی ئیمڕۆ بۆ نیوەڕۆی ئیمڕۆ مێژووە؟ ڕۆژی لای ئێمە بە جموجووڵە، لە ڕووی ئەودیوی زەوی خەڵک پرخەی خەوی دێت ڕووداو کز دەبنەوە، کاممان مێژووین؟

جارێ لە پێشەوە دەبێ بزانین لە ملیۆنەها ڕووداوی سەر بە کۆمەڵان و ملیارەها ملیارەها ڕووداوی سەر بە تاک، تاکێکی ناچێتە تۆمارخانەی مێژوو... ڕۆژگاری خۆت و خانەوادەکەت و گەڕەکەکەت و شارەکەت لە دەمی تێپەڕینیان بە نەبوو دەبن مەگەر یەکێک لەو ڕۆحلەبەرانە قارەمانی ڕووداوێکی زرینگەدار بێت. شتێکی لە شکڵی «مێژوو» دەماودەم و کتێباوکتێب بە ئێمە گەیشتبێ ئەگەر هەمووشی ڕاست بێت هەر ناکا هیچ چونکە:

1- کەمێکی زێدەکەم لە ڕووداوان نووسراونەتەوە تا ئەوەی نەتەوە زۆرن ڕابوردوویان بە تەواوی لە تاریکیدایە.
2- ئەگەر مەساحەی ڕووداو و قسە و قسەڵۆک و مامڵەت و شەڕ و ئاشتی و وردیاتی کردار و ڕەفتار و گفتاری خەڵک لە ماوەی شەو و ڕۆژێکدا ڕەقەمی دەهەزاری بۆ دابنێین ڕەنگە کەمتر لە یەک ڕەقەم بەر ئەو شتانە بکەوێت کە بە مێژوو ڕادەگەن، 9999 کەی تر وەک دەنگی ڕەشەبا و قرەی قەل و گرمەی برووسکە و هاژەی ڕووبار لە خۆوە دەفشێنەوە و توونا دەبن.

بە ڕاستی و بێفێڵ لە خۆ و لە خەڵک کردن سەرلەبەری چەند و چۆنی هەموو ئادەمیزاد بریتییە لە مێژووی ئادەمیزاد. کۆمەڵایەتی و مێژوو یەک شتن، فەرقیان ئەوەندە هەیە کە لە زاراوەی زانست و هونەر و چالاکییەکانی مرۆ ئەو هێندەی حاڵاتی بەشەر کە تۆمار کراوە ناوی مێژووی پێوەیە، بارتەقای کۆمەڵایەتیی بەشەر کە بریتییە لە گوتە و کردەوەی سەرلەبەری بەشەر بەڵام کەس نییە، یەک لە 100000000000 ی کردەوە و گوتەی گەڕەکەکەی بزانێت... لەوی دەشزانرێت و دەبیسترێت، یەک لە 10000 ی بە بیری کەسدا نایەت. دەسا حوکمی ئیعدامیشم بەسەرەوە بێت نازانم لە ڕۆژی 1928/8/25 و دووەم سێشەمووی مارتی 1930 و یەکەم ڕۆژی جەژنی ڕەمەزانی 1935 چ گوتراوە و چ کراوە و چ ڕووی داوە لەو شوێنانەی لێیان بووم... هەر هیچم لە بیر نییە... تۆش هەر وایت... گرەگرێکی ڕووداوی بە هاتوبات دێتە بەر گوێچکەی خەیاڵی هێندێ کەسەوە، ئەویش نەک بەردەوام کە مومکین نییە مێشک وەک کاسێت پڕ بکرێتەوە بە ملیۆنەها ڕووداو و نەشتەپێ... نایزانێت... تێی ناگات... بە کەڵکی نایەت. ئەمجا ئەگەر تاک و تەرا گوێی پێ بزووت و تێیگەیشت چ سوودێکی لێ وەردەگرێت... چۆناوچۆنی بەرنامەی ماڵی خۆی و حاڵی شارەکەی و مەفتەنەکەی بەو هێندە مێژووی قوت و قرتیلە ڕەنگڕێژ بکات!!

کاکی خۆشەویست، تۆ بە یەقین دەزانیت خەڵک پەند لە تەجرەبەی زەق و زۆپ وەرناگریێت و تا بۆی بلویٔ و پیٚی بکریێت کرمی دڵی خۆی دادەمرکیێنیێت... مەراقی سیٚرسکانەی هەبیٚ خەوی لیٚ ناکەویێت... تەما و ئومیێدیێکی خویێرپلەی کەمئەرکی لە دڵدا بیێت ئۆقرەی لیٚ هەڵدەگیریێت... کیژیێکی قشتیلە لە دەستی برادەریێکی هەڵپەرپیێت سیبەرۆی دیتیٚ... بەڵیٚ دەزانین ئەو و غەیری ئەویش مەحکوومی پەلەی ژیانە و کە بوو بە هەڵگری گوزەرانی خیٚزان ناچارە خەریکی بژیێو و پۆشاک بیێت بەڵام گومانت نەبیٚ لەوەدا کە ئەم کابرای وەها ملکەچ بۆ مەراقی خۆی و ژیاندنی خیٚزانەکەی بیریش ناکاتەوە لە شتیێکی پیٚی دەڵیٚن میٚژوو یان گریٚ و گاڵی کۆمەڵایەتی یان بەرژەوەندی مرۆڤایەتی، هەتا پیٚشی بکریێت لە مقیاسی ئاو و کارەبا ساختە دەکات... مرۆی عادەتی لە وڵاتی بیٚ سەروبەر و نەزان ئامادەیە ئەسیری مەراق بیێت وەک کە گوتمان مەراقی سیٚرسکان و سیٚبەرۆی حەسوودی ئۆقرەی لیٚ هەڵدەگریێت. چی پیٚی دەڵیٚن Ideology، دینی بیٚ یا دنیایی، ئاپۆرەی نەزانان بۆی شەیدا دەبن. تۆ بە چاوی خۆت دەبینیت، لە کورد و غەیری کورد، رابەری بزووتنەوەی ئازادی لە تەنگوچەڵەمەی رکابەری لەسەر پیٚشەوایی چ بە خۆی و دنیا دەکات لە حاڵیێکدا دەبوو ئەو رابەرە پەندی لە میٚژوو وەرگرتبایە کە گۆیا خۆی خاڵقی تەئریخە یان هەر نەبیٚ بەشیێوەیەکی یەکسەر بەشداری خەڵق کردنیەتی. کە میٚژوو بۆ ئەو رابەرەی خویێندەوار و ئازمووده و دروستکەری میٚژوو هیێندە بیٚسوود و بیٚبنج و بیٚبایەخ بیێت ئایا زرەئەفەندی و شرەشاعیر و درەبزیێو و ورەبازاری گرەحەزۆکیێک چ جۆرە پەندی زیٚرین و ئەڵماسین دەکاتە دیاریی رزگارکردنی گەل و نیشتمان؟ خۆ ئافرەت هەر تووتیئاسا گروگاڵی هیٚرەپیاوان دەجویێتەوە، رەنگە، نەشزانیٚ گروگاڵەکە بۆ «پەز» چاکە یا خراو[4]، بشزانیێت هیچی لە دەست نایەت.

چەند هۆی سەرەکی هەیە بۆ زەحمەتبوونی پەندگیریی لە میٚژوو:

1. مەیلی دڵ و دەروون خۆی کاریگەرێکی بنەڕەتییە لە بڕیاردان، چ هەڵە بێت چ ڕاست.
2. پەندەکە خۆی ئاشکرا نییە. لە تەجرەبەی خۆت دەبینیت براکەت ڕێکخراوی «ع» پەسەندە دەکات و تۆیش هی «س» و ئامۆزاکەشت هی ئیسلامی کەسیشیان بە دوژمنایەتی وەهای نەکردوە. خەلیفەیەکی عەبباسی بە چاوی کرایەوەو و بە لێکدانەوە ڕێبازێک دەگرێت تێیدا زەرەرمەند دەبێت، بگرە تێدەچێت، ئەوجا تۆ و من دوای هەزار ساڵ چ ڕەخنەییێکی لێ بگرین کە هەزاریەکی ئەو شارەزای دەوروبەرەکەی نیین و ئەگەر بە دەسخەڵەت پێمانیان گوتبایە خەلیفەکە بە زۆرزانی لە ناحەزەکانی بردەوە دەمانگوت وەی ئافەرین بلیمەتی مەزن!!

ئەگەر بۆت باس بکەم ئینگلیز لەبەرچی وڵاتی USA ی بە شەڕ دۆڕاند (بەر لە چەند سەد ساڵێک) گاڵتە بە مێژوو دەکەیت... لەبەرچی شۆڕشگێڕان شەڕی Boer لە باشووری ئەفریقایان دۆڕاند دیسان واقت وڕ دەمێنێ.

تێکشکاندنێک نییە لەو ڕووداوەی وەک شەڕ و ئاشتی و ئاشتیی نێودەوڵەتان نەدرێتە بەر هەڵسەنگاندن و تێشکاوەکەی بە هەڵەکردوو یان خەمسارد و بێکیفایەتی حیساب نەکرێت، کەچی دەشێ خۆت لەو کەسانە بیت نەتوانیت دوو برادەر ئاشت بکەیتەوە و دنیاش بە دەبەنگ دانێیت...

3. لە تێوەڕامانی دنیای حازر و بەردەست گەلێک جار بیروڕای ئەوتۆ هەڵدێنجرێت لەگەڵ گڕوگاڵی هەرزە و گێل هاوشان بووە، ئەوجا کەی مومکینە ڕابوردووی شرایەوەی پشت هەزار پەردە و پێش سەدان و هەزاران ساڵ یەکالا بکەین بۆ بەر چاوی زەڕرە نەقلاشمان

کە دەزانین کابرای سەردەمی کۆن بە پێی ئیمکاناتی بەردەست ڕێی نەبووە لە خۆمانی سەردەم زیرەکانەتر بلێت و بکات، خۆ ئێمە دەیان هێندەی ئەو ئەبزاری تێگەیشتن و ئەزموون و خوێندن و ڕاوێژی کۆمپیووتەرمان هەیە.

4. خەریکبوون بە دۆزینەوەی پەند لە مێژوو، جگە لە سەختی و زەحمەتییەکی نەفەسبڕی تێیدایە، هەر بە جارێ کەمبایەخ دەبێ کە دەبینین بەشێکی گرنگی موفرەداتی «ڕووداو» و هۆیەکانیان بە نهێنی ماوەتەوە بەو پێیە دوو ئاکام ئاکاری سەلبی دەکەن لە پەندگیریی مێژوویی 1- دەوڵەتی کەمهێز نە دەتوانێ سیاسەتی خۆی پەردەپۆش بکات لەبەر بێدەرامەدی و نە دەتوانێ نهێنی غەیر کەشف بکات، دیسانەوە لەبەر بێپارەیی «و بێهێزیی و شتی تریش».

5. کە نەشیا بۆ دەوڵەتی بێهێز نە پەندگیر بێ لە شتە موهیممەکانی داپۆشراو و نە خۆی بپارێزێت بە پۆشینی عەورەتەکانی «بە هەموو وجوود و هەوڵ و تەقەڵای ئەمڕۆژەی» ئیتر تەمای چ سوود و پاراستن و گرد و کۆییەک بێت لە ڕێی پەندی مێژوویی کە هی سەردەم چنگ ناکەوێت، لەوە هەر بگەڕێ کە حاڵوباری سەردەمی نێودەوڵەتان لەوەی تێپەڕ کردووە دەوڵەتی گچکە یاریی «ئاڵتی دایش و مەیموون ئۆینی»ی دامە لەگەڵ زلهێزێک بکات بە پاڵپشتی پەند و قسەی نەستەق. باوەڕ دەکەم بگوترێ دەوڵەتی بێدەسەڵات بە بێ پەردە و نهێنی و کنە کردن لە سیاسەتی زلهێزان سوودمەنتر دەبێت تا ئەوەی، وەک پشیلە، تەڵە دانێتەوە بۆ گورگ. لە حاڵێکی موستەحیلی ئەم سەردەمەدا، ئەگەر ملیارەهای بێدەسەڵاتی دەوڵەتە بێهێزەکان یەکتریان گرتبایە دەشیا بیرێک بکرێتەوە لە سوودێک... هەر نەبێ نەبوونی زەرەرێک... ئەم خەیاڵەش بەتاڵە چونکە تاک تاکی دەوڵەتەکان لەگەڵ خۆیدا ڕێک نییە چ جایی ئەوەی لەگەڵ جیرانەکەی ڕێک کەوێت کە دەستیان لە بینەقاقای یەکتر ناوە بە

نیازی مراندن... لە نموونەی «پەردەپۆشیی سیاسەت» هەراکەی «عدوان ثلاثی»ی ساڵی 1956 بە بیردا دەهێنمەوە کە بریتانیا و فرەنسە و ئیسرائیل هێرشیان بردە سەر میسر، ڕووسیاش هەڕەشەی لێ کردن و ئەمەریکاش بە خامۆشی لەگەڵ ڕووسیادا بوو دەنا ڕووسیا شەڕی ئاتۆمی بۆ خاتری میسر بەرپا نەدەکرد...

خولاسە پەندگیری لە مێژوو قسەیەکی خۆشکەڵەیە پتر لەوەی ڕێبازێکی کرایەوە، بگرە داخراویش بێت. خەریک نەبوونم بە مێژووەوە بە شکڵێکی خۆتەرخانکردوو هیچ زەرەری نەگەیاندووە بەو هێندە فرەوانیی نیگا و وردەخوێنییەکی بۆم ڕەخساوە. ئێستاکە و پار و بیست ساڵ و پەنجا ساڵ لەمەوبەر کە پێیاندا تێپەڕیوەتم و هەڵەم تێیاندا کردووە خۆت و خۆم و کەسی سێیەم تێدەگەیەنێ کە من لە حاڵی بەردەست و ئاشکرادا نیشانە نەپێکم مێژووی سەرلەبەر سوڕگوم چ پەندێکی ڕووناکی دەردەهێنا بۆم لە هەنبانەبۆرینە. بە پێی پرسیارەکەت کە من لە مەیدانی تەئریخ ئەسپم لینگ نەداوە، بە زاهیر، دوو ئاکام دەگرێتەوە،

1. پەندم لە تەئریخ وەرنەگرتووە بەمەشدا، ڕوونبینیم لێڵە (تۆ ئەمەت مەبەس نییە بەڵام لە مەفهوومی قسەکەتدایە).
2. لەگەڵ نەبوونی پەندی مێژوو بەش بە حاڵ لێکدانەوەی دروستم کردووە لە مەنتیقی دەلالەتی ڕووداو و فەلسەفان بە بەڵگەی پێشبینیم لە چارەنووسی کۆمیونیزمی سەر بە مارکسیزم و بە پێشدەستیم لە ئاشکراکردنی تاوانباریی ستالین...

بەو پێیە من لە ڕووناکیی حازرەوە تیشکم هاوێشتووە بۆ مێژوو نەک بە پێچەوانەوە. ئەو زیرەکانەی کە چاویلکەی نەزەرییەی نادروستیان لە جێی چاوی خۆیان دادەنا، بە ناچاری و بە حوکمی سەکەتیی چاویلکەکە، واقیعیان

بەرەو دواوە دەگێڕایەوە، ئێستاش کۆمە دەکەن لە دانهێنان بە حەقیقەت و گلەیی لە من دەکەن کە گۆیا وازیان لێناهێنم. وازنەهێنانم کە لەوپەڕی بێدەسەلاتی و لەوپەڕی سۆز و پەرۆشەوەیە بە واجیبێکی هەرەپیرۆز و شەرافەتمەند دەزانم کە دەبینم ئەو هەزاران هەزاری گەنج و ڕدێن ماشوبرنج و بەسالاچوان لەو کوێرەڕێگەیەی تێیرا دەڕۆن دوو زەرەری گەورە بە کوردایەتی دەگەیەنن. یەکیان ئەوەیە، بایی بێسوودی تەقەلایان زەرەر لە خۆیان و لە کورد دەدەن. دووەم، بایی هێزی تێیاندایە لە هەست و چالاکی بە خەرجی دەدەن لە پێناو زیندووکردنەوەی نەخۆشی ڕوولەمەرگ و ڕێ تەسک دەکەنەوە لەو خەڵقەی دەیەوێ لەگەڵ لووزەوی مێژوو بڕوات. کە دەڵێم «نەخۆشی ڕوولەمەرگ» مەبەسم نییە بڵێم بە ساڵێک و دەیان و پەنجایان کۆمیونیزمی مارکسیست و لینینیست و ستالینیست دەمرێت، نەخێر، پتر دەوام دەکات چونکە بۆتە قاعیدە، دەروێشایەتی، پاشخانی هۆش و مەنتیق. بەشێکی زۆری ئەو دەروێشانە هەتا مردن وازناهێنن و لە دەمی ژیانیاندا قوتابیی نوێش دەرس دەدەن بە تایبەتی لە زەرفێکدا کە کۆمەڵە سیاسییەکانی ناکۆمیونیست کالایەکی ئەوتۆ ناخەنە بوخچەی ئاپۆرەی گەلەوە پێوەی بخافڵێن. تا ئەم دەمە هیچ ڕێکخراوێکی خەباتگێڕ لە جیهانی سێیەم چاکەیەکی ڕاستەقینەی بە خەڵک نەگەیاندووە. یەک ڕێکخراوی شۆڕشگێر نەبوو دوای گەیشتنی بە دەسەلات ئیفلاسی خۆی بە ئیسپات نەگەیاندبێت، دەوامەشی بەهۆی کوشتن و بەندیکردن و چاوترسێنی بووە، ڕۆژ لە ڕۆژیش باری گوزەران و ئارامی و ئازادیی بیروباوەڕ و داد و سەقافەت بەرە کزی و بێنرخی بووە. ڕووسیاش لەچاو دەوڵەتانی وەک خۆی و لە خۆی کەمتر و بێسەروەتتر، چ لە ئەورووپا و چ لە شوێنی دیکە بێت، بە درێژایی 60 ساڵی کۆمیونیزم نان و سوخرە و بەندیکردن و کوشتن و بە خائین دەرچوواندنی بەسەر سۆڤێتستان دابەش کردووە... دەمەوێ بڵێم هەرەسی کۆمیونیزم لە سۆڤێتستان ئەو تەئسیرەی نابێ لە کۆمیونیزمی ولاتە دواکەوتووەکان لەبەر بێ بژێویی ژیاریی «حضاري» و زانستی و پیشەسازی و بەهۆی ڕێکاری[5]

زێدەنزمی ئاسۆی بینین و هەستی خەڵکەکە. کۆمیونیزمی گەلە پێشکەوتووەکان، هەرچەند نەختێک بە درەنگەوە بوو، لە تەپکەی شۆڕشی پرۆلیتاریا ڕزگار بوون و گەڕانەوە سەر ڕەوتی بێ کوشتن و برین و سووتاندن و ئازادیی بیروباوەڕ و چالاکیی سەر بە ئابووری...

چەندی دەکەم کۆتایی بەو خاڵە بهێنم لێم زەحمەت دێت بەڵام بڕیارم دا ئەوەندە بڵێم: مێژوو بریتییە لە کۆمەڵایەتیی مرۆ. حازری ئێستاکە چەندوچۆنە بۆ بەرهۆش و گۆشی مرۆ، ڕۆژگارەکانی پێشووش هەروەها بوونە بۆ مرۆی ئەوساکە لەگەڵ تێبینی ئەو حەقیقەتە کە ڕابوردوو بۆ بەرهۆشی من و تۆ ملیارەکی ڕووناکایی واقیعی ئەوسا ناداتەوە... تۆ چەند لە واقیعی ئێستاکە بە گلەییت و ڕووداوەکانی بە ناپوخت دادەنێییت، ئەگەر بە عەقڵی ئێستاکەت لە ڕابوردووی بەر لە هەزار ساڵدا ژیابایت ئەویشت بە ناپوخت دادەنا و پتریش لێی بە گلەیی دەبووی چونکە عەقڵی ئێستاکە لە هی کۆن بەبڕشتترە بۆ نرخاندنی ڕووداوە نەکوڵاوەکانی ئەوسا... لەو درێژەیە وەڕسکەرە خۆت وانەیەک بژاردە بکە لە مێژوو.

2) مێژووی کورد بە کام ئاقاردا ڕەوتی کردوە؟

بایی ئەوەی لە پرسیارەکەت بگەم دەڵێم، ڕەوتی کورد بەو ئاقارەدا بووە کە گەلەکانی ناوچەی کورد تێیاندا ژیاوە بە تێبینی ئەو ڕاستییەی هەرەگرنگ کە کورد لە ماوەی 2500 ساڵدا بۆی ڕێک نەکەوت حکوومەتی خۆی هەبێت و کورد زمانی لە خۆیدا گرتبێت، ئەویش لەبەر تایبەتمەندیی جوغرافیای نیشتمانەکەی کە لە پاش شاهەنشاهەتیی فارسی ئیخمینی کەوتە نێوان جغزی سێ لایی ئیخمینی و ڕۆمانی و بابلی... لێرەشدا درێژە ئیمکانی نییە.

3) چ هێز و هۆکارێک زیاتر حوکمی لەسەر عەقڵی کوردی کردووە؟

وا بە باش دەزانم ئەم پرسیارە بخەیەت بەر نیگای کەسانێکی کورد کە تێیانرا دەبینیت وەڵامی قەناعەتبەخش بدەنەوە… دەبێ نەختێکیش مەبەستت ڕوونتر بکەیتەوە بۆیان چونکە «عەقڵی کوردی» لە ماوەی هەزاران ساڵدا بۆتە ئاوێنەی چەندین نەتەوەی حاکم، قەتیش ڕێک نەکەوتووە سەرلەبەری بەردەستی تاکە حکوومەت بێت… لە لایەن دینەوە کوردەکە بە تەواوی لە ئەسڵەدینی تارا… چەندین مەزهەبی جوداجودای تێدا پەیدا بوو. لە دێوپەرستییەوە بگرە هەتا دەگاتە تاکخواپەرستی… خولاسە پرسپێکراو دەبێ بە شارەزایی لە مەبەستت جواب بداتەوە. لە پێشەوە ڕووناکاییەک دەخەمە دەوروپشتی پرسیارەکەت:

لێت دەپرسم، چ هێز و هۆکارێک زیاتر حوکمی لەسەر عەقڵی ئینگلیزی؟ ئەڵمانی؟ عەرەبی؟ تورکی؟ سویسری؟ و دەیان نەتەوەی تر کردووە؟ بە زاهیر دەبوو ئەگەر هێز و هۆکارێک زیاتر حوکم بکا، زۆربەی میللەت لەسەر ڕەوشت و بیروڕا و ئایین و نەریت لێکتر نزیک بن کەچی مەسەلەکە وەها دەرناچێت. وڵاتی زیدە پێشکەوتوو چەندین حیزبی جودای تێدا کێبەرکێ دەکەن. ئەمە دەڵێم بە نیازی ڕاکێشانی نیگات بۆ حاڵی کورد کە لە هەموو مێژوویدا ڕۆژەک لە ڕۆژان لە سێبەری تاکە دەسەڵاتدا نەژیاوە و بە ئاستەم تاکوتەرای میرزا و خوێندەواری بووە و هەمیشە لە پلەی زێدەنزمی شارستانەتیدا ژیاوە، ئێستاش بە زۆری خەڵکی کوردستان (لە دەرەوەی جغزی دەسەڵاتی حکوومەت) لە جیاتی فڕۆک سواری ئێستر دەبن.

میللەتێک حکوومەتی خۆی نەبێت و سنوور بە دەوری نیشتمانەکەیەوە نەکێشرابێت، وەک دەغڵێکی نەکرابێتە خەرمان، بەشی زۆری لە پەرێز پەرتوبڵاو دەبێت. لە حاڵەتی دابەشکراویشدا پێناسە بۆ کەرتەکانی پەیدا نابێ. لەگەڵ ئەمەشدا دەتوانین سەرژمارێکی بێسوودی چەند هۆکارێک بکەین شوێن پەنجەیان لە عەقڵی کوردی دیار بێ ئەمما نەک عەقڵی هەموو یان زۆرینەی کورد.

لە پێشەوە دین دێت کە بەشی هەرە هەرە زۆری کورد مسڵمانە و سوننیە، وەک بزانم شافیعی مەزهەبیشی پترە لە حەنەفی. مالیکی و ئەحمەدی دەگمەنن یان بە جارێ نین. بەشە حەنەفییەکەی لە تەئسیری حوکمی تورک بوو بەسەر کوردستانەکاندا چونکە تورک حەنەفی بوون و مەزهەبی ڕەسمیی حکومەتیش حەنەفی... بە پێی ئەوەی کە خەڵک بۆ فەرمانی دین لە خۆوە و بێ هەڕەشە ملکەچ بووە، لەگەڵ ئەرکی هەمەچەشنەی و مەسرەفی حەج و زەکات و بەشداریی غەزا، ئاشکرایە چ تەئسیرێکی بووە (و خەریکە لەو دواییەدا پتریش دەتەنێتەوە) بەڵام دەبێ بزانین تەئسیرەکەی بۆ لایەنی ئەوتۆ بووە قیامەتەکەی پێ مسۆگەر بکرێت. لەگەڵ خۆم دەڵێمەوە، ئەگەر دین ئەمری کردبایە بە دامەزراندنی حکوومەت وەکوو فەرضێکی حەج و نوێژ، کوردەکە لەوانە بوو دەرفەتی بۆ بدۆزیبایەوە. لە شەڕی فارس و بایەزیدی نێوان ڕووس و عوسمانلی، ساڵی 1294 هـ گەورەپیاوانی کوردی عێراق بە مەسرەفی خۆیان چوون بۆ غەزا. کوردی کوردستانی تورکیاش بە سەرۆکایەتیی شێخ «عبیداللە»ی نەهری لەگەڵ کوردی دیوی عێراق وێکڕا بەشدارییان کرد. لە شەڕی گەورەی یەکەمیش ژمارەیەکی زۆر لە دەسەڵاتدار بۆ غەزای دژی ئینگلیز چوون، وەک شێخ مەحموود و سەید ئەحمەدی خانەقا. توێژ و تیرێژی وەک کاکەیی و قادری و نەقشبەندی و حەقە (جودایە لە هەموو تەریقەتەکان) هەر یەک لە جغزی ئیسلامدا ڕاڕەوی خۆی هەبووە. ئێزیدی حاڵەتێکی تایبەت بە خۆیانیان هەیە لە پەراوێزی دیندا پێوەی ماندوو و زیانکردووبوون سەبارەت بە جودابوونی لە ئیسلام. لەوەی بە بیرمان دێت و بیستوومانە ئێزیدی کە کوردن پتر لە عەشاییری عەرەب دووچاری هەرا بوون لەگەڵ کوردەکە. نیزاعێکی لەگەڵ عەشاییری عەرەب بووبێ لەسەر تەماع یا شتێکی ئەوتۆیی بووە کە لە نێوان کورد و کورد و عەرەب و عەرەبیشدا دەقەومێت. دینەکە لەو حاڵەتی ژێردەستی کورددا و لەگەڵ ئەرکی فەرمانەکانیشی، بایی بەهەشت حەڵاڵکردن، درێغی لێ نەکراوە. هەر چونکە لەلایەن دارەتی دنیاوە کوردەکە دەسبەتاڵ بوو لە پلەی

«مسکێنی»ی تێنەپەڕاند تەنانەت لەناو کوردەواری نەبیستراوە، یان من نەمزانیوە، جارییە (ئافرەتی دراو خڕیدە) هەبووبێت، عەبدیش نەبووە...

بێسەوادی لە نێوان کورددا وەک شەو هەمەگیر بوو بەڵام چونکە دینەکە بوو بە ئەساسی زانست و ئەدەب و عەقیدەی نووسراو، خوێندنی مزگەوت لە کوردەواریدا بە جۆرێک پەرەیستاند لە عەرەب و تورک و فارسیشی تێپەڕاند کە حاڵ گەییشتە ڕادەیەک بەشی زۆری دێیەکان مەلای «مدرس» و فەقێ و موستەعیدی هەبووە تا ئەوەی زۆربەی مەلا زلەکان لەو دێیانە دەرسیان گوتووەتەوە و ئیجازەیان داوە، هەر ئەو قووڵ ڕۆچوونەی کورد لە دین کێشایەوە سەر هێندێ کە لە بەشی هەرە زۆری کوردستان شاعیری کورد نەبووە، کتێبی سەر بە ئەدەب و تەئریخ و ماددەی عیلمی دانەندراوە. کە شیعر لە کوردستانی عێراق و ئێران دەستی پێ کرد (بەر لە نزیکی 200 ساڵێک) کوردییەکە هەر لە جغزی شیعر مایەوە، تەنانەت میرزاکان دەفتەریان دەگرتەوە بە فارسی. لەمەوە بۆت دەردەکەوێت ڕووتی و ڕەجاڵی و بێهێزی و بێدەرەتانی و بێپارەیی کورد وەهای کرد زانست و ئەدەب و هونەری کوردی نەزێت و دینداریيەکە بۆ کورد لە لایەن دنیاوە نەزۆک بێت و وشک هەڵێت. مەولانا خالید کە لە سۆزی دەروونەوە بە فارسی دەڵێت:

خالدا گر نیستی دیوانە وصحرانورد
تو کجا و کابل و غزنین و خاک قندهار

تەعبیر لە ئاگر و چرەدووکەڵێک دەداتەوە چ پێوەندایەتیی بە دنیاوە نییە... دوای 150 ساڵێک (شتێک کەمتر، زیاتر) باوکم لە دەمی حەقەی دارەقوڵەی بیست و سییەکاندا دەڵێ:

خالیدی شەهرەزووری سەر لە قەبرت بێنە دەر
بزانە ئوممەتی تۆ چ دەردێکیان هاتە سەر

لەگەڵ هەموو ڕێز و تەقدیسم بۆ مەولانا خالید، کە باوکیشم هەر قەدرزانی بوو... تا ڕادەیەک جوداوازیی مەزهەب و تەریقەت ناکۆکیی ناوەتەوە وەک هەرای نێوان شێخی نودەهی و مەولانا کە ئەگەر مەولانا لەلای خۆیەوە دڕدۆنگییەکەی بەتاڵ نەکردبایەوە ئاکامی ناخۆشی لێ پەیدا دەبوو. دیسانەوە هەمان خیلافی باوەڕی دینی لە بیستەکان کارێکی بەدی کرد کە سەید تەهای نەهری نەوەی شێخی نەهری «شێخ عبیدالله» بوو بە قایمقام لە ڕەواندز سەبەب بە مەیلی نەقشبەندیی خۆی، بنەماڵەی خەتێ و خەیلانی دەدزان چونکە دژی «تصوف» بوونە، ئیتر کە سەید حوسێنی حوزنی موکریانی لە کتێبەکەی خۆیدا ئیشارەتی دا بە هێندێ کە کاتی خۆی لەسەر فەتوای مەلای خەتێ پاشایەتیی میری کۆرە تێکچوو، بە ڕاستی، دڵڕاگرتنی سەید تەهای مەبەس بوو کە لە سێبەر و تەئیدی ئەودا دەیتوانی لە ڕەواندز بمێنێتەوە و گۆڤار و کتێب بڵاو بکاتەوە. عەبدوڵڵا موخلیس بەگ لە نەوەی، وابزانم، ئەحمەد پاشای برای میر بوو (خولاسە برازای میر بووە) بەر لە دەرچوونی کتێبەکە و پێش پەیدابوونی ئەو تۆمەتە بە ڕاشکاوی بێ مەبەست حیکایەتی فەتواکەی گێڕابۆوە کە لەسەر تەکلیف و ئارەزۆی هەموو بنەماڵەی میر ئەو فەتوایە دەرچووە. تەنانەت مەلا ئەفەندیی هەولێر کە کتێبەکەی سەید حوزنیی خوێندەوە زۆر بە گلەییەوە پێی گوت، سەیید دەبوو بڵێی فەتواکە لەسەر ڕەزامەندی و داوای میر و خزمەکانی بوو. هەر لەو گلەییەدا گوتبووی، عەبدوڵڵا موخلیس بەگ (خەزووری مەلا ئەفەندی بوو) بارەها باسی ئەو مەسەلەیەی بەو شکڵە کردووە... مەلای خەتێ مەشوورە بە دزاندنی نەقەشبەندییان. مەلای خەتێ کە مامۆستای حاجی مەلا ئەسعەدی جەلیزادە و حاجی مەلا عەبدوڵڵای جەلیزادە بوو بۆرە گلەییەکی لە حاجی مەلا ئەسعەد هەبووە لەسەر ئاشنایەتییەکی لەگەڵ نەقشبەندییانی بووە. ئەویش لە ڕێی باوکی خۆی «واثق بالله مەلا عەبدوڵڵای جەلیزادە» ەوە ئەو مەیلەی بووە چونکە باوکی خەلیفەی مەولانا بووە. دواتر باپیرم، حاجی مەلا عەبدوڵڵا کوڕی حاجی مەلا ئەسعەد ئەو گلەمەندییەی لە دڵی مەلای خەتێ

سڕیوەتەوە... من مەسەلەی نووسینەکەی سەید حوسێن بۆ ڕەزامەندیی سەید تەهام لە خوالێخۆشبووی مەلا محەمەدی کوڕی مامۆستا شێخ مەلا طەهای بالیسانی، لەم بەغدایە، بیستووە کە خۆی لە بنەماڵەیەکی نەقشبەندی بوو. بە هەموو دڵ مەلای خەتێی تەبرییە دەکرد لە تۆمەتی فەتوای ناوبراوی ناوزڕاو. مامۆستا عیززەدینی مەلا ئەفەندی، شکرێ، بەرحەیاتە لە هەولێر و خۆی نەوەی عەبدوڵڵا موخلیس بەگە لە دایکرا، فەموون لێی بپرسن!

هۆکاری دووەم کە لە چاو دین شیرەخۆرەیە بریتییە لە بیری کوردایەتی. هەرچەند سوود و بەرژەوەندی سەر بە نەتەوە لە یەکیەتی گەلدایە بە تایبەتی لە دەمی ژێردەستیدا، بە داخەوە، دواکەوتوویی و ژێرکەوتوویی و پەککەوتوویی و تەنگوچەڵەمەی خەباتخەسێن و زەرفی زێدەسەختی کورد و کوردستان وێڕای نەبوونی پاشخانێکی مێژوویی و سەقامگیر نەبوونی فکرەی خەستوخۆڵی نەتەوایەتی بۆتە هۆی بڕبڕ بوونی خەڵکەکە تا ئەوەی هەوڵ پەیدا بووە بۆ متوربەکردنی چ تیرێژێکی ئارەزۆ بکەیت لە بەشی زۆری کوردستاندا. تا ڕادەیەک زۆر جێی سەیرپێهاتن نییە دین و شییوعیەت پەلەی خۆسەپاندن بکەن و نەتەوایەتییەکە بکەنە خورجینەی تێشووی سەفەر، بەڵام وردە تیرێژی سەر بە فکرەی ئیشتراکیەت و نەتەوایەتیەکی تێکەڵ بە دادپەرستی و یەکسانیی عاطفی کە وەک دوومەڵان هەڵدەپۆقێن پتر لە ڕووی دوو ئاوێنەوە ڕەنگ دەدەنەوە. یەکیان ناکۆکیی ناوەوەی بزووتنەوەی سەر بە نەتەوەیە کەوا هەم کەلێن دەدا بۆ خۆپارێزی لە خەباتێکی بەلای مەرگدا بچێت. دووەم ئەوەیە کە سەقافەتی ئەورووپا بە خۆی و بێسنووریی چەشمەندازەکانی و هەمەڕەنگیی بۆچوونەکانی و فرەبابەتیی خوازەکانی و کراوەیی ئازادیەکانی دڵی گەلێک کەس دەبزێوێ بۆ نمایشتێکی مرۆڤانەی خۆڕازێنەوە بە پەلکەزێڕینەی ئامانجی یەکسانی و داد و مافەبنەڕەتییەکانی ئادەمیزاد. کوردی گوتەنیش شەڕ لە بەتاڵی چاکترە. گۆیا کەسانێکی بەم ڕێگەیەی بێنەتیجەدا نارۆن چییان قازانج کردووە، ئەوانی پێشیدا دەڕۆن چییان زەرەر کردووە!! وێرانستانێکی وەک کوردستانی خۆمان بۆ پیاوی

سیاسی لە کاڵای سیاسی نەبێ تێیدا نییە! سیاسەتەکەش لە جیهانی چلەمین، بە زۆری، بریتییە لە دڕندەیی، بە تەواوی وەک سیاسەتی عەشرەتەکانی ئەفریقیای بەر لە چەند سەد ساڵ کە لە شەڕ بەولاوە ڕێگەیان بۆ نەڕەخسابوو کێشەی ناتەبایی بەینی خۆیان هەڵبڕنەوە، ڕەنگە ئێستاش ئەو شێوە چارەسەرکردنە هەر مابێت کە دەبینین دوو نەتەوەی یەک دەوڵەت، نەک هەر عەشیرەت، تا ڕادەی براندنەوە یەخەگیری یەکتر دەبن... نموونەی شەڕە عەشیرەت لە کوردەواریشدا هەبووە و خۆم چەند نموونەیەکم لێ زانیوە و بەرەوانیشم کردووە لە هێندێکیان. لە بەراوردکردندا هاندەری کوردایەتی لەتەک هاندەری دین تەوژمی کەمە کە دەبینین دیندارەکە لە کۆنەوە بێ مزە و ئومێدی دنیایی بە ئەرکی لەش و ڕزقی خانەوادە «مام حاجیی کورد» دووەم و سێیەم دەچوو بۆ حەج، بە سواریی ولاغ و حوشتر لەگەڵ هەڕەشەی کوژران کە هەزارەها لە ڕێگەدا تێچوون... لە مەککەوە ئاوی زەمزەمیان بە دیاری دەهێنا بۆ ماقووڵان و خۆشەویستان... «زمزمية — زەمزەمییە» ئەو دەفرە بوو کە بە داخراوی ئاوی زەمزەمی تێ دەکرا بۆ دیاری. بێگومان کوردستان بە لەتکراوی ئەو هێز و هۆکاریەی نامێنێ لەچاو کوردستانی یەکپارچە لە ڕووی هیچ شتێکی سوودی تێدا بێت بۆ کورد، لە نێویاندا سوودی هاوچوونکردنی هەست و هۆشی سیاسی سەر بە چارەنووسەوە. لەتبوونەکە خۆی لەمپەڕێکی زێدە زلە دژی تێککردنەوەی خوێنی ماددی و مەعنەوی لە هەموو لەش و دڵی کوردستان و کورددا وەک کە جۆگەلەی ئاو نیو مەتری بە خۆڵ و بەرد پڕکرایەوە خوڕگەی دەبڕێت. لە حاڵەتی نەتەوە و مەفتەندا نەک تەنها خوڕگەی دەبڕێت، بگرە، بەرەو وشکییەوە دەچێت. ئنجا ئەگەر پارچە لێکدابڕاوەکان خۆیان جۆگەلەی کێڵگەکانیان لە ماڵە دەستبەسەرەکانیاندا کوێر کردووە هەر دەبێ سەڵەواتی بۆ لێ بدەیت لەو «هضم النفس»ەی دەروێشایەتی کە لەززەت دەبا لە خۆ ئازاردان.

ئەم شریتەی قسان هی دەمێکە کە کورد تێیدا لەتلەتە و ڕێی نییە گیانی نەتەوەپەرستی لە لەش و هۆشی میللەتەکە بگێڕێت. بێ ئەوەی هەموو

لایەنێک خورد بکەمەوە دەڵێم، ئایا ئەو ڕۆژە پیرۆزەی کورد تێیدا لە پارچەکراوی ڕزگار دەبێت و دەوڵەت بۆ هەموو کوردستان دادەنێت چ ڕەفتار و کردارێکی لێ چاوەڕوان دەکرێت؟ خەباتگێڕانی ئەوسا کە پێشتر بە لەتکراوی یەکتریان دەدزاند و لێکتریان دەکوشت ئایا کە ترسی داگیرکەریان لەسەر هەڵستا و لە سێبەری ئازادیدا دەستیان کرایەوە چ پانۆڕامایەکی تازەبابەتی سەربەخۆیی و بێ ترسی داگیرکەر لە کوردستان بەرپا دەبێ؟ کە دنیاکە بۆ تاکە لایەن مایەوە و ترسی بەربەرەکانیی ناوخۆیی نەما ئاخۆ چەندین ساڵەهای دەوێ، ئەو لایەنی بە درێژایی خەباتی چەندەها ساڵ خەریکی شەڕی براکوژی بووە لەسەر زەعامەت، پەنجە شل بکاتەوە لە بینەقاقەی میللەتەکەی؟ گومانت نەبێ ئەگەر ناکۆکی و دووبەرەکی و براکوژی و نیازی شەخسی و قۆڕەدەماغیی پێش دامەزراندنی دەوڵەت نەپێچرێتەوە و ئیمانێکی پتەو بە داد و یەکسانیی دیمۆکراسی ڕەگ دانەکوتێ سەدجار قوڕ بەسەری میللەت لەوەی بەسەری دێت لە دەست تازە حاکمەکەی چاوبرسی سکبرسی هەموو ئەندامێک برسی و بەتاڵ لە بەزەیی و داد. کابرایەکی لە دەمی هەرا و هەڕەشەی تێچووندا کۆمە نەکا لە کوشتن و ستاندن و بەستن و سووتاندن چ تەمایەکی لێ دەکرێ جگە لەوەی خۆ بە خوا بزانێت...؟ بە پاڵپشتی ئەم ڕایە دەڵێم، سەیرێکی حاڵوباری دەوڵەتی میللەتەکانی جیهانی سێیەم بکە، جگە لە چەند دانەیەکی، ئەوی دیکە هەمووی دەتلێتەوە بە نیزاعی نێوان حکوومەت و بەرەی تێکۆشەران (کە ئەمانیش بوون بە حکوومەت دەست دەدەنە بستێنە، بگرە، ببەستە... لە گەردەنی دە) ئاپۆرەی خەڵقوڵڵاش ماملەی شیردەر و هێلکەکەر و بارەبەری لەگەڵدا دەکرێت، هەڵبەت دەشبێ هەڵپەڕێت لە سوخرەی ئیجباری بۆ پاراستنی کوردستانی ڕەنگین و بەنگین و سەنگین و هەنگوین... لە ئەدەبییاتی حکوومەتیدا! بە دەست خۆم نییە ڕووداوێکی بچووکم دێتەوە یاد لێرەدا، لە نیوەی دووەمی چلەکان لە کەرکووکەوە دەچووین بۆ کۆیێ... چەند جاران گەڕۆکەکەمان لەبەر کۆنی دەوەستا و چاک دەکرایەوە... جاری دوایی تایەی

پەنچەر بوو، لە کەینوبەینی تایە پفدان و بەستنەوەی و هەڵگێڕ و داگێڕی بورغییەکی کەوتە ناو تایەکە. شۆفێر گوتی ئەها! ئنجا چ بکەین. سەید خدرێکی قسەخۆشمان لەگەڵدا بوو گوتی، کابرایەک حەفت عیللەتی لێ بوو پاشەڵیشی دەرهات... کابرا گوتی، یاخوا بەخێر بێی سوورەگوڵی باغان بەڕاستی هەر تۆی پێ دەویست!!

لەگەڵ هەموو دزێوییەکی حکوومەتی خۆوڵاتی دیسانەوە لەچاو داگیرکەری دراوسێ و خومان ئاساییەکان هەر بیسمیلترە، چ نەبێ ئومێدێکی دوارۆژی لێ دەکرێ. دزێویی ستەم وای لێ خۆش هێنام پڕ بە دەم بڵێم، شیرکەتێکی سوێدی یان نەرویجی حکوومەتی کوردستانم لێ بە قۆنتەرات بگرێ سەدجار پەسەندتری دەکەم بەسەر حکوومەتێکی کوردی کە خۆم تێیدا سەرۆک بم، بێگومان بە نیوە مەسرەف، لەچاو حکوومەتی کوردی، کارم بۆ هەڵدەسوڕێنێت و خیانەتیشی تێدا ناکات وەک کە لە دروستکردنی کارخانەیەک و هەڵنانی بناوانێک و قیرتاوی ڕێگاش خیانەت ناکات. با لێرەدا قسە کۆتا کەین لە هۆکاری دووەم، دەشێ لە دوایین دێڕەکاندا بۆی بچمەوە.

هۆکاری سێیەم کۆمیونیزمە، سەد جار بە داخەوە کورد لە پلەیەکی دواکەوتوویی و مێژووبەدەری بێ هێزیی و بێ ئابووری و بێ سنعەت و ڕۆشنبیری و تەکنیک و هونەردایە 180 پلە بەرەواژ دەبێتەوە لە کۆمیونیزم وەک کە دوو لای یان دوو سەری خەتێکی ڕاست لێکتر ئاوەژوون، ئەم پەڕ ئەو پەڕن... کۆمیونیزمێکی بە پێی دەقی نەزەریەکە دوای گەندەڵبوونی بۆرژوازی و کامڵبوونی سۆشیالیزم دێتە کایەوە چۆناوچۆنی و بە دمی کام چاک و پیر لە خەرابگەی کوردستان کە سەرمایەی تێدا پەیدا نەبووە بە مەفهوومی سەردەم و چینی ناوەڕاستی شەپرەلێداوێکی بێدەرمانە بە دەست چەوساندنەوەی داگیرکەرەوە، هەروا لەسەر بەردی سەنگی سەخرێ و کەلاوەی بێ ژێرخان و پرۆلیتاریای نەرسکاو و بێسەواد کە زۆربەی ناوی خۆی پێ نانووسرێت ئا ئەو کۆمیونیزمە بەچکەی چ دەعبایەک دەردەچێت؟

خۆزی سەد خۆزی کوردەکەی کە باوکم لە بەیتێکی شیعردا وەسفی دەکات و دەڵێ:

مەلایان بێ عیلم و شێخیان بێ کەشف و کەماڵ
ئاغایان ڕووت و ڕەجاڵ قوتەی مل نێرکە کادری

خۆزی هەنگڕاوێک لە کوردان دەبوو بە مایە و سامان و زێڕ و زیو و تەیارە و شەمەندەفەر... هەر توجارەی بەقەدەر فۆرد و ڕۆکفیلر و قاروون مەلعوونێکی بێ ئابڕوو دەبوو، تالاری بە ئەڵماس دەڕازاندەوە ئەوجا با لە خەفەتان و لەبەر مەلعەنەت و ناز و فیزیان وەزگمان[6] دابایە... ئەوسا «شیوعیبوون» دەبووە نەخۆشییەکی بە بنەما لەبەر تیشکی شیوعیبوونی دەیان ملیۆن... سەدان ملیۆن لە وڵاتی پێشکەوتوو و ناوەنجی و بەرەژێرتر ئەوسا دەمانگوت «بە گوێی مامۆستا» با کوردەکەش وەکوو خەڵکی دیکە «لە شاری کوێران دەست بە چاویەوە بگرێت» ئەمما هەرگیز فەتوای بۆ نادەم و مێژوو لێی ناسەلمێنێت و ئەمەکداری بۆ زێد و خۆیشی ڕازی نابێ بە فیڕۆ کوردەکە بە قوربانی خاکی سەر قەبری ستالین بکات و بۆ مەزەی مەجلیسی شیوعیی غەیری کورد جنێو بە نەتەوەکەی بدات. بە هەمەحاڵ کۆمیونیزم هەرچەند نوێیە و لە کوردەواریشدا پتر لە 25 ساڵ وەخرا تا لە دوای شەڕی دووەم گەنجی خوێنگەرمی Sophisticated و نازۆ لە جیرانەتیی کۆمیونیزمی عەرەب و تامەزرۆیی «بە هاوڕێ حیساب کردن» لەگەڵ میللەتی بەهێزتر لە کورد دەروێشانە ملی نایە شیوعیەت و بوو بە گەورەترین بەرهەڵستی ڕەوت و هەستی نەتەوایەتی و هەر لەوانیشەوە و بەهۆی داڵدەدان لەلایەن هەندێ کوردی شیوعی و نیوەقەومی بەشی زۆری فکر و دروشمی سەر بە سیاسەتی ڕووسیای ستالینیست چووە دڵ و فکری قەومییەکانەوە و ئێستاش ئەو تین و تاوە، دوای هەرەسی سۆڤێستانیش، هەر بە تەوژمە لەچاو حاڵوبارێکی زێدەپەژارەی کورد...

شیوعییەتی کورد لە دوو ڕێگەوە دەیتوانی بۆ کورد بە سوود بێت، ڕێگەیەکیان شێوەی سەلبیی پێوەیە کە بریتییە لە دەست و زمان و قەڵەم پاراستن لە دوشمنایەتیی فکرەی نەتەوەپەروەری، کە لە تۆژیدا، دانهێنانە بە مافی تەواوی کورد بۆ دامەزراندنی ڕێکخراوی سیاسیی کوردی، چ شیوعی بێ و چ قەومی، لە بەرژەوەندی کورد بپێچێتەوە. ڕێی دووەمیان کە ئەرێتی دەگرێتەوە سەلماندنی مافی تەواو و بێ کەموکەسری و «بارتەقای میللەتان» لە هەموو ڕوویەکەوە بۆ نەتەوەی کورد. جا ئەگەر بەهانە لەوەدا بدۆزیتەوە کە زەرفی خەباتەکەی ئەو هەنگاوە بەرینەی پێ هەڵنەدەهات پێی دەڵێمەوە، کەلامت بە شەکر بێت خۆ تۆ بە پاڵپشتیکردن لە حیزبی شیوعیی سووریە تەقسیمی فەلەستینت سەلماند، دواتر بە خاترانەی عەبدولکەریم کە ماوەی پێ دابووی، لەگەڵ هەموو عەرەبی قەومی کەوتیتە دوژمنایەتی و لە ئەنجامدا تێشدا چوویت... لە پاش هەرای شەواف شیوعییە دیانەکان هوتافی «دینی محمد بەتالوخ»یان دەچڕی... لە مەحکەمەی مەهداوی ئابڕووی قەومیی عەرەب و ڕەئیس جەمالیان برد...

کۆمیونیزمی کورد کە هیچ بنەما و ژێرخانی ماددی لە کوردستان شک نابات بۆرجوازییەتی لێ پەیدا بێت چ جایی کۆمیونیزم، بە فەرمانی واقیع و بڕیاری مەنتیق، ناوەکە و دروشمەکانی لێ بێگانەن لەمەشدا گومان نییە، ئەگەر گومان هەبایە سۆڤێتستان هەرەسی نەدەهێنا... پێشتر ستالین تاوانبار نەدەبوو... زووتر لینین بازی بەسەر دیمۆکراسی و ئیشتراکیەت نەدەدا... کە شیوعیەت لە مۆسکۆ و پەترۆگراد نەژیت چۆن پەنا بۆ قۆڕیتان و تۆپاوە دێنێت؟ سووربوون لەسەر شتێکی موستەحیل مۆرفینێکە (لە حاڵەتی شیوعیبوونی کورد) دوو دڵدانەوەی تێدایە، یەکیان ئابڕووپاریزی، ئەوی تریان بۆرە ئومێدی سەرهەڵدانەوەی دوارۆژ... خۆ ئەگەر بە وردی سەیری سەرەتای شیوعیەتی کورد بکەین بە ئاشکرا دیارە ئەو شوعییەتە لە سەرەتای دەرکەوتنی بریتی بووە لە دەروێشایەتیەکی بە زاهیر ماددی کە دەزانین دەروێشایەتی باوەڕێکی سەر بە غەیبە پەکی لەسەر بنەما و ژێرخان ناکەوێت

چونکە هەر خۆی ژێرخان و ژوورخانە. هەرچی شیووعیەتی دژی غەیبە دەبێ لەسەر بنەمای ڕەق و زەوق و زۆپ و داهێنەر و بەرهەمهێن و دۆزەرەوە و موافقی مەنتیق و زانست و ڕاستییەکانی ئاشکرا و بزری سروشت و تاقیکردنەوە بێت. ئەم مەرجانەش تاکێکی سێبەرت نییە لە ئەزموونگەی بەتاڵ و حەتاڵی کوردستان کە ناتوانێ باسکیلێک بە هونەر و توانای خۆی دروست بکات بە تایبەتی لە چلەکان و پەنجاکاندا. ئەوجا جارێکی دیکەش شیوعیەت هەر چونکە لە بنەڕەتەوە بێ ژێرخان و بنەما گەشەی کرد دەتوانێ بێ ژێرخان و بنەما بەردەوام بێت لەوەشدا بە تەواوی دەبێتە دەروێش و سەر بە قیامەتێکی سیاسییەوە دەنێت بێ بەهەشتی دەروێشیی حەقیقی، واتە خەیاڵەکە و ئومێدەکە دەبنەوە یەک شت و هەر بە خەیاڵیش دەوام دەکات. کوردی گوتەنی «ڕۆنی خۆی لەسەری خۆی». من لە خەسارێکی بە «خەیاڵیبوون»ی کۆمیونیزمی کوردی دێتە کیسە، خۆمی تێدا خەسارەکردوو دەزانم ئەمجا کوردەکەی سەرلەبەر چونکە 1- توانای من کەمترە لە هی میللەتێک بۆ تێهێنانەوەی زیان چ جایی ئەوەی ژمارەیەک، بە پۆز و قەڵغەت. لە تاکەکانی شیوعیی کورد ناسیاومن و بۆ هێندێکیان ڕێزیشم هەیە سەرەڕای خۆشەویستی. 2- برینی من بەو خەیاڵیبوونە کولترە لەوەی خەڵکێکی بە سەرکێڵی هەستی خۆشی و ناخۆشی دەکەن. من حیسابم گرتۆتەوە بۆ فیرۆیی هەوڵی خەیاڵی و بەهەدەرچوونی خەباتی 40 ساڵی و دۆڕاویی خوێنی جوانەمەرگان بۆ سمێڵی ستالین... شاعیرێکی کوردی سەردەمی شیوعیگەرییەکەی، کە دواتر وازی لێ هێنا دەڵێ:

نیزامێکم دەوێ بۆ گەل نیزامێکی ستالینی
بە شەرتێکی کەوا بڕوا لەسەر قانوونی لینینی

شەڵڵا هەڵەم نەکردبێ لە وشەی «نیزام – نظام» کە مومکینە وشەکە خەبات بێ، لێرەدا هەردووکیان یەک شتن لە لایەن زیان و هەستکردن و

نەکردن پێی. ئەوجا بۆ خۆت لێکی بدەوە فەرقی ئێشی من چەند زۆرترە لە ئێشی شیوعییەک کە من لە دەمی دانانی ئەو شیعرەدا ستالینم بە جینایەتکار دادەنا. شیوعیی بە پێی باوەڕی خۆی دینداریکی مسڵمان بە گومڕا دادەنێ کە خۆی جانفیدا دەکات بۆ خوا ئەمما فیداکاریە بێ سەمەرەکەی خۆی بە دروست و پێویست دادەنێ و دەیکاتە فەرزی مێژوویی بەسەر شانی مرۆڤایەتییەوە. دەسا سوێند بە کوردستان دەخۆم ئا لەم دەمەدا دڵم مێرووڵان دەکات بۆ ڕەنجەڕۆیی سەرلەبەری خەباتی شیوعییان[7] بە هەدەرچوونی خوێنی کوژراوەکانیان و زیانی بێ ئامان و سامانی لە کورد کەوت بەو هەوڵی وا نەزۆک و بە سفتوسۆ... وای ڕەنجەڕۆ و کوستکەوتوو خۆمان... وای کە خوێن بەلاشین و هەست بە خۆمان ناکەین... پەحا تێگەیشتن چەند زەحمەتە. لەعنەت لە هەموو ئایدیۆلۆجیەک بێت کە دەبێتە مۆرفین مرۆی پێ بێهێز دەبێت و ڕاست و هەڵە لێکتر جودا ناکاتەوە، هەرچەند لە دەمی دۆگماپەرستیدا کابرا پێیەوە شاگەشکە دەبێت...

شیوعیی کورد لە مجێزی خۆش هاتووە هەوڵە دۆگماپەرستەکەی بۆ پێکهێنانی حکوومەتی ڕەنجدەر و وەرزێر بکا بە ئاردی ناو دڕک و «ئینتەرناشناڵ»یشی بۆ بچڕێت. بەڵام یاخوا نەگاتە ئەو ڕۆژەی لە واقیعدا ئەم دۆگمایە بسەپێنێ بەسەر کۆمەڵدا. ئەوسا (کە بە خەیاڵ (ئەوسا)یە دروست بکەین) بە دەست خۆی نییە کە دەبێتە دوژمنی هەموو ئومێدێکی گەشتی مرۆڤایەتی چونکە کۆمەڵ وشک دەبێت... ڕەق هەڵدێت... لەبرسان دەمرێت... دەبێتە کۆیلە و جارییەی چینی قەمچیوەشێن... داهێنان و ئافراندان و جوانکاری و کۆمپیووتەر و کەشتی ئاسمانی و هەموو هونەری مرۆڤایەتی وەکوو گەڵای پایز هەڵدەوەرێن... چرۆ ناکەن هەتا هەڵبوەرێن چونکە پرۆلیتاریای نەخوێندەوار و ڕابەری شیوعییەتی کوردی بێئاگا لە زانستی تەڵەسماویی سەردەم لەوە پتری پێ ناکرێ زمانی زاناکانی ناپرۆلیتاریا ببڕێت و چاویان بکوڵێت هەتا نەڵێن و نەبینن، نەکا ئابڕووی خۆیان بچێت واتە کە هی ڕابەرەکان و هی پرۆلیتاریای بێسەواد... ئەگەر شیوعەتیی کورد واز لە

دۆگمای شۆڕش نەهێنێت وەک کە شیوعەتیی ئەورووپا و وڵاتانی پێشکەوتوو وازیان هێناوە پشتاوپشت دەگەڕێتەوە و بەرەو تاریکایی دەمی «محاکم تفتیش»ی کەنیشتە دەکشێتەوە... قسە زۆرن لێی دەبڕمەوە.

دەگەینە ئەو نوختەی کە بە کورتی تێکداگەڕانی ئەو سێ هۆکارە و نەریتی کۆنینە و دەوری تیریژە گچکەکان و تین و تاوی واقیعی پڕ چەڵەمەی ناوچەی کوردی تێدا دەژیت، بخەینە بەر لێکدانەوە ئاخۆ چ ئەنجامێک وەردەگرین. ڕاستییەکەی بە ملەوەگرتنی ئەم مەسەلەیە لە دیدی پرسیاری نوختەی سێیەم کە چ هۆکارێک حوکمی لەسەر عەقڵی کوردی کردووە تا بڵێی ئەرکێکی قورسە و قووڵبوونەوەی دەوێت و نەفسی درێژی گەرەکە و پێوانەی بە پانایی کوردستانی پێویستە. دەبێ بزانین لێکتر دابڕانی کەرتەکانی کوردستان و مەحکوومبوونی بە پتر لە سێ دەوڵەتی ڕەگەز جودا «تورک، فارس، عەرەب» و گوماناوی بەرانبەر کورد دەستی وەشاندوە لە پێکهاتنی «هۆش»ێکی کوردی، بە جۆرێکی سەلبی، لە پەراوێزی پرسیارەکەدا... خۆم ئاوایی ئەتۆم دیتووە بەر لە ساڵی 1936، 1937 کە حکوومەت چوو بۆ پژدەر، پێوەی دیار بوو کە دابڕاو بووە لە خشکەی مێژوو، لە 1963 خێزانم دیت لە دێی باووزە شکڵیان، لەسەر شێوەی باز و باشووکە کە دەندووک و چڕنووکیان قولابین. ئەوانیش نیهایەتی ئەندامەکانیان قولابی دەهاتنە بەرچاو وەک بڵێی لە دێرزەمانی هەزاران ساڵەوە خوێنی بێگانەیان تێکەڵ نەبووە، دەتگوت لە پەیکەری سۆمەر و ئەکادەوە پەڕیونەتەوە بۆ جیهانی نوێ... یەکێکم دیت لە ناو شاخەکانی نێوان ڕانیە و پشتئاشان دەموچاوی لە هی کوندەبۆ دەچوو، لە شاخەوانیش خۆی نزیک کردبۆوە لە حەیوانە کێوی... ناوی نەبی بوو. باسی یەکێکی پێش خۆیانیان دەکرد کە لە قەڵشتی شاخێکی بەرانبەرمان، 200 – 300 مەترێک بەرز بوو، سەرکەوتووە بۆ مێش بڕینەوە، ڕێی نەبووە بەرەژێر بێتەوە لەبەر قورسایی هەنگوینەکە تێهەڵکشیوە وەک حەیوانەکێوی بۆ سەرووی شاخەکە بە خۆی و هەنگوینەوە. لە پەنا و پەسێوی کوردستانی بەرین سەدەها شوێنی ئەوتۆیی هەیە دابڕاوە لە دنیا و مەتەڵی «عەقڵەکەی

دانیشتوانی» بە کەس هەڵنایەت مەگەر کەسێک لەگەڵیاندا بژیت و دەفتەری موفرەدات و نەریت و پۆشاک و.. و... هتدیان پەڕپەڕ هەڵداتەوە تا بزانێ بەر تین و تاوی چ کاریگەرێک کەوتوون. لە نموونەدا دەڵێم، چەند دێیەکی دەشتی کۆیێ ڕێژەی جەمعی ژمارە «2 و 3» دووپات دەکەنەوە و دەڵێن، دووانان، سییانان... بە درەنگەوە لەپاش خوێندنەوەی چەند کتێبێکی سەر بە زمانە ئێرانیەکانی کۆن، بیرم بۆ ئەوە چوو کە دەشێ ئەم ڕێژەیەی دووپاتە لەوەوە هاتبێت کە جەمعی وشە لە کۆندا بە «ام» بووە بەڵام ناواخنێکی «ان» هاتۆتە نێوان وشەکە و «ام»ەکە وێکڕا بوونەتە «... انام». وەک بڵێی ئەم «انان»ەی دەشتی کۆیێ پاشماوەی ئەو دەستوورە بێت لە «دوو، سێ» بەدەری دابێتەوە لەگەڵ نەختێک گۆڕان... لە بەشێکی قەزای ڕانیە[8] خەڵکەکە لە جیاتی «کردن، بردن... » دەڵێن «کرتن، برتن... » کە دەشێ پاشماوەی پەهلەویی کۆن بێت... ئەم درێژەیە بە نیازی ڕوونکردنەوەی سەختیی کارەکەیە، ڕەنگە بە خۆتەرخانکردن بۆ لێگەڕان بە دوای وردیاتی گفتار و ڕەفتار و نەریت و باوەڕی کوردزمان بە پانایی کوردستان چەند گۆشەیەکی ئاشکرا و بزری «عقلیة»ی خەڵکەکە ڕوون ببێتەوە... لەگەڵ ئەمەشدا و بە هەر جۆرە پشکنین و شیتەڵکردنی دیاردەی جۆراوجۆری سەرلەبەری میللەتەکەمان بێت (کە لە ئیمکاندا نییە و حکوومەتەکانی کوردچەپێن ڕێ نادەن بەکاری ئەوتۆیی، کوردەکەش نە دارایی و نە ئاگاداریی ئەو جۆرە کارەی هەیە... ئەوجا ساڵەهای دەوێن تا شیر دا و لۆ داپیردا بە ئەنجام دەگات، ئەم نووسینەش کۆن دەبێت و تۆش تاقەتی چاوەنۆڕیی بیست سی ساڵیت نییە... ئیتر دەبینی زەحمەتییەکە لە چ ڕادەیەکدایە) ئەو ڕاستییە هەر دەمێنێ کە دیراسەی «ویژدان»ی نەتەوەیەک بکەیت بە بەر کارێکی مەیلەو موستەحیلەوە دەنیشێت تەنانەت وڵاتی هەرە پێشکەوتوو بە خۆی و دارایی و زانست و تەکنیک و مێژووی درێژی داهێنان و دۆزینەوەیەوە ناتوانێ دەست دانێ لەسەر هیچ گۆشەیەکی ویژدانی میللەتێک و پێناسەی بۆ دابنێت. هەر لەوەندە تێفکرە کە میللەتێک

له میللەتانی پێشکەوتوو هێندێکی مولحید بوو، هێندێکی خواناس بوو، هێندێکی خواناسی بێ قیامەت بوو، هێندێکی لە خواناسیدا جودا بوو لە دروا‌سێکەی، هێندێکی «اباحي» بوو، هێندێکی تاکژنە بوو... هتد، چ دەمێنێتەوە لەو ویژدانی وەها کەرتوپەرت و لێکوژ کە بخرێتە بەر هێز و هۆکارێکی دەستنیشان. لە وڵاتی پێشکەوتوو کە وەها لەلایەن ویژدانەوە لێکتر دوورن و بە شەڕیش نایەن هێزی دیمۆکراسی و ژیارییە دەیانپارێزێت کە بە ئەسڵ ئەو هەموو جوداوازییەی بیروباوەڕ لەسەر بنەمای ئازادیی بەرفرەوان و سەلمێنراو هەڵستاوە. لە وڵاتی جیهانی سێیەم ئەندامانی یەک گرووپ دەست لە بینەقاقای یەکتر دەنێن.

بە هەمەحاڵ زانینی ئەو هۆکارەی تۆ لێی دەپرسیت فەرقێک بە واقیعەکەمان ناکات. گریمان زانیمان هۆکار و هێزی فلانە بابەت حاکمی عەقڵی کوردە، ئەوجا چی؟ چیت پێ دەکرێ؟ کێ قسەت دەبیستێت؟ خۆت کە باوەڕت نەبوو بەو هۆکارە دەیسەلمێنیت؟ چ بسەلمێنیت و چ نەسەلمێنیت، تۆش وەک خەڵکی بیروباوەڕی تر بەسەر ڕێبازی خۆتدا دەڕۆیت و باشتریش بەرهەڵستی ئەو هۆکارە دەکەیت کە پێشتر ڕوون نەبوو لێت ئەمجا لە ڕووناکیدا تیری تێ دەگرێت، ئەویش هەروەها تیر لە تۆ دەگرێت... وا دەزانم ناشێ چیتر بەدوای ئەم هێز و هۆکاری سێیەمە بکەوم[9]، هی چوارەم دێت... بەڵام جورئەت ناکەم دەستی بۆ درێژ بکەم چونکە لە ئیمکاندا نییە (لە ڕوانگەی خۆمەوە) بگەم بە کۆتاییەکەی، ڕەنگە کەسیش تاقەتی نەبێ لەگەڵمدا بە کێشە بێت.

4) کورد مێژووی ڕاستەقینەی خۆی هەیە؟ یاخود مێژووی نووسراوەتەوە؟

سەرەتای پرسیارەکە لە بەدیهییە دەپرسێت، هەڵبەت کورد مێژووی هەیە وەک کە هەموو نەتەوەیەکی ئادەمیزاد مێژووی هەیە خۆ دونبەڵان نییە لەگەڵ گرمەی هەور هەڵتۆقێت.

له بابەت مێژووی نووسراوەوە. ئەوەندەی بزانم کورد هەرگیز دەفتەری ژیان و چەکمەسەریی حاڵوباری بە دەست داگیرکەرەوە نەگرتۆتەوە هەر نەبێ لەبەر نەبوونی لایەنێکی ئەوتۆ هێندەی بەبەرەوە بێ بتوانێ شتێک تۆمار بکات کە لە هەزاران ساڵەوە نەکراوە، ئەوجا نووسینی کوردی بە خەیاڵی کورددا ڕەت نەبووە... کەس خۆی لە چیرۆکی بێ دەسەڵات و بێ ناو و شۆرەت ناگەیەنێ... ئەوجا ئەگەر یەکێک هەڵکەوت وەکوو شەرەفخان هەر هێندەی پێ دەکرێ ئەو شتانە بنووسێت کە لە ڕۆژگاری خۆی و نزیک بە خۆی بدوێت چونکە خەبەری کوردی بەر لە هەزار ساڵ و پتر هەر ئەوە بووە مەلائیکەتەکان تۆماری دەکەن بۆ لێپرسینەوەی ناو قەبر و بەهەشتیبوون و جەهەننەمیبوونی مردوو ساغ دەکاتەوە. بە ڕێکەوت، دوای ئەم نووسینە د. کەمال مەزهەر هاتە لام و پرسیارەکەم خستە ڕوو، ئەویش هەمان چشتی گوت.

5) توخمە پێکهێنەرەکانی مێژووی کورد چین؟ ئەقڵ یاخود قەزاوقەدەر حوکمی تێدا کردووە؟

پاش ئەوەی گوتمان کورد مێژووی نووسراوی نییە دەمێنێتەوە بڵێم مەبەستت لە مێژوو ئەو ڕووداوی کۆمەڵایەتیی کوردە کە هەرگیز تۆمار نەکراوە و بە نەبوو حیساب دەکرێ لە ڕووی حوکم لەسەر دانیەوە. بەو پێیە پرسیارەکە خۆی بەتاڵ دەکاتەوە، بەڵام کە ئەقڵ و قەزاوقەدەرت خستە پاڵ پرسیارەکە جۆرێک هەبوونی گریمانەکی «افتراضي» پەیدا دەکات وەک کە گوتبێتت، توخمی پێکهێنەری ڕووداوان، ئایا، ئەقڵ یاخود قەزاوقەدەر دەیانگێڕێ؟ بەم ڕێژەیەش پرسیارەکە هەموو ئادەمیزاد دەگرێتەوە چونکە ئەقڵ لە هەموو ئادەمیزاددا هەیە. قەزاوقەدەریش کە هەبێ بۆ ئادەمیزاد و ڕۆحلەبەران هەمەگیرە... گریمان توانیمان پرسیارەکە لە قەزاوقەدەر بدزینەوە و ڕووبەڕووی حوکمی ئەقڵی بکەینەوە ئەوساش سەرەدەری کردن لە

پرسیارەکە تا بڵێی تەماوییە چونکە، لە لایەکەوە چالاکیی مرۆ بەندە بە کاریگەریی عەقڵەوە نەک غەریزە، لە لایەکی تریشەوە عەقڵ، لەبەر زۆری هۆی جودا، دەشپێکێت و بە هەڵەشدا دەچێت و تا مرۆڤیش لە پلەی سەرەتایی ژیاری «حضاري» بێ پتر ئەسیری ورێنە و ئەفسانە و فاکوفیکی عەوامخەڵەتێنان دەبێ، ئەمجارە وەرە مێژووی نەنووسراو لە قەبەڵ ڕووداو و کەینوبەینی سراپەوە بکە و بیخەرە بەر حوکمی ئەقڵێکی هەڵەشە و کوێرەوار ئاخۆ چۆناوچۆنی قەڵەم و زمانی لێ بەگەڕ دەخەیت و چیی لێ هەڵدێنجێت؟ وەک دەبینیت کارەکە لە خەیاڵێکی مەتەڵاوی بەولاوە نییە. هەموارترین ڕێگەی ئاکامگری «استنتاج» ئەوەیە کە ڕابوردووی نەزانراو بە حازری بەرچاو بگیرێت و بەشێوەیەکی لە ڕاستی نزیک حوکمێکی بۆ حازری دادەنێیت بۆ ڕابوردووشی دابنێ، جا ئەگەر لە ئاست حازر وەڵامت بۆ ساز درا نوسخەیەکی بکە دیاری بۆ کۆنینە. بە هەمەحاڵ زەرەری تێدا ناکەیت چونکە کۆنینە لە زەرەر و قازانج ڕزگار بووە. بۆ لایەنی ڕەواندنەوەی دڵەسوورکێ و سەرەسوڕکێ، زەینی خۆت بدە حازر و توخمە پێکهێنەرەکانی دەستنیشان بکە و توخمی تازەبابەتی لێ دەرکە و ئەوی دیکەی دانێ بە پێکهێنەر بۆ باپیران. ڕەنگە لەم بوارە دوو بەرگەکەی مرۆڤ و دەوروبەر تا مەودایەک یارمەتیت بدات.

بەوپەڕی کورتبێژی و لە چەند دێڕێکدا دەڵێم، گریمان بۆ ئەوە چووین کە پێشینان ملکەچی فکرەی قەزاوقەدەر بوون، وەک کە ئێستاش قەزاوقەدەر بەسەر زاروزمانانەوەیە، دەسا ئەوسا و ئێستاش خەڵکەکە چیی لە دەست هاتبێت کردوویەتی و قەزاوقەدەری نەکردۆتە وەستای خانوو و جەنجەڕی خەرمان و نۆرەئاوی شینایی و جلدووریی بەرگ. ملکەچییەکی بۆ غەیب بەکار هاتبێت لە بەجێهێنانی نوێژ و ڕۆژوو و لکەکانی دیکەی ئایین بووە. کابرایەک تەڵاقی خواردبێت نەچووە بۆ لای قەزاوقەدەر هەڵیبەستێتەوە. سێ ڕوونکردنەوەی بچووک هەیە لێرەدا بێسوود نییە.

1- قەزاوقەدەری دینە ئاسمانییەکان جودایە لە Totemism و هێندێ شێوەی بوتپەرستی.
2- قەزاوقەدەری ئاپۆرەی خەڵک تێکەڵ لەگەڵ کەمزانی و تا رادەیەکیش بێدەسەڵاتی.
3- قەزاوقەدەری ئەهلی «عرفان» لە باوەڕی هەرە خەستی تاکپەرستی و توانەوە لە زاتی خوا دەگەشێتەوە. قەسیدەی «ئەحوەلی تەفرەقە نەزەر»ی نالی نموونەیەکە لەم بابەتە باوەڕە هەرچەند نالی خۆی سلووکی دەروێشایەتیی و سۆفیگەریی نەکردووە.

6) ناسنامەی بیرکردنەوەی ئەقڵی کوردی کامەیە؟

ئەگەر ناسنامەیەکی زانستییانەی سەلمێندراو هەبایە بۆ ئەقڵی نەتەوە دواکەوتووەکان شتێک دەبوو پڕ بە پێستی پرسیارەکەت بەمەرجێک لە پلەی ژوورووی هەرە دواکەوتوو دابندرێت. لە نموونەدا ئەم نوکتەیەت بۆ دەگێڕمەوە، بەنگکێشێک بەنگی کڕی بەمەرجی کاریگەربوونی بەنگەکە... چوو لە حەمام بەنگەکەی کێشا چەندی کردی پێی مەست نەبوو... دەرچوو لە حەمام، بە ڕووتی، بۆ بازاڕ... یەخەی فرۆشیارەکەی گرت لەسەر هێندی کە بەنگەکە سەری گەرم داناهێنێ... کابرای فرۆشیار هاواری کرد، ئەرێ عالەموڵڵا بەنگ چ بکات لەوە زیاتر کە بەنگکێش بە ڕووتی لە حەمامەوە ڕاپێچەک بدات بۆ بازاڕ! ئێمەش پێناسەی بەهێزتر لە «خۆکوژی» و لە شەڕەئایدیۆلۆجی و بیست کەرتکی و وێرانکاری لە ناو زاری شێر و بڵێسەی ئاگر و نێرینەی لافاو چۆن پەیدا بکەین، شەقڵێکی مزرۆکەش لەوەدا بەدی دەکەین کە ڕۆشنبیرەکانمان ڕووی نەخوێندەوارەکانیان سپی کردۆتەوە بە زێدە ڕژدی لەسەر قۆنتەراتی قەبری کورد و کوردستان... ! بە مەلای مەشوور «مەلا مەزبوورە» یان گوت، باینجانمان بە کوڕەکەت نیشان دا

گوتی، ئەمە فەرخە گامێشە چاوی نەپشکوتوون. مەلا گوتی، باوەڕ بکەن بە ئەقڵی خۆی زانیویەتی من پێم نەگوتووە...

ڕۆشنبیر و خەباتگێڕی کوردیش لە بلیمەتی خۆیەوە، بێ مامۆستا، مەتەڵی قرتێخستنی کوردی هەڵێناوە!!

براله! ئەقڵی چی و فامی چی... ! هەر ئەوەندەم بە بیردا دێت کە دەگوترێ، لە بێخەبەران کەشکەک سەڵاوات... ! خۆزی هێندەی «ابن هنبقە، یان همنقە» یان هۆش هەبووایە کە نیوەی خانوویەکی هەبوو فرۆشتی، لێیان پرسی بۆچیت فرۆشت؟ گوتی، بەو پارەیە نیوەکەی دیکە دەکڕمەوە سەرلەبەری خانووەکە دەبێتە هی خۆم، لێی پیرۆز بێ!

7) عەقڵانییەت لە بیرکردنەوەی کوردیدا هەبووە و هەیە؟

پەراوێزی ڕاگەیاندنی وشەی «عەقڵانییەت» لێک دەکێشرێتەوە تا ئەوەی باوەش بە گەلێک بابەت و چەندایەتی و چۆنایەتیدا دەگرێت، حەزیشم دەکرد مەبەستت ڕوونتر کردبایەوە ئایا واتای وشەیی یان فەلسەفیی وشەکەت مەبەستە.

بیرکردنەوەی کوردی زاراوەیەکە پێکهاتووە لە گونجانی دوو وشەی «بیرکردنەوە» و «کوردی». یەکەمیان «موصوف» دووەمیان «صفە»تە بە هەردوویان واتایەکی مەفهووم دەبەخشن، وەک ئەوە نییە بگوترێ، کۆتر + دۆشاوڕۆن=؟ کە دەشڵێم زاراوە مەبەستم نییە دەقەکە زاراوەی سەلمێنراو بێت.

عەقڵانییەت خۆی لەوانەیە بە زاراوەی مەنتیقی و فەلسەفی بڕوات، هەڵیش دەگرێت مەفهوومی قامووسی تێدا مەبەست بێت کە ئەوسا هۆشپەسەندایەتی دەگرێتەوە (تۆش ڕێت هەیە دەقێکی دیکەی بۆ هەڵبژێریت). چی لە خاڵی شەشەم دەربارەی پێناسەی بیرکردنەوەی ئەقڵی کوردی گوترا ڕێ نادات

خەیاڵگێڕی بکەین لە عەقڵانییەت. بەڵێ کەسانێک هەن لە ڕێی خوێندنی نوێوە، نەک هەست و فامی کوردەوە، بیرکردنەوەیان هەبێت و عەقڵانییەتیشی تێدا بێت بەڵام دوو تێبینی هەیە نایەڵن عەقڵانییەتەکە هی بیرکردنەوەی کوردی بێت. یەکیان ئەوەیە عەقڵانییەتەکە ڕووبەڕووی جۆرە لێکدانەوە و فکر و هۆشێک دەبێت شەڕ بە عەقڵانییەت دەفرۆشێت. دووەم ئەوەیە ئەو کەسانەی ڕۆشنبیری کورد حیساب دەکرێن لە ئاکامی ئاشناییان بە سەقافەتی ئەورووپاوە هێما دەکەن بۆ ڕێبازی چارەسەریی دەردی کورد کە پێوەنداریەتیی بە واقیعی کوردەوە زۆر سستە وەک ئەوەی کە گەڕۆک ساز دەیت بۆ چوونە قەندیل لە جیاتی ولاغ. نەخێر چاکترە بڵێم، بە سواریی گەڕۆک بچیتە ڕاوە کەروێشک... قەندیلەکە زۆر زەقە!! لە نموونەی عەقڵانییەتی تاکی ڕۆشنبیری زانکۆی کوردی کتێبی «ڕستەسازی و شیتەڵکاریی زانستی»یە لە نووسینی د. شێرکۆ بابان کە خۆی و هاوڕێکانی کۆمپیوتەریان تێدا بەکارهێناوە[10] چ ئاکامێک وەدەست ناکەوێت لە درێژەدان بەم قسانەوە مەگەر هەندێ پەند و ئامۆژگاریی ساردوسڕ بە قاچاغ بێتە ناو قسانەوە.

8) سیاسەتمەداری کورد واقیعبین بووە یاخود کتوپڕی زاڵ بووە بەسەریدا و بڕیاری پێ داوە؟

حەزم دەکرد بمزانیبایە کێت مەبەستە لە سیاسەتمەدار؟ خەباتگێڕی ئەم ڕۆژگارە؟ خاوەن بیروڕای سیاسی هەر بابەتێک بێ؟ ئەمیرەکانی بەر لە سەدەی بیستەم؟ بەدرخانییەکان و شێخی پیران و شێخ مەحموود و سمایلاغای شکاک و مەلا مستەفا و قازی محەمەد؟ نائیب و وەزیر و زاپتی کوردی دەستی هەبووبێ لە کوردایەتی؟ عەشیرەتی وەک پژدەر و جاف و جەلالی کە لە دەمێکەوە سەروکاریان بە عوسمانلی و ئێرانەوە بووە؟ دواتریش بە عێراقەوە، «جەلالی»ی لێ دەرچێت؟ ناو و ئەدرەسی دیکەش هەن،

هێندێکیان کۆن و هێندێکیش مامناوەنجی، ئێستە ناتوانم بگەڕێم بۆ سەرچاوەی بەردەست لە بارەیانەوە...

براله! وردەکاری و بیندرێژی لەم پرسیارە تا سەر دەنێ بە وەڵامێکی خۆم لێی ڕازی بم لە ڕادەبەدەر ئاوخوازە، ڕەنگە کتێبولکێک بگرێتەوە، ئەوساش سوودێکی واقیعی ئەوتۆی نەبێ لە گۆشەی نەزەری تیماری دەردی کورد (هەر نەبێ بە پێی بینینی خۆم) ەوە. دەشێ دەستوور و بیروڕایەک هەڵێنجرێت لە سەرجەمی هەڵکەوتی حاڵوبار و ڕووداو و سیاسەتێکی لە کۆنەوە تا ئەم ڕۆژگارانە زاڵ بووە بەسەر چارەنووسی کوردەوە بە تێکڕایی و بە کەرتکی و بە تیرێژی و بە تاکیەوە.

دەبێ بزانین، نەبوونی دەوڵەتی کورد بە ناچاری و بە بڕیەی وشاری هێزێکی وەک هی «اجل مبرم» پەیدا بوونی تارمایی بیروڕایەکی گشتیی کوردی لە پزدانی مێژووی کورد سڕیوەتەوە. حەز بکەیت دەتوانیت ئابووریش بخەیتە سەر بیروڕای گشتی کە مومکین نییە بە دوژمنایەتیی حکوومەتی داگیرکەر ئابووریی کورد یا هەر میللەتێکی ژێر دەستی جانەوەری جیهانی سێیەم چرۆ بکات. کە ئابووریت نەبوو دەست بشۆ لە دووان لە بابەت هونەری خانووسازی... ڕێوبان هەموار کردن... هەندەسەی پرد بەسەر ڕووبار و زێوە... خولاسە دەست بشۆ لە هەموو لایەنێکی پێوەندیی هەبێ بە «ژیار — حضارة»ەوە. ئەوجا کە حاڵ وەها بوو ناشێ بیر بکەیتەوە لە 1- پلانی عەقڵی. 2- بێپلانی و کتوپڕی. لە ڕەفتاری ئەمیرێکی یاخود سەرەک عەشیرەتێکی بەر لە سەدان ساڵ کە هەلی جموجووڵێکی بۆ پەیدا بووبێت چونکە پێش ئەو هەلە لە بارێکدا نەبووە پشوو درێژ بکاتەوە بۆ هەڵبژاردنی پلان... ڕۆژ لە دوا ڕۆژی بەسەر بردووە بەدیار قەزاوقەدەر... هەڵکەوتی ناگەهان... کارەسات، کە والی و فەرماندەی بێگانە لە هەرێمەکەی خۆی گۆڕابێ ترس و لەرزی والیی نوێ ئۆقرەی لێ هەڵگرتووە... هەڵبەت تەجرەبەی ساڵەها ئەقڵێکی داوەتێ ڕەفتاری شیاو بە داخوازیی حاڵ بگرێتە بەر، بەڵام لە سنووری بەرژەوەندی خۆی نەک هی کورد یاخود هەرێمێک... (لە بیرمە، کە حکوومەتی بەغدای

چلەکان دەستی دایە هێرش بۆ سەر بارزان یەکێک لە خاڵەکانم بە عەشیرەتەکانی دەوروبەری ڕاگەیاند کە پێویستە پاڵپشتییەکی بارزان بکرێت هەر نەبێ لە بەرژەوەندی خۆیان... سیاسەتمەدارێکی زێدە هۆشیار و بە دەسەڵات گوتبووی، گەنجی خوێن گەرم زۆرن، ئەرکەکە بە ملە خۆیانەوە دەبەستنەوە. ئەم نموونەیە خۆی ڕەپێش کرد، دەبوو بدرێتەوە بەم سەردەمە نەک لە جغزی ڕۆژگاری کۆن قسەی لێوە بکرێت).

ڕۆژگار بە بانگلۆز گەییشتە دەورانێک بیر و ئایدیۆلۆجی و هونەر و زۆربەی بەرهەمی زانست و ژیاریی ئەوروۆپا لە سەدەی نۆزدەمەوە گەییشتە کوردستان بێ ئەوەی بنگە ئابوورییەکان و فابریقەکانیان ڕێیان هەبێ بۆ چۆڵگەی کاکی بە کاکیی کوردنشین بکەونە ڕێ. جێگەیەکی وەکوو کویێ لەساڵی 1951 مەکینەی کارەبای گەییشتێ و بوو بە شەشەمین ئاوایی کوردستانی عێراق پاش هەولێر و کەرکووک و سلێمانی و دهۆک و هەڵەبجە... زۆر بە سەیری، ڕەنگە سەیریش نەبێ، لەسەر ساجی عەلییەوە گەنجی کورد بوو بە هەڵگری دروشمە نازۆکانی ژیاریی ئەوروۆپا کە هەمووی بەندە بە زانست و تەکنیک و دیمۆکراسی و ئاوەدانی و ژێرخان و ژوورخان و ڕابوردووی سەدان ساڵ لە فراژووتن و ڕاهاتن بە ڕەفتاری ژیاری و چی... و چی کە نایەتە ژمار و وێنەگرتنەوە... ئیتر لە ڕێگەی کورتەوە دەگەمە ئەوەی بڵێم وا ئێستا کوردی پرزۆڵ و دەرۆزەکەر دە جاران بایی خۆی حیزب و حیزبێنی و بیروڕای سەر بە خەبات و پرۆژەی سەقافیی لێکتر جودا و مەیلەو موستەحیل، وەکوو نێرگلە و جگەرە، دەکێشێت و دووکەڵەکەی بە فیزەوە لە کونی گوێچکەکانی وەدەر دەنێت (نەکا پێی بڵێن کۆنەپەرست). فەلسەفە و بەرنامەی جوداجودای جیهانی پێشکەوتوو تا بڵێی فێرگەی فەلسەفی و سیاسیی جوداجودای بە کورد گەیاند بێ بنەما و ژێرخان وەک ئەوەی لە دوورەوە بە نووسین فێری بیست جۆرە لێنانی بریانی و پەقلاوە و دۆڵمە و شێخ مەحشیت بکەن بەڵام کەرستەی هیچ کامیانت نەبێ بگرە لە خوێ هەتا دەنکە کفریتی ئاگر کردنەوە... ئەوجا لەسەریشی بەشەڕ بێیت و دیتت

کابرایەک نیسکێنە هەڵدەقوڕێنێت بە خائینی دابنێیت... هەڵبەت گلەیی ناچێتەوە بۆ ئەورووپا، ماڵیان ئاوا بێ کە بە پەنابەر کورد دادەکەن... دوای ئەم پێشەکییانە کە یەکجار کورت دەهێنێ لە ئاست پرسیارەکەت سەر بە «واقیعبینی و کتوپڕی»ی سیاسەتمەداری کورد موعادەلەیەک خۆی بەسەر زیهنمدا دەسەپێنێ.

بێدەسەڵاتی + نەداری + کەرتبوون + سەختیی هەڵکەوت + فرەدوژمنی + نەریتی باری سیاسی ناوچە دژ بە چارەنووسی کورد + دڵ و چاو نووسان لە ئاست خۆویستی + قووڵایی 2500 ساڵی ژێردەستی = ئەو حاڵەتەی بە چاوی خۆمان دەیبینین لە کوردستان.

ئەگەر سیاسەتمەدار پێی بکرێ لە حاڵەتی ئێستاکەدا کە «واقیعییەت»ی لێ حەرام کردووە، یان لە خۆی حەرام کردووە، کتوپڕییەکی شایان بە مرۆی هۆشلەبەر و نمەکبەحەڵاڵ بەکار بهێنێت لە ئەزموونەکدا پلەی شەرەف وەردەگرێت.

واقیعێکی دروست بووە لە کوردستانی عێراق لە دوو کاریگەری، تەک و بەرتەک (فعل ورد فعل) سیاسەتمەدار و نامەدار بەرتەکەکە دەیبزوێنێت یاخود بڵێین تەنها بەرتەکی بۆ ماوەتەوە هەرچەند خۆیشی بەشدارە لە دروستکردنی حاڵەتەکە. ئەوجا دەشێ بەرتەکدەر لە سنووری ئیمکاندا بەرتەکە کەم زەرەرترەکە پەسەند بکات، بەوەشدا خوا خێری مردووانی بنووسێت...

بەر لەوەی تێکۆشەری کورد قاڵ بێتەوە بۆ ڕزگاریی کورد و بچێتە ژێر تاکە ئاڵایەک و بتوێتەوە لە تاکە حیزبێک و تف لە ڕابوردووی دووبەرەکی و دەبەرەکی بکات هەر خەریکی کارێک دەبێت پێی دەڵێن دوژمنحەسێنەوە و خۆپلیشێنەوە ئەگەر خۆکوژێنەوە نەبێت.

9) نەتەوەی کورد لەبەردەم عەقڵی سیاسیی کوردیدا چ چارەنووسێکی دەبێت؟ کورد پەندێکی هەیە دەڵێ: مانگەشەو سەر لە ئێوارەوە دیارە.

دەشڵێن کابرایەک نانی ورد کردبوو وەک قاووت، ڕەشەبای دەهات... هاوڕێیەکی سەفەر لێی پرسی، چ دەخوات... گوتی هەتا ڕەشەبای بێت هیچ... (ڕەشەباکە قاوتەکەی نەدەگەیاندە زاری کابرا). کوردیش لە سێبەری ئێستاکەی (ڕۆژی دوای جەژنی قوربانی ساڵی 1997ز) سیاسەتمەدارەکانی بێ، خەفەتی چارەنووسی بە ملەوە نابێ چونکە چارەنووسی نابێت!

10) ئەقڵی کوردی گەر هەیە لە چ پلەیەکی بیرکردنەوەدایە و گەر نییە بۆچی؟

ئەقڵی کوردی هەیە. لەو پلەیەشدایە کە لێرە بە پێشەوە بۆم باس کردیت بەکورتی. هۆی ئەو بوونەی کە نزیک نەبوونە، ئەویش بایی سادەیی پرسیارەکەت، نەختێکیش پتر لەو، ڕوون کرایەوە.

11) پێویستە کورد چی لە مێژووەکەی خۆیەوە فێر بێت؟

بەر لە هەموو شتێک دەبێ فێری عاقڵی بێت کە بریتییە لە: 1- یەکبوون. 2- یەکبوون. 3- یەکبوون. 4، 5، 6، 7، 8، 9... ... ...، 99- یەکبوونە، هەتا ئەو ڕۆژەی، چ بە فەرمانی سیاسەتی جیهانییەوە بێت چ بەهۆی ڕووداوی ڕەخساوی ڕێکەوت بێت، خۆی لە بارێکدا دەبینێت ئەویش وەکوو مرۆی جیهانی عادەتی مافی کوڕێنی و خۆگێلکردنی هەبێت کە بە ڕاستی زێدە زێدە بە تامترە لە خۆ تاسولووسدان و ئاپلی و داپلیبوون و بزەی سەری لێوان. ئەگەر مومکین بێ پێڕەوکردنی ئەم بەیتەی نالی خارشتی تیرەقەی پشت دەرەوێنێتەوە:

به ڕیا باری تەکالیف و ڕسوومی خەڵکی
چ دەکێشێ ئەمە بارێکە عەلاوەی کەرییە

دوور لە ڕووی عاقڵان. بە چاوی خەیاڵ پێشمەرگەیەک لە شەڕی براکوژی ببینەوە کە چوار پێشمەرگەی لە کوردە ناحەزەکەی ئەوبەری شەقام یاخود ڕووبار کوشتبێت، چ گەشاییەکی پێوە دیارە و چۆن چاوەکانی چریسکەی بەختەوەرییان لێ دەبریسکێتەوە... دەبێ کورد لە پەندی مێژوو و نامێژوو فێر بێت کە چاوی بە کوشتنی پێشمەرگە نەبریسکێتەوە... کوێربوون چاکترە.

- ویست، خواز چییە؟ چ ڕۆڵ و کاریگەرییەک لە «چییەتی – ماهیە» و هەڵوێستی مرۆڤدا دەبینێت؟ مرۆڤی بێ ویست و خواز چ پێناسەییەک هەڵدەگرێت؟

بمبەخشە کە دەڵێم دەبوو بنووسیت «... چ ڕۆڵ لە چییەتی و هەڵوێستی مرۆڤ دەبینیت نەک «مرۆڤدا» چونکە لێرەدا ڕۆڵەکە دەور دەبینێت نەک «هەڵوێستی مرۆڤدا» دەور دەبینێتەوە، دەدۆزێتەوە. ئەم «دا»یە بۆ حاڵەتی وەستان، سکون بەکار دێت. مەسەلەی «دا» بە دەمیەوە هەیە، لێرەدا جێی نابێتەوە. نالی دەڵێ، لە دڵدا ئاگری عیشقت بڵێسەی میسلی تەندوورە...

ویست و خواز هەستێکی بزێوە بەرەو دەروون دەچێت، لە ماددەی مردوودا نییە. دەشێ بڵێین ویست ڕووی دووەمی سککەکەیە ڕووەکەی تری بەخشینە، قوربانی دانە لەخۆبووردنە... هتد.

بە لێکدانەوەی سەرپێی و بە دیتنی واقیع دەردەکەوێت کە «خواز، ویست» بەهێزترین کاریگەرەکانی پارێزەری ژینە بۆ خاوەن خواز. لە هەمان کاتدا گەورەترین هەڕەشەیە لە ژینی ئەوانەی دەبن بە خۆراک... سروشت بریتییە لە قەسابخانەیەک بە بەرینایی بوونەوەری زیندوو. لە نووسینی دیکەمدا

گوتوومە هەستی داد و بەزەیی لەگەڵ مرۆ پەیدا بووە، هەرچی جانەوەرە تەنها ئەو بەشەی کە فەرخەی خۆی بە خێو دەکات لەو ماوەیەی بەخێوکردندا بایی دەوامی نەسل بەزەیی پێوە دیارە. نێرەکتک بۆی ڕێک بکەوێت بەچکەی کتک دەخوات. بەزەیی بەخشندەیە.

کە دووانمان لە بابەت مرۆوە بێت دەوری خواز لە ژیانیدا چ کێشانە و پێوانەیەک قبووڵ ناکات لەگەڵ خوازی گیانلەبەران چونکە سەرلەبەری جیهانی پڕ تەڵەسمی زانست و تەکنیک و شەڕ و ئاشتی و کەیف و شیوەن و... و... هتد بەندە بە بزوێنی «خواز». بە ڕێنموونی هۆش ملیۆنەها بەرهەمی خوازی چاک و بەد ڕۆژانە لە زاوزێدایە... بە خواز گەییشتە مانگ... بەخواز، لە دواڕۆژدا، دەگاتە کەشکەلانی فەلەک، خوازی جانەوەر لە جغزی غەریزەی سادەدا ژیانێکی سادەی نەگۆڕاو بەسەر دەبات، گۆڕانێکی بایۆلۆجی زێدە تەنبەڵ و هەستپێنەکراو لە ماوەی سەدان هەزار ساڵدا، ڕەنگە، چەند دانە موویەک لە سمێڵی کتک زیاد و کەم بکات... باڵ و کلکی چوێلەکە نەختێک ڕەنگیان زڕ یاخود تۆخ بێتەوە... هەرگیز لە جغزی غەریزەدا و بێ پژانی هۆش مومکین نییە «کۆمەڵایەتی» پەیدا ببێت.

مرۆڤی بێ خواز دوو جۆری هەیە، یەکەمیان «هۆشپەککەوتە». دووەمیان ئەهلی دەروێشایەتی و سۆفیگەریی سلووکی قووڵ. ناوناوەیەک نەخۆشیی خوازکوژ یان پەژارەی هەستچەپێن دەوری ویستن و نەویستن بە مرۆوە ناهێڵێت تا ئەوەی کە مەرگ ڕووی تێ کرد دەستی لێ هەڵناوەشێنێت. پووری گەورەم بە جحێڵی برایەکی مرد... لەو دەمەوە تا بەینێکی دوورودرێژ دەیویست بمرێت بەڵام خۆی نەدەکوشت کە بە لایەوە دین ڕێ نادات... لە شەوی هاوینەی گەرم کە مار و دووپشک لە گەرمان دەکەونە گەڕان، ئەو پوورەم لە ژووری تاریکی کۆنە خانووی دوو سەد ساڵی درێژ دەبوو بەڵکوو گەزەندەیێک پێوەی بدات... کە من هاتمە دنیاوە ئەو ئەو حاڵەتەی بەسەر چووبوو... دیتوومە کیژی 20 ساڵی لە ئاکامی وەتەنگ هاتن خۆی سووتاندوە... ئەمانە حاڵەتی دەگمەنن. خوازی ژین و مانەوە لە بوونەوەری بنەڕەتییە...

مەکینەی لەشی زیندوو هەڵنراوە لەسەر بنەمای بەردەوامیی تاک و تیرە، تا ئەوەی منداڵی یزدان بە جۆرێک لەو تاریکستانەدا پەروەردە دەبێت هەر دەڵێی پزیشکی بلیمەت هەمیشە خەریکی تێرکردن و پاکسازییەتی...

- گەرچی مەبەستم نییە وەک فەرهەنگی زاراوەکان ڕووتان لێ بنێم و داوای پێناسەی کۆمەڵێ زاراوە و چەمکتان لێ بکەم، وەلێ هەم ناچاریی هەژاریی بیر و کتێبخانەی کوردی، هەم شارەزابوونی ڕوونتری بیروڕاتان ئەم هەوڵ و تەقەلا و نەنگییە ناچارییەی وا بە ملەوە، کە دەمخاتە بارێکەوە ڕێگەی دوور و وشک و گەلێک جاران نەگونجاوی پەنابردنە بەر فەرهەنگەکان کورت بکەمەوە و ڕاستەوخۆ لە باری سەرنجی ئێوە پرسیار بکەم:

1- ویژدان چییە؟

2- ژیان بە کام ئاستی پێویست گەیشتووە، لە کاتێکدا زانایان دوو دەستەن، دەستەیەک ڕەزامەندن بەرانبەر بە ژیان و بە دوا چڵەپۆپەی دەستکەوتەکانی دادەنێن و هەوڵ و داوای چاکترکردنی دەکەن؟!

وشەکە ویژدان لە عەرەبییەوە هاتووە، ئەسڵەکەی «وجدان»ە لە فیعلی «وجد» هاتووە هەم بە مەعنای «دۆزیەوە» و هەم بە «سۆزی بزووت». قەتیش نەمپرسیوە لە کامیانەوە بە مەعنای «ویژدان» هاتووە، دۆزینەوە، یان ئەوی دیکە... سەرچاوەیەکیشم لا نییە بۆی بگەڕێم، بەڵام بە پێی ڕواڵەت دەبێ بەلای سۆز و بەزەییدا بچێتەوە نەک دۆزینەوە.

دەتوانین بڵێین ویژدان کە هەستێکی دەروونیی مرۆڤ بێت ناشێ لە جانەوەردا بڕسکێت. بەڵام دیاردە هەیە لای هەندێ جانەوەر دەیخاتە ڕیزی ویژدانەوە. لە عەرەبی گوتەیەک هەیە دەڵێ، «غزل الكلب». لەوەوە هاتووە کە سەگ ڕاوی مامز دەنێت و دەرفەتی قوتاربوونی پێ نامێنێ لە تاوان ڕادەوەستێت و دەمرقێنێت، سەگەکە بەزەیی پێدا دێت وازی لێ دەهێنێت. لە

کتێبانیشم دیتووە، سەگێک ڕۆژانە خۆراک پەیدا دەکات و بۆ لایەکی دەبات... یەکێک بە دوای دەکەوێت تا دەگاتە دەرەوەی ئاوایی، دەبینێ خۆراکەکە دەداتە سەگێکی کوێر... ئەم نموونانە، خۆیشم چشتی ئەوتۆیم دیتووە لە پشیلە کە بەچکەی پشیلەی نەساغی شیر داوە هەتا دایکەکە چاک بۆتەوە... بەڵام ئەم نموونانە کاری غەریزەن لەگەڵ نەختێک فام کە بەدەگمەن لە جانەوەر بەدەر دەداتەوە. هەرچی ویژدانی مرۆڤە، وەکوو مەسەلەی داد و بەزەیی، بە تایبەتی «داد» لێکدانەوەی لەگەڵدایە و ڕەنگێکی تۆخی کۆمەڵایەتیشی پێوەیە کە خاوەن ویژدان لەو ئینسافەی بەکاری دەهێنێت چشتێک دەکات خۆی موحتاجیەتی. مرۆی عادەتی بەشی زۆری بۆی ڕێک دەکەوێت لە دەرفەتدا شت بدزێت بەڵام نەک هەر نایکات بگرە بە عەیبێکی نامەردانەشی دادەنێت. شت دەدۆزێتەوە و دەیداتەوە بە خاوەنی.

هەرچەند زەحمەتە پێناسەیەکی بێ کەلەبەر بۆ ویژدان ساز بدرێت بەڵام دەشێ لە دەقێکی دوو فەقەرەیی جەخت بێت. 1- جێبەجێکردنی واجیب. 2- سەنگرانەوە لە ستەم. مەرج نییە واجیب هەر ئەوە بێ کە یاسا دەیسەپێنێ، بەڵکوو لە ڕوانگەی ویژدانەوە چاکەی دەرەوەی جغزی یاسا شیاوتر و مەردانەترە. ستەمیش هەموو بەدایەتییەک دەگرێتەوە قانوون بیگرێتەوە و نەیگرێتەوە، وەک ئەوەی جانەوەرێک زەدە بکەیت بە خۆڕایی دەبێتە بێویژدانی هەرچەند قانوون نایگرێت.

لەم لێکدانەوەیەدا ئاشکرایە کە لایەنی کۆمەڵایەتی پشکێکی هەست پێکراوی هەیە لە ویژدانی مرۆ...

نوختەی دووەم دەپرسیت، ژیان بەکام ئاستی پێویست گەیشتووە، لە کاتێکدا زانایان دوو دەستەن، دەستەیەک ڕەزامەندن بەرانبەر بە ژیان و بە دوا چڵەپۆپەی دەستکەوتەکانی دادەنێن و هەوڵ دەدەن و داوای چاکتر کردنی دەکەن؟ برەکیش لەوپەڕی قەناعەتی پەشیمانیدان و نائومێد و ڕەشبینن؟

ئەگەر قسەکەت بسەلمێنین کە زانایان ئەم دوو جۆرەن، بە دڵنیاییەوە دەڵێم هەردوو لایان بە هەڵەدا چوون. جگە لە هەڵە زۆریش کورت دەهێنن کە ژیان تەنها لە قەبەڵ مرۆڤ دەکەن، کە دەزانین مرۆڤ 1\1000000 ی گیانلەبەریان تێ نابێت، تۆ بڵێی 1\1000000000 !! کە هاتیت «ڕووەک»ت خستە حیسابی گیانلەبەر ئەوسا مرۆڤ لە لایەن ژمارەوە نزیک بە سفر دەبێتەوە. سەدەها هەزار ملیار ساڵ تێپەڕیوە بەر لە پەیدابوونی گیانلەبەر... ملیارەهای دیکەش بەسەر چووە تا مرۆ هۆشی تێگەڕاوە. لەو مەودای ئەزەلی تا سەرەتای «ژیان و مرۆڤایەتی» جیهان هەر هەمان جیهانە و نرخەکەی و گرنگییەکەی و تاک بوونەوەریەکەی نادۆڕێنێ بە بوون و نەبوونی گیانلەبەر و هۆشلەبەر کە هەردوویان بەشێکی هەرە هەرە ناچیزی خۆیەتی، بەڵێ دەزانین گیانلەبەر جودایە لە بێگیان، مرۆش جودایە لە هەموو شتی غەیری خۆی بەڵام جودا نییە لە جیهان کە خۆی، مرۆ، وەک زەڕڕەیەکە بە تەوێڵی شاخێکی هەزار ملیۆن هێندەی زەوی...

هەرچەند من خۆم لەگەڵ تاقمی ڕەشبین نیم هەمیسان حورمەتی قەناعەتیان دەگرم بە مەرجێک هەوڵ نەدەن خەڵک دەستپاچە بکەن... ئەبولعەلای مەعەڕڕی کە یەکێکە لە هەڵکەوتووەکانی ڕۆژگاری خۆی و هەموو ڕۆژگارێک هێندە دەستبەرداری ژیان و جیهان بوو ژنی نەهێنا، گۆیا، وەسیەتی کردووە ئەم بەیتەی لە کێلەقەبری بنووسن:

هذا جناه أبي علي
وما جنيت على أحد

لە قەسیدەیەکی زێدەمەشووری ئەم دوو بەیتەت دەخەمە بەرچاو:

صاحي هذي قبورنا تملأ الرحب
فأين القبور من عهد عاد

خفف الوطأ ما أظن اديم
الأرض إلا من هذه الأجساد

شاعیرێکی فارس بەیتی دووەمی بەم شێوەیە وەرگێڕاوەتە سەر فارسی:

خاک راهی که بر اومید میگذری ساکن باش

که عیونست و جفونست و خدودست و قدود

ڕاستییەکەی، کەسانێکی بڕیار دەدەن لەسەر هیچوپووچی دنیا و ژین و بوون و نەبوون هەتا بڵێی و لە ڕادەبەدەر و دوور لە ئینساف مافی بڕیاردان بە ملەوە دەگرن، ڕەنگە لە کەسیش نەسەلمێنن بڕیار بدات لە بارەی خۆیانەوە. ئنجا با ئێمە تاوگیر نەبین لەسەر بەدایەتی و پەسەندایەتیی بوونەوەر و خۆمانی لێ نەکەینە خالیق، تەنها سەرنج بگرینە هێندێ ڕاستی کە پێوەندییان بە بیروڕای ڕەشبین و گەشبینانەوە هەیە.

1- جیهان سەروبنی دیار نییە چ لە تەمەن چ لە مەودا. خۆ ئەگەر حورمەتی کەسانێک بگرین کە بێ سەروبنیی جیهان خەلەل دەگەیەنێ بە باوەڕی غەیبییان دیسان ئەو هێندە مەودا و تەمەنەی بە ئالەت زانراوە ملیارەها جار پترە لە هەر حیسابێکی هەڵبەستین بۆ پلەی خواروژووری گرنگیی شتان... بە ڕاستی ئەم قسەیەش هەتا بڵێی کورت دەهێنێ لە ئاست پلەی گرنگیی جیهان چونکە قیاسی لە هیچ شتێک ناکرێت.

2- لەم ئەرزەی تێیدا دەژین و پێی دەژیین و ئاو و هەوا و خاک کە ماددەی مردوون حیسابیان لەگەڵ گیانلەبەر ناکرێت، لەوە بگەڕێ کە بەبێ تیشکی ڕۆژ ژین مومکین نییە.

3- بوونەوەری گیانلەبەر لە نوختەی زیندووەتیەوە بەسەر جیهانی مردوودا ڕادەکشێت.

4- مرۆ گیانلەبەری هۆشلەبەرە کە تا ئێستا بە جۆرێکی متمانەبەخش بوونەوەرێک نەدیتراوە و نەبیستراوە و هەستی پێ نەکراوە هاوتای مرۆڤ

بێت. لە بلیمەتی خۆیەوە دەست لە بوونەوەری مردوو و زیندوو وەردەدات و شتی نوێیان لێ دەئافرێنێ پێشتر سروشت ڕێی پێ نەبردبوو.

گریمان ئەو بەشەی جیهان کە مرۆی تێدا پەیدا بووە بە ڕووداوێکی ئاسمانی یان خاکی «وەک بوومەلەرزە» تەفروتوون بوو، ئەمجا چی؟ تاقمەی ڕۆژ بە خۆی و پابەندەکانی بوون بە تۆز، هەڵم... ملی وە قوتەوە لە دوورایی یەک ساڵی تیشکی هەستی پێ ناکرێت. ئەی لە دوورایی 20 ملیار ساڵەوە؟

بەلای منەوە، کە فەلسەفەی سارد و گەرمی تیدا بەکارنەهێنم، لەوپەڕی ئارامییەوە جیهانم قبوڵە وەک هەیە هەرچەند حەزم دەکرد «ئازار»ی تێدا نەبایە، وەک ئەوەی کە حاڵەتی تێیدا دەژیم، لەگەڵ تەنگانەکەی، پێی ڕازیم – خۆزی گەشتر بوایە. تا ئێستا و بۆ ماوەیەکی داهاتووی دەیان، سەدان ساڵ «پتر، کەمتر» تێکهاویشتنی نەتەوەی ئینسان، کەوا بێگومان بەرهەمی پاشماوەی نەفسی حەزۆک و هۆشی کەمبڕشتە «وێڕای هۆی لاوەکی کە نایەتە حیسابەوە» ئا ئەو تێکهاویشتنە بە بەریەوە هەیە دەوام بکات و ڕووخێنەر و وەخرێنەر بێت. لە خانەی شیمانە «احتمال»ی ڕووداوان، هەڕەشەی ئاتۆم و کیمیایی بزەبزیەتی هەرچەند دڵەکەم ڕەمڵەکە بەلای نەقەوماندا لێک دەداتەوە... ژیان خۆی چڵەپۆپە نییە، هۆش چڵەپۆپەیە، بێ هۆش دەگەڕێینەوە پلەی گۆریللا و چیمپانزی، دەرفەتی شەکربێژی لە چڵەپۆپە کوێر دەبێتەوە.

ڕەشبینی کارێکی ئاسانە هەروەک پەندیاری پاڵەوانپفیەکی بێ مزەیە. دیتنی عەیب و عاری مرۆ و جیهان خۆی لە خۆیدا هەنگاوە. هەوڵدان بۆچارەسەرکردنی شەرەفە نەک تف کردن لە چارەی مامە مرۆ... بەر لە دە، دوازدە ڕۆژێک گوتارێکم خوێندەوە لە ئاهەنگی ڕێزنان لە د. کەمال مەزهەر، بە عەرەبی، شتێکم گوت لەبارەی مرۆوە کە مرۆ لە چاکە و مەردایەتی پلەی مەلائیکەت تێدەپەڕێنێ، لە بەدایەتیش دەچێتە ژێر تەبەقەی هەرەژێری جەهەندەم... بەم ڕستەیە ئەو وەسفەم کۆتا کرد، عوفی من مخلوق انتقعن

على نفسه وهو المثل الأعلى فيما خلق صانع المعجزات! پێم بکرێت نوسخەیەکت لەو گوتارە بۆ دەنێرم.

جارێ مرۆ بەرێوەیە، بەرێوەیە، بەرێوەیە بۆ ئەو رۆژگارەی هۆشی مووقڵاش و زانستی زەرڕە هەڵوەشێن و نیازی پاک و پیرۆز و ڕژدی لە خەفەکردنی حەزی رێزپەڕ و مەیلی بیژۆک لێخوڕی کەشتییەکەی نووحی دوارۆژ بێت و بەسەر «جوودی»ەکەی وڵاتی کورد بنیشێتەوە...

تێبینی، بە کەس ناکرێ دوارۆژی ملیۆن و دە ملیۆن ساڵی بە تەرازووی هۆش و مەنتیق و زانست هەڵکێشێ و لێکداتەوە چ گۆڕانکارییەک بەسەر گیانلەبەری وەک مەیموونەدا دێت بەرەو «هۆشداری». مرۆ خۆی تا چەند ملیۆن «زیاتر، کەمتر» ساڵ شکڵی ئێستاکەی پێوە دەمێنێت! زانست چ دەکات لەگەڵ غەریزە و بزوێنە نهێنییەکانی دەروون! تێپەڕین لە خێرایی تیشک چی بە دمەوەیە! ئەودیو بوونەوەری ماددی چ جۆرە جیهانێکە! ئیتر خەیاڵگێڕی بکە و پرسیار و وەڵامی لەسەر هەڵبستێنە.

ژیان چ پێناسەیەک وەردەگرێت؟ لە کاتێکدا وا ڕووداو و تاقیکردنەوەی سێ چارەکە چەرخی پڕ لە کارەسات و هەراو بەزمی جەنگی جیهانیی «1، 2» و ڕزگاریی نەتەوەکان و شەڕی سارد و شۆڕشی کۆمپیووتەر و تەکنەلۆژیا و ئینتەرنێت و هەرەسی سیستەمی بەناو سۆشیالیزمی مارکسیتان بە چاوی خۆتان دیوە و تیایدا ژیاون؟ لە بارێکدا بەلای زۆر کەسەوە هەبوونی تەندرووستی و ماڵی دنیا مانای ترۆپک و بەهەشتی ژیان بگەیەنێت؟

چ ژیانێکت مەبەستە؟ هی هەموو گیانلەبەر؟ هی تێکڕایی مرۆڤایەتی؟ هی نەتەوەیەک؟ هی خێزانێک؟ هی تاکەکەس؟ هەر کامێکت مەبەست بێت و هەموویانت مەبەست بێت دەتوانیت خۆت دڵنیاکەیت بە گرتنەبەری جۆرێک ژیان، لە سنووری تواناداا، لەگەڵ سوودی ڕەوای خۆت و خەڵک جووت بڕوات و پاک بێت لە ستەم. شەڕی یەکەم و دوەم و چی و چی تۆی تێدا بەرپرس نیت. حەز دەکەیت فەرامۆشیان بکەیت زەرەرت نەبەخشیوە...

بۆی دامێنیت مافی خۆته و مەرجیش نییە سوود بە دنیا بگەیەنیت بە داماویت! کەسانێکی بە تەنسازی و ماڵی دنیا دەگەشێنەوە نابنە تاوانبار بە مەرجێک خەڵکیان زەدە نەکردبێت، خۆ ئەوەی ڕاستی بێت ئەو جۆرە تاقمەی کەیفانی لەبەر زێدە حەز کردن بە شادی و خۆشگوزەرانی ناپەرژێنە سەر تەپکە دانانەوە بۆ خەڵک، ناشیانەوێ خەڵک لە خۆیان بەدەنگ بهێنن. ئەمانە جودان لە عاشقەدەسەڵات، خەفەتیان لێ مەخۆ مەشبە مامەخەمە... بە سادەیی و بێ نەفەسسواری و زۆر ئاسایی کوردێکی کورددۆست بە... ئەگەر پێت کرا دڵسۆز بە، ناشڵێم قۆنتەراتی دڵسۆزی بگریت و شینی حەسەن و حوسێنان بەرپاکەیت... کە گوڕی گەنجایەتی ڕێگەی سەختی لێت خۆش هێنا و دواتر پێوەی سەغڵەت بووی چەند پلەیەک دابەزە نەکا هەنگاوت بشێوێن بە ناجۆریی نێوان هەستی دەروون و حەزی قارەمانەتی... هەتا پێت دەکرێت لەگەڵ خۆتدا ڕاست بە!!! وا دەزانم لەو نووسینانەی من و غەیری من (کە وەک من بیر دەکەنەوە) هێما کراوە بۆ ئەو بابەتانەی پرسیاری هەرەدواییت...

بەغدا 1997\4\17

شەو سەعات 3:40 ی کاتی هاوینە

1. ڕاستییەکەی ئەوەیە کە مامۆستا مەسعوودیش و کاک هەڵۆش، لەبەر ئەوەی کە پێوەندییەکەیان بەهۆی نامەوە بووە و ئەویش لە هەلومەرجی عێراق و کوردستاندا دیارە چۆنە، تووشی لەیەکتر تێنەگەیشتنێکی سەیر بوونە، هۆیەکەشی، دیارە، دەگەڕێتەوە بۆ هەڵەی ڕێنووس. کاک هەڵۆ بەرانبەر وشەی «القابع» یا «الکامن»ی عەرەبی کە لە تێکستێکی مامۆستادا بەکار هاتووە، وشەی «خۆمتکردوو» واتە (ئەوەی کە خۆی مت کردوە)ی بەکار بردوە، بەڵام بە هەڵە بە شێوەی «خۆمت کردوو» نووسیویەتی، ئیدی هەموو تێگنەگەیشتنەکە لێرەوە دەستی پێ کردوە.
2. باشتر ئەوەیە بڵێین، تێکهەڵقژانی دوو لەشکرە وەک شەڕی هەرێمی کوردستان کە دەوڵەتی تێدا نەڕسکاوە.
3. لە سەرەتای ئیسلامدا، گۆیا، لە ترسی کافران کابرای بانگدەر دەمی خستۆتە ناو کدوولەی کۆڵراو نەکا دەنگەکە ببیسترێ...
4. گۆیا کابرایەکی شوانی شارەزوور جارێکیان گوێی لە بانگ بوو... پرسی ئایا ئەو هەرایە بۆ پەز خراو نییە، گوتیان ئەوە بانگی پێغەمبەرە بۆ نوێژکردن... زەرەری نییە. گوتی ملی وەقوتەوە با هەتا ئێوارە هەر بنەڕێ.
5. ڕێکار: مستوی، Level.
6. وشەی وەزگ لە «ڤەز»ی کۆنە زمانەکانی دەمی ئاڤێستا و دواتر ماوەتەوە بە واتای «فڕین». لە کوردیدا دوو وشەی «پەڕەواز» و «پەرتەوازە» ماونەتەوە بەو مەعنایە. وەزگ ئەو گافەی پاشگری پێوە نووساوە دەیکاتە «فڕگ» کە دەلالەتی گیانی تێدایە کە لە مردندا دەفڕێ. وشەکانی: بەر، ور، مەڕ... بوونەتە بەرگ، ورگ، مەرگ.
7. مەبەس شیوعی کوردە.

8. وابزانم لەبەری مەرگەش گوندنشین هەن هەمان شکڵ داخێون.
9. مەبەست لەسەرجەمی بزوێنەرانی ماددی و مەعنەوی کۆن و نوێی کوردە کە بە هۆکار دادەنرێن و لە وردبوونەوەدا شوێنپەنجەیان لە «ڕەفتار، نەریت، خولیا... هتد» بە دەر دەداتەوە.
10. ئەم نموونەیە بە نیازی مومکینبوونی کاری عەقڵانی لە لایەن تاکی ڕۆشنبیرەوە هاتووە نەک دژ بوەستێ لە ئاستیدا. بابەتەکەشی لە ڕووی سیاسەتەوە بێلایەنە، کەمتر هەستیاری پەیدا دەکات.

«...»